له ئەرشیفی شارەوە

# مەفرەزەی تۆڵە

بیرەوەرییەکانم لەڕێکخراوی سلێمانی و کارکردنم لەمەفرەزەی تۆڵەدا



ڕەئووف شێخ جەمیل

## له ئەرشیفی شارەوە

کتێبی سێیەم

# مەفرەزەی تۆڵە

بیرەوەرییەکانم لەڕێکخراوی سلێمانی و کارکردنم لەمەفرەزەی تۆڵەدا

ڕەئووف شێخ جەمیل

## ئەم کتێبە پێشکەش بێت

-بە شەهیدانی مەفرەزەی تۆلە.

-بە شەهیدانی کوردستانی گەورە.

-بە هەموو ئازادیخوازانی جیهان.

# پێشەکی

لە ڕۆژی ڕاپەڕینی گەلی کوردەوە لە باشووری کوردستان، هەتا ئێستا چەندەها کەسایەتی و پێشمەرگە و فەرماندەی پێش ڕاپەڕین بیرەوەری خۆیان دەنووسنەوەو بە چاپی دەگەیەنن و دەیخەنە بەردەستی خوێنەران. بەڵام زۆربەی ئەو بیرەوەرییانە یا هی شاخن یا هی زیندان.

تا ئێستا زۆر بە دەگمەن بیرەوەری ناوشار نوسرابێتەوە، بە پێچەوانەوە ئەم بیرەوەرییانەی من، بیرەوەری ١٠ ساڵ خەباتی خۆمە لەگەڵ هاوڕێیانی ناو شار چ لە ڕێکخراو، چ لە مەفرەزەی پێشمەرگەی ناو شار.ئەوەی نووسیومەتەوە لە سەدی حەفتای بیرەوەرییەکانمە، واتە زۆر بە نیوە ناچڵی، خستوومەتە بەر دەستی خوێنەران. دوای شەنو کەو و پاککردن و بێژانەوەی، لە چەند چالاکی ناوشار ئنجا توانیومە ئەم چەند لاپەڕەیەی لێبنووسم، چونکە هەندێ چالاکی هەیە بە هیچ شێوەیەک نە زمان ڕێگا دەدا بیڵێت وە نە قەڵەم دەتوانێت بینووسێت، ئەوەشی کە نووسیومە لەبەر ئەم هۆیانە بوون:

١- خەباتی خوێندکارانی ئەو سەردەمە بخەمەڕوو، هەروەها دەوری ڕێکخستن لەکاتی خۆپیشاندانەکانی ناوشاردا.

٢ – دەمەوێت خەباتی ئەو چەند ساڵەمان نەچێتە ژێر گڵ وەکو خۆی ڕاستییەکان بنووسمەوە. تاکو کۆمەڵانی خەڵک یاخود گەنجان و لاوانی ئەمڕۆ کە دوای ڕاپەڕین هاتوونەتە ژیانەوە، بزانن گەنجانی پێش خۆیان چۆن خەباتیان

کردووه دژی ڕژێمی بەعس، وە ئەوەش بزانن کە دەستکەوتو ئازادی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان لەسایەی خەباتی کورد بە خوێنی شەهیدان بووەو بە خۆڕایی نەهاتووەتە بەرهەم.

٣ – ئەوەی نووسیومە مەبەستم تەنها خەباتی هاوڕێیانی ناو شارە، کە چەند بە دڵێکی فراوانەوە شەونخوونییان کێشاوەو ڕەنجیان داوە، وە چەند بە بیرو باوەڕەوە ڕۆیشتوونەتە پای سێدارەو هوتافیان دژی ڕژێمی بەعس وتووە، تەنها بۆ سەربەخۆیی گەلی کوردو چۆک دانەدانیان بەرانبەر بە ڕژێمی بەعس.

٤ – من تەنها مەبەستم خەباتی هاوڕێیانە بیخەمە ڕوو، نەک خەباتی خۆم! بەڵێ باسی زۆر شتی خۆمم تیادا کردووە. ئەگەر ئەوانەشم نەنوسیایە، بیرەوەرییەکان کاڵ و کرچ دەبوون.

٥ – ئەوانەشی کە خەباتی ناو شاریان کردووە، بیرخستنەوەی بیرەوەرییەکانیانە، کە چەندەها شەو خەویان نەبووەو نیوەی شەو هەستاون و ڕۆیشتوونەتە دەرەوە بۆ نووسینی دیوار و بڵاو کردنەوەی بەیانو چەندەها کاری تر. یاخود هاوڕێیان لە مەفرەزەی تۆڵە کە چەندەها ئیشی قارەمانانەیان کردووە لەو سەردەمەدا، کە چەند چاو نەترس و بە جەرگ بوون بەرانبەر ئەو ڕژێمە ڕەفتار فاشییە. دەتوانم بڵێم کون لە جەرگیاندا نەبووە کە لەو سەردەمەدا خەڵک خۆی بەتەنها نەیدەتوانی بڕوات بەڕێگادا، جا وەرە بە دەمانچەو ڕومانەوە بڕۆ بۆ ناو بازاڕ و شوێنەگشتییەکان بۆ چالاکیو لەناوبردنی پیاوانی ڕژێمی بەعس.

٦- یاخود خۆڕاگری ئەو هاوڕێیانە کە دەستگیردەکران و دەکەوتنە ژێر ئازارو ئەشکەنجەی ئەو فاشییانەوە، ئەوەندە خۆڕاگر بوون گیانی خۆیان لا مەبەست نەبووە گاڵتەیان بە چۆکدادان کردووە.

ئەم چەند هۆیەی کە نووسیومن مشتێکە لە خەرمانی قسەکانم، با ئەوەش بڵێم لە دامەزراندنی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانەوە، کە چەند تێکۆشەرێک پەرەیان پێدا بۆ گەشەکردن لە کوردستانی باشووردا، تەنها بە مەبەستی خەباتی ڕۆشنبیریی لەناو گەلەکەماندا، بەڵام خەباتی ڕۆشنبیریی بەرامبەر بەکێ

؟ بەرانبەر ڕژێمێکی خوێناوی بە ئاگر و ئاسن وەڵامی دەدانەوە.

لەباتی حەقپێدانو گوێ گرتن لە داواکارییەکان بەکوشتن و سووتاندن و ماڵوێران کردن دەکەوتە گیانی ئەم گەلە هەژارە.

ناچار خەباتکەرانیش خەباتیان گۆڕی بە خەباتی چەکداریی و ڕۆشنبیریی بەرانبەر دوژمنی سەرسەختی کورد، کە حیزبی بەعسی فاشست بوو، بۆیە ناچار بوون شەرعی مار بە دار بکەنو لە باتی دەستەوسان دانیشتن زەبری باشیان دەدا لە دوژمن و یەک بەسێ تۆڵەیان دەکردەوە.

بۆیە بە هەزاران گەنجی گەلەکەمان لەژێر ئازارو ئەشکەنجەدا شەهید دەکران و هەزاران لە زیندانەکانی ڕژێمدا ژیانیان دەبردە سەرو، هەزارانیش بە چیاکانی کوردستانەوە چەک بە شان بوون لە خەباتی بێپسانەوەدا، هەتا ڕۆژی ئازادی لە گەلی کورد هەڵهاتو بەجارێ دام و دەزگاکانی دوژمن لە کوردستان تەفرو توونا بوون. گەلی کوردیش نیمچە ئازادییەکی وەرگرت، بۆیە منیش پێمخۆشبوو کە خەباتی ناو شارو گەنجان و لاوانی شارە ستەمدیدەکەم بنووسمەوە، کە خەباتیان کردووە شان بە شانی خەباتی چەکداری شاخ، هەمیشە ئەڵێم ئەگەر خەباتی ناو شارەکان نەبوایە خەباتکەرانی ناو چیاکانیش نەیاندەتوانی بە ئاسانی خەبات بکەن، خەباتی نهێنی ناوشار زۆر گرنگتر بووە لە خەباتی چەکداریی شاخ. هەمیشە خەباتی نهێنی لەپێشتر بووە، چونکە زۆربەی شۆڕشگێڕان لەپێشدا لەناو شارا کاریان کردووە، ئنجا ڕوویان کردۆتە شاخ، ئەویش بەهۆی دەرکەوتنیان بووەو هەڵاتوون لە دەست ڕژێم، بۆیە ئەڵێم خەباتی ناوشار زۆر گرنگتر بوو نەخوازا خەباتی چەکداریش، بەڕاستی دڵێکی ئاسنین و خۆڕاگری دەویست.

ئەم کتێبە ڕەنجی ٣ ساڵ شەونخوونیەو ٢ جار نووسینەوە و پاککردن و پیشاندانی کەسانی ڕۆشنبیرو هەڵسەنگاندنیان، ئنجا توانیومە بیخەمە بەردەستی خوێنەران.

هەتا توانیومە خۆم لە ئیشی لابەلا پاراستووەو ڕاستییەکانم خستۆتە ڕوو،

ئامادەشم هەرکەسێک ڕەخنەیەک شتێکی هەبێت پێم بڵێت هەر لە خێزانی شەهیدەکانەوە تا خەباتکەرانو خەڵکی سڤیل، نەشمتوانیوە ڕوونکردنەوەی تەواو لەسەر چەند چالاکییەک بدەم، ئەویش لەبەرچەند هۆیەک کە ڕوونکردنەوەی تەواوم لەسەر خۆفرۆشان و جاسوسان نەداوە، تەنها لەبەر ڕێزی خانەوادەو نەوەکانیانە، چونکە ئەوان هیچ تاوانێکیان نیە بگرە زۆربەشیان زۆریان پێناخۆش بووە کە کاری ئاوا نابەجێیان کردووە لەناو کۆمەڵدا.

داوای لێبووردن دەکەم لە هەموو خوێندکاران و مامۆستایان و ئەوانەی ناویان نەهاتووە و هاوڕێم بوون یان لە بیرم چوون یان مەبەستم نەبووەو بۆ قەرەباڵغی نوسینەکە نەمتوانیوە، وە چەندەها کەسی تر کە پەیوەندییان هەبووە لای خۆم ناویانم نەهێناون، چونکە یان ماوەیەکی کەم لامبوون یان دەورێکی ئەوتۆیان نەبووە.

دەبێت ئەو تێبینیەش بڵێم کە لە زۆربەی شوێنەکان هاتووە ئەڵێم (بوو بە پێکەنین) چونکە ئێمە زۆر بە دڵێکی سافەوەو خۆشحاڵییەوەو بە خۆشەویستی و بیروڕاوە خەباتمان کردووە، زۆربەی ئیشەکانمان بە پێکەنینەوە دەکرد نەک بە ترسو لەرز ئەو کەسانەی ناویان هاتووە هەر کەسە بە زمانی خۆی قسەکانیم گێڕاوەتەوە بۆ نموونە، دکتۆر عادل تۆفیق تورکمان بوو زمانی کوردی باش نەدەزانی، من وەکو خۆی قسەکانیم نووسیوە، یان دایک و باوکم یان خەڵکانی گوندنشینەکان یاخود ئافرەتەکان بە زمانی خۆیان قسەکانیانم نووسیوەتەوە.

پێویستە ئەوەش بڵێم زۆربەی هاوڕێیان کە ناویان هاتووە، تەنها منو جەزا و عەلی حەمە ڕەحیم ئیلتیزامی ڕێکخراو و پێشمەرگەی ناوشارمان بووە.

باقی هاوڕێیان تەنها هاوڕێمان بوون، دەبێت ئەوەش بڵێم کە خوێندکاری خوالێخۆشبوو حەمید ئیسماعیل کە زۆر دڵسۆزمان بووەو هاوکاری کردووین، من ناڵێم باقی هاوڕێیان باش نەبوون بەڵکو ئەڵێم پەیوەندییان نەبووە، ئەوەش ئەڵێم زۆر دڵسۆز بوون لەگەڵمان.

لە کۆتاییدا سوپاسی کەسوکاری شەهیدان دەکەم کە هاوکارم بوون لەبیرخستنەوەی مێژووی ڕووداوەکان.

سوپاسی کاک کەریم شەفیق دەکەم کە کۆمەڵێک وێنەی ئامادەیی کشتوکاڵی بەکرەجۆی بۆ هێنام، لەگەڵ هاوڕێم خاتوو جەمیلە شێخ مەحمود کە ئەویش کۆمەڵێک وێنەی بۆ هێنام و سوودی باشم لێوەرگرتن، سوپاسی تەواوی هاوڕێیان و خزم و کەس و بەشدار بووانی ئەم نووسینە دەکەم کە هاوکارییان کردوم.

سوپاسی ئەو هاوڕێیانە دەکەم کە کاتی خۆی بەشداربوون لە کاری ڕێکخستنەکانی ناوشاردا، هاوکارییان کردم و وێنەی خۆیان بۆ ناردم، زۆربەشیان وێنەیان لەگەڵ گرتم بۆ بەپێزکردنی بیرەوەرییەکانم.

ئەبێ ئەوەش بڵێم ئێمە چەندەها هاوڕێمان لێدەستگیرکراون، هەموویان لەلایەن هاوڕێیانی خۆمانەوە خیانەتیان لێکراوە.

لە کۆتاییدا هیوام وایە بە دڵی خوێنەران بێت و ڕەنجی منیش بە هەدەر نەڕوات.

**ڕەئووف شێخ جەمیل**

٢١ / ١ / ٢٠١٧

## پاییزی ۱۹۸۰

- ۱ -

له پۆلی سێیەمی ناوەندی بووم، خولیای ئەدەبو شیعر خوێندنەوە و چیرۆکو کتێبی مێژوویی کەوتبووە سەرم ، زیاتر پەیوەندیم لەگەڵ کتێب ئاشنا تر دەبوو، چ پارەیەکم لە دەستدا بوایە دەمدا بە کتێب.

زیاتر لەگەڵ پوورزاو خاڵۆزاکانمدا، هاتووچۆم هەبوو سەیرم دەکرد ئەوان کتێبی باشیان لایەو زیاتر لەمن هەوڵدەدەن بۆ کڕینو پەیدا کردنی کتێب، ئەو کاتە زۆربەی چاپی ئێران بوون، بە قاچاغی دەهاتنە باشووری کوردستانەوە، ئەم کتێبانە بەلای ڕژێمی بەعسەوە زۆر گرنگ بوون، بۆیە بە هەر کەسێک و لە هەر ماڵێکدا دەستگیر بکرانایە ناوی قەدەغەیان لێدەناو ئەو کەسە سزای خۆی وەردەگرت، چونکە چاپو مۆری ئێرانی لەسەر بوو، (مەبەستم چاپخانەی سەییدیانە).

ڕۆژێکیان ڕۆیشتم بۆ لای عوسمانی خاڵۆزام، چەندەها کتێبی باشی پیشاندام، منیش دیوانی هەژار موکریانیم تیادا هەڵبژارد، بەزۆر لێمسەندو لێمکڕی بە ۳ دینار بۆ ئەو کاتە ئەو پارەیە زۆر بوو، بەتایبەت بۆ ئێمەی خوێندکار، ئەو کتێبە قاچاغ بوو لەبەر ئەوەی لێی نوسرابوو (بۆ کوردستان) وە چاپی ئێران و هی هەژاریش بوو.

دوایی ئەوان هەموویان کۆڵیان دا، دەتوانم بڵێم کتێبشیان نەماو خوێندنەوەشیان واز لێهێنا ئێستا هەموویان لە ژیاندان، جگە لە عوسمانی خاڵۆزام لە ڕاپەڕینا بەرەو ڕزگار کردنی کەرکوک ڕۆیشتن، لە ۱۹۹۱/٤/۲ لە چیمەن شەهید کرا.

ڕۆژێکیان شوانەی پوورزام وتی:

وا دیارە زۆر حەزت لە کتێبە، بەیەکەوە ئەڕۆین بۆ لای کەسێک کە کتێبخانەی هەیە پێت دەناسێنم، بەڵام نابێت لای کەس ناوی بهێنی، بەیەکەوە ڕۆیشتین بە شەقامی مەولەویدا تا کۆتایی شەقامەکە نزیکی سلێمانی پالاس، خۆمان

کرد بە کتێبخانەیەکدا پیاوێکی لاوازی سوورکاری لێبوو، سڵاومان لێکرد، شوانە پێی ناساندم، مامۆستا ئەنوەر برزوو، بە مامۆستاشی ووت: ئەمە پورزامە، هیچ ترست لێی نەبێت بە ئارەزووی خۆت کتێبی بدەرێ ئەویش ڕازی بوو، بەمەرجێ لای کەس قسە نەکەم، منیش سوپاسم کردو چەند کتێبێکم لێوەرگرت، بیرم دێ کتێبی دایکو دیوانی پیرەمێرد بە ٤ دینار، پاشان ڕۆژانە خۆم دەڕۆیشتم بۆ لای بۆ کڕینی کتێب.

لەگەڵ مامۆستا ئەنوەر برزوو وەکو وەستاو شاگردمان لێهاتبوو، دەبوایە لە کاتی قەرەباڵغیدا من لەدەرەوە چاوم لە کتێبەکان بوایەو، ئەویش لە ژورەوە سەواو مامەڵەی بکردایە، پاشان چەند کتێبێکی دەدامێو دەیوت لەبەر خاتری ئەوەی یارمەتیم دەدەیت منیش خاتری تۆ دەگرم.

هەتا ڕۆژێک مامۆستا ئەنوەر گیراو چەند ساڵێک حوکم درا.

پاشان منیش ڕوومکردە بەر سەرا، ئەوکاتە کتێبفرۆشەکان لای دیواری دائیرەی بەریدەکە کتێبەکانیان ڕیز دەکردو نرخەکانیان دەکوژاندەوەو نرخی زیادیان لەسەر دادەنا، خۆشترین ڕۆژم ئەو ڕۆژە بوو کە کتێبێکی باشم پەیدا دەکرد، ئەوکاتە کتێبەکانی شەرەفنامەو کوردو کوردستانو کوردستانو کوردی قاسملۆ و کۆماری مەهابادو چەندەها کتێبی بەنرخم پەیدا کردبوو.

* * *

ماڵمان لە گەڕەکی مەڵکەندی پشتی مزگەوتی حاجی مەلا شەریف، هەر لەو ماڵەشدا لە دایک بووم و لەو گەڕەکەشدا گەورەبووم، لەبەرئەوە زۆربەی بیرەوەرییەکانی ژیانم زیاتر هەر لەو گەڕەکەدایە.

ئەوکاتە تێکەڵیم لەگەڵ کوڕانی گەڕەکدا زۆر خۆشبوو، چونکە هەمومان لە منداڵییەوە بەیەکەوە گەورە ببووین، خۆشەویستیو باوەڕێکی تەواو لە نێوانماندا هەبوو، هەموو وەکو خێزانی ماڵێک وابووین، تەنانەت زۆربەی ژیانو نهێنی یەکتری شارەزا بووین، هیچمان لە یەکتری نەدەشاردەوە.

ئەوەی کە زۆر هاوڕێی خۆشەویستم بووبێت کەریمی حاجی جەلال کە بەبێ یەکتر نەماندەتوانی بژین، زۆربەی شەوانیش لە ماڵی ئەوان بەیەکەوە دەخەوتین،

من وەکو ئەندامی ئەو خێزانە وابووم.
تەنانەت لەگەڵ کاک ئەحمەدی کوڕە گەورەی حاجی جەلال، کە لە من و کەریم گەورە تر بوو، هاوڕێیەتیمان زۆر خۆشبوو، کاک ئەحمەد زۆر زیرەک بوو، دەستی وێنەکێشانو خەت خۆشی هەبوو، دەرچوی زانکۆ بەشی کارگێڕی بوو، (ئێستا لە لەندەن دەژی).
ئێستاش من لەگەڵ ئەو خێزانەدا هەر تێکەڵم، بەتایبەت منو مامۆستا کەریم، کە تا ئێستا برایەتی و هاوڕێیەتیمان بۆ ماوەی ٤٢ساڵ زیاترە.
بۆیە ئەڵێم مامۆستا کەریم چونکە دوایی بڕوانامەی زانکۆی وەرگرت و بوو بە مامۆستای بیرکاری لەقوتابخانە ناوەندییەکان.
لەگەڵ مامۆستا کەریم سوودی باشمان لەیەکتر وەرگرت، چونکە بەیەکەوە بڕیارماندا تەنها کتێب بکەین بەهاوڕێی خۆمان، لەگەڵ وێنەگرتن، کە تاکو ئێستاش بەردەوامین، بڕیاریشمان دا کە خوێندن تەواو بکەین، بەڵام ئەو لە من زیرەک تر بوو، بۆیە ئەو زانکۆی تەواوکرد.
لەگەڵ وەهاب عوسمانو حەمەعەلی شەریف و تەها سیتەکی هاوڕێیەتیمان خۆشبوو، حەمەعەلیو مامۆستا کەریم خاڵۆزاو پورزا بوون، وەهابو تەهاش خاڵۆزاو پورزا بوون، لەڕێگەی ژنو ژن خوازییەوە لەگەڵ ماڵی مامۆستا کەریم ببوونە خزم، بەڵام ئێمە زیاتر هاوڕێیەتییەکەمان لا گرنگتر بوو، بۆیە هەمیشە بەیەکەوە بووین.
کۆمەڵێک هاوڕێی ترم هەبوون لەوانە عەلی عومەر، زاهیرو تایەرو عەبدوڵای حاجی مەجید، کە هەرسێکیان برا بوون. حەمە سوورو جەلیلی شێخ مەحموود، ئەوانیش برا بوون، عەلیو جەباری مام قادر، ئەوانیش هەر برا بوون، بەکری شێخ مەحمودو ڕەئووفی شێخ سەعیدو فەرهادی سەبیحو برایمی حەپسە، ئەمانە هەمویان کوڕانی گەڕەک بوون.
چەند ساڵ لەوەوپێش کەسێکم ناسی بەناوی مامۆستا ئیبراهیمەوە، ئەویش بەهۆی ماڵی مامۆستا کەریمەوە، ئەوانیش بەهۆی گوندەکەیانەوە (وێڵەدەر)، ناوبراو وەختی خۆی فەقێ بووە لەوێ، ئیتر ئەو ناسیاوییەیان هەر مابووەوە،

بەڵام دوایی ڕوو لە پێنجوێن دەکاتو بە فەرمانبەر دادەمەزرێت، هەر لەوێ پەیوەندی دەکات بە ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەوە وەک کادر کاردەکات، ئەگەر بهاتایە بۆ شار وەکو وەفایەک سەردانی ماڵی کاک حاجی دەکرد، منیش دەڕۆیشتم بۆ لای.

هاوڕێیەتیو دۆستایەتی مامۆستا ئیبراهیم ئەوەندە خۆش بوو تێر نەدەبووین لە قسەکانی، مامۆستا کەریمیش هەر لەوەوە فێری کتێب خوێندنەوە ببوو، قسەکانی مامۆستا هەمیشە بۆنی کوردایەتیو خزمەتکردن بە نیشتمان بوو، پاشان مامۆستا کەوتە ژیانی فیرارییەوەو ڕووی کردە گوندی قڕگە، تا ماوەیەک لە ماڵی مەلای گوندەکە مەلا مەحمودی ئازادی دەژیا چونکە وەختی خۆی مامۆستا ئیبراهیم فەقێ بووە لای مەلا مەحمود، منو مامۆستا کەریمیش بەتایبەت دەڕۆیشتین سەردانیمان دەکرد، هەموو جارێک دەیوت: خێزانەکەم سکی هەیە ئەگەر منداڵەکەمان کوڕ بوو ناوی دەنێم بینایی، بەناوی نهێنی قازی محەمەدەوە، وە ئەگەر کچیش بوو ناوی دەنێم گەلاوێژ، ئنجا دەیانهێنم بۆ شاخ و دەبم بە پێشمەرگەو خزمەتی شۆڕش دەکەم.

بەداخەوە مامۆستا ئیبراهیم بەو ئاواتانە نەگەیشت، لەڕۆژی ١٩٨١/١١/١٧ بەفیراری دەیەوێت سەردانی سلێمانی بکات لەسەر ڕێگای قڕگە بۆ سلێمانی لای شەقامی شەستی چاوی بە سەیارەی قوات خاسەکان دەکەوێ و دەگەڕێتەوە، ئەوانیش نامەردانە تەقەی لێدەکەن و شەهیدی دەکەن.

چەند ڕۆژێ دوای شەهیدکردنی مامۆستا ئیبراهیم، خێزانەکەی منداڵی دەبێت و منداڵەکەشی کوڕ دەبێ، هەرچەندە من و مامۆستا کەریم نەمانبینی، بەڵام بەکەس و کاریا جوابمان بۆ نارد، لەسەر وەسیەتی خۆی ناوی بنێن بینایی.

مانگی ٩ی ١٩٨٠، عەلی عومەر هاوڕێی گەڕەک، زۆر باوەڕ پێکراوی یەکتر بووین هات بۆ لام و کەوتە وتوێژ لەگەڵما، تێبینی ئەوەم کرد قسەکانی جۆرێکەو سەردەمی گەنجایەتی خستۆتەلاوەو شێوازی قسەکردنی گۆڕاوە، ئێ چی دەکەی؟ چی ناکەی؟ ئاگام لێتە خەریکی کتێب خوێندنەوەی! حەزدەکەم لەسەر خوێندنەکەت بەردەوام بیت، چونکە بۆ پاشەڕۆژی خۆت و ئەم میللەتە زوڵملێکراوە بەکەڵک دێیت.

چەند ڕۆژێک هەر هات و چوو، باسمان هەر باسی کتێب خوێندنەوەو تێکۆشان بوو، ڕۆژێک وتی:

-تۆ کتێبی گیڤارات خوێندۆتەوە؟ وتم: ئەزانم کێیە!؟ بەڵام نەمخوێندۆتەوە، وتی: وا باشە لەو جۆرە کتێبانە بخوێنیتەوە، ئەمڕۆ پێویستت بەکتێبی شۆڕشگێڕی هەیە، بەتایبەتی گەنجانی وەکو ئێمە کە نەوەی دوا ڕۆژین.

پاشماوەیەک ٢ کتێبی بۆ هێنام، وتی نابێ لای کەس باسی بکەیت، با هەر لە نێوان خۆم و خۆتا بێت.

منیش بە خۆشحاڵیەوە لێموەرگرت و لەماڵەوە دەستمکرد بە خوێندنەوەیان، ئەویش ژمارە ٩ ی کۆمەڵە (کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان) لەگەڵ کتێبی جۆشدانی خەباتی مام جەلال، پاش چەند ڕۆژێ عەلی هاتەوە بۆلام پرسیاری لێکردم بۆ خوێندنەوەیان، منیش دەستخۆشیم لێکردو پێم ووت: کەسودی باشیان هەبوو، داوای کتێبی ترم لێکرد.

دوای ماوەیەک قسەمانکرد دەربارەی ڕێکخستن و بەیان بڵاوکردنەوەو ئیشوکاری ناوشار هەرچەندە من زانیاریەکی ئەوتۆم نەبوو، سەرنجی ئەویشم دەدا، ئەوەندە سەرقاڵ نەبوو لە مەسەلەی ڕێکخستندا.

ڕۆژێک هاتە ناو باسەکەوەو هەموو شتێکی درکاندو منی تێگەیان بۆ کاری ڕێکخستن، کە گوایە هەر من و ئەوین بەیەکەوە، نابێ لای کەس قسەبکەم، وتیشی: لەم ڕۆژانەدا ئەڕۆم بۆ سەرکردایەتی بۆ کاری تایبەت بەڕێکخستن، چیش بڵاوکراوەو کتێبی شۆڕش هەبێت دەیهێنمو دەستدەکەین بەئیشکردن.

بەڵام تێبینی ئەوەم هەبوو لەناو کوڕانی گەڕەکدا پەیوەندی تری هەبێ،

چونکە هەمیشە چپەی بوو لەگەڵیاندا.

عەلی عومەر نیشتیمان پەروەر و دڵسۆز و ڕۆح سووک بوو، حەزی دەکرد گیانی خۆی بەخت بکا، یاخود کارێکی وابکات کە جێگای شانازی بێت بۆ خۆی و گەلە ستەمدیدەکەمان.

عەلی دوای ٣ - ٤ ڕۆژ سەری هەڵدایەوە، سەیرمکرد دەمانچەیەک لەبەر پشتێنەکەیدایە، منیش تێگەیشتم مەبەستی چییەو دەنگم نەکرد، پاشان کەوتە باس و خواسی ئەوە چۆن ڕۆیشتووە بۆ سەرکردایەتیو لەوێ چۆن کۆبونەوەی کردووە بۆ چۆنیەتی ئیشکردن لەناوشار، چۆن بڕۆینە ناو جەماوەرەوەو خەڵک تێبگەیەنین لە ڕێبازی شۆڕشی نوێ، بۆ گەنجانی ڕوون بکەینەوە هەتا بتوانین ببینە مرۆڤێکی بەکەڵک بۆ گەل و نیشتیمانەکەمان.

سەرەتای وەرزی بەهار بوو، کەش و هەوا خۆشی کردبوو، منیش سەرگەرمی کۆشش و خوێندن بووم، زیاتر دەهاتینە دەرەوەو هاوڕێیان یەکترمان دەبینی، کوڕانی گەڕەک ئەوکاتە مێزێکی یاری تێنسیان لە پشتی دیواری مزگەوتی حاجی مەلا شەریف دانابوو، ئەو ناوەش دەشت بوو هەموو بۆ یاری کردن دەوری مێزەکەیان دەدا، بەتایبەت لای دوانیوەڕوان چونکە سێبەرەکەی خۆش دەبوو مێزەکەش هی عەلی مام قادر بوو.

ئەوکاتە کەسێک لەناوماندا پەیدا ببوو، بەناوی قالەی حەمەی مەلا نایەر ببوو بە دەم ڕاستو قسەزانو باوەڕپێکراوی ناو برادەرانی گەڕەک، منیش لە عەلی عومەرم پرسی: ئەمە چۆن دەناسی؟ وتی: ئەمە کوڕێکی باشەو ماوەیەک لە زیندانی فاشییەکان لە هەیئەی کەرکوک لە ژێر ئازارو ئەشکەنجەدا بووە، ئیعترافی نەکردووەو ئازاد کراوە، کەسێکی ئازاو باوەڕپێکراوە، هیچ ترست لێی نەبێت، سەیارەشی پێیە، بۆ هەر شوێنێک بمەوێ برۆم هاوکاریم دەکات.

ناوەندیی گۆیژەی کوڕان ئەو کاتە لە هەوارە بەرزە بوو لە سەرو مزگەوتی عەلی کەمال. منیش لەوێ خوێندکار بووم. مامۆستا سمکۆ شەوقی بەڕێوەبەر بوو، مامۆستا مستەفا چاو جوان یاریدەدەر بوو، مامۆستاکانیش ئەوەی لەبیرم بێ، مامۆستا ئەحمەد صالح وانەی مێژوو جوگرافیاو پەروەردەی پێ دەوتین، مامۆستا محەمەد عەبدە وانەی کوردی، مامۆستا عەبدوڵلا وانەی ئینگلیزی، مامۆستا عەلی مەلا محەمەد وانەی عەرەبی، من لەگەڵ ئەو مامۆستایانە بەینم زۆر خۆشبوو، بەتایبەت مامۆستا ئەحمەد سالح، کە مامۆستایەکی زۆر دڵسۆزو نیشتمانپەروەر بوو، مامۆستا محەمەد عەبدە ئەویش لە ئەدەبیاتدا زۆر زیرەک بوو، وەکو خۆم سودی زۆرم لێوەرگرت، مامۆستا عەلی وانەی عەرەبی دەووتەوە، ئەویش زۆر زیرەک بوو، مامۆستا عەبدوڵلای ئینگلیزی مامۆستایەکی زۆر بەڕێز بوو لەناو خوێندکاراندا هەڵسو کەوتی وەکو خوێندکار وابوو لەگەڵمان.

ناوەڕاستی مانگی ٤ ی ١٩٨١ هێشتا مۆڵەت نەدرابووین بۆ تاقیکردنەوەی بەکالۆری پۆلی سێ، لەگەڵ کۆمەڵێک خوێندکاری پۆلەکەمان بەرزان عەبدوڵلا -ئێستا ئەفسەری ئاسایشە، عەبدوڵلا رەشید-ئێستا خەیاتە، سیروان سلێمان، عەتا شێخ سالح- لەسویسرا دەژی، سەلاح فەتاح، فەرەیدون. کامەران بڕیارماندا بڕۆین بۆ شاخی گۆیژە بۆ وێنەگرتنو پیاسەو خۆشی خۆمان، چونکە ماوەیەکی تر دەست لێکبەردان بوو بۆ کۆششی بەکالۆری، بۆیە رۆژی هەینیمان دانا.

بۆ بەیانیەکەی هەمومان لەبەردەم خوێندنگە یەکمانگرتو بەرەو شاخی گۆیژە ڕۆیشتین ئەوکاتە من کامێرام هەبوو، بۆ یەکەمجار فیلمی ڕەنگاوڕەنگم تێکرد بەخۆشی هاوڕێیان کۆمەڵێک وێنەی ڕەنگاوڕەنگمان گرت، بەڕاستی شاخی گۆیژە ئەوەندە سروشتێکی جوانی هەبوو لەباسکردن نایەت، منیش هەر سەیری گوڵو گوڵزارم دەکرد کاغەزو قەڵەمم گرت بەدەستمەوەو ئەم شیعرەم نووسی:

**ئەمزانی**

**گوڵاڵە سوورەیە**

**لەناو نێرگسە زەردە**

**ئەمزانی**

**خوێنی پێشمەرگەی شەهیدە**

**لەو کێوو هەردە . . .**

**دەستمدایە لێی بکەمەوە**

**گوڵاڵە هاتە زمان . . .**

**وتی: دەستم لێمەدە**

**ئەبم بە سنوور بۆ کوردستان.**

وتم هاوڕێیان گوێبگرن بە دەنگی بەرز خوێندمەوە بوو بە چەپڵە، وتم: ئەم شیعرە ئێستا نوسیم، هەموو وتیان: دەستخۆش.

پاشان ئەو شیعرە بووە هەوێنی شیعر نووسینم، هەتا ئێستاش چەند پارچە شیعرێکم نوسیوە، زیاتر لە بۆنەو مەسەلە دڵتەزێنەکاندا شیعرم بۆ هاتووەو دیوانێکی شیعریشم چاپکردووە بە ناوی گوڵاڵە.

مانگی ٥ دنیا بەرەو گەرمی دەڕۆیشت خوێندکاران خۆیان ئامادەکردبوو بۆ تاقیکردنەوەی کۆتایی ساڵ، بەڵام عەلی عومەری هاوڕێم نەیدەخوێند، ڕۆژێک لای ئێوارە بوو هات بۆ لام زۆر ماتو بێزار بوو، وتم: عەلی چییە بۆ وا بێزاری، وتی: هیچ نیە! ئەمەوێ کاتێک دابنێینو قسەت لەگەڵ بکەم، وتم: ئێستا کاتم هەیە، وتی: بیخەینە شەو.

هەر ئەو شەوە چاومان بەیەکتر کەوت، زۆری قسە بۆ کردم، لە کۆتایی قسەکانیدا وتی: من کەشف بووم، دەبێت بڕۆم بۆ شاخ، بە هەموو برادەرانم وتووە، ئێستا بەتۆش ئەڵێم، چونکە من خیانەت لە کەس ناکەم، ئەگەر دەست ڕژێمی بەعسیش بکەوم بەنیاز نیم ئیعتراف لەسەر کەس بکەم، بەڵام من

خیانەتیان لێکردم، وتم: کێ خیانەتی لێکردی؟ وتی: برادەرێک پێویست ناکا ناوی بهێنم، وتم: ئایا من دیارم لەو مەسەلەیەدا، وتی: باوەڕ ناکەم، مەگەر بە گومان یان برادەر قسەت لەسەر بکات، یان ئەو کەسەی وای لە من کردووە دەستنیشانت بکات، پاشان هەموو کتێبو بەیاناتو نووسراوەکانی هێنایە لای من، وتی: با لای تۆ بن بیانپارێزە، حەز ناکەم تۆ خوێندنت بفەوتێت لەبەرئەوە ئاگات لەخۆت بێت.

ئەو شەوە لە یەکتر جیابووینەوە، عەلی بە نیازی ڕۆیشتن بوو، خۆی دەرنەدەخست، هاوڕێیانی گەڕەک بەکری شێخ مەحمودو زاهیرو چەند کەسێکی تر ئەوانیش دیار نەمان، ٣ ڕۆژ ڕۆیشت بەسەر مەسەلەکەدا، هاوڕێیەکی گەڕەک هات وتی: قالەی حەمەی مەلا نایەر کوژراوە!! وتم: بۆچی کوژراوە؟ وتی: نازانم، ئیتر دوای ئەو مەسەلەیە عەلیو بەکری شێخ مەحمود ڕۆیشتن بۆ شاخ، زاهیریش لە بەغدا دەیخوێند خۆی ونکرد، گەڕەک کەمێک چۆڵ بوو، منیش لە ماڵەوە نەدەنوستم، دەڕۆیشتم بۆ ماڵی خوشکو براکانم، تا وردە، وردە، وەزعەکە ئاسایی بووەوە.

*

تاقیکردنەوەی بەکالۆری پۆلی سێی ناوەندیم تەواو کرد، دەرچووم بۆ پۆلی چواری ئامادەیی.



کوڕانی گەڕەک لەڕاستەوە: ڕەئووف شێخ جەمیل، بەکر شێخ مەحمود باراوی ، جەلیل شێخ مەحمود حاجی مامەندی ، عەلی مام قادر، برایمی حەپسە (کۆچی دوایی کردووە)، ئەنوەر عومەر، زاهیر مەجید (کۆچی دوایی کردووە)، فەرهادی سەبیح.
یەکەم ڕۆژی جەژنی قوربان ١٩٧٦/١٠/١



لەڕاستەوە: بەرزان عەبدوڵڵا، عەتا شێخ ساڵح، ڕەئووف شێخ جەمیل
شاخی گۆیژە بەهاری ١٩٨١

له پشووی هاوینه‌دا بووین، خۆم به کرێکارییه‌وه خه‌ریک کردبوو، رۆژێک مامۆستا که‌ریم بانگی کردم وتی:

- عه‌لی عومه‌ری دراوسێمان، له کوێیه؟!

- عه‌لی پێشمه‌رگه‌یه.

- به‌ڕاستته؟!

- به‌ڵێ.

هه‌مدیسان دڵنیای کردمه‌وه.

- به‌ڵێ! پێشمه‌رگه‌یه.

- با یه‌ک شتت پێبڵێم: ئێستا عه‌لی، سه‌لاحی موهه‌ندیس و پێشمه‌رگه‌کانی گرتوویانه‌و له‌ژێر دارو ئه‌شکه‌نجه‌دایه داوای ئیعترافی لێده‌که‌ن.

- وتم: عه‌لی کوڕێکی زۆر پاکه ئه‌گه‌ر مه‌به‌ستی خراپه بوایه، ئه‌و هه‌موو براده‌ره‌ی له‌به‌ر ده‌ستدا بوو له‌گه‌ڵ ئه‌وان ده‌یکرد.

به‌ڕاستی که‌وتمه گومانه‌وه، هه‌میشه له‌به‌ر خۆمه‌وه ده‌مووت: عه‌لی کوڕێکی باشو بێ خیانه‌ت، ئێستاش ئه‌م مه‌سه‌له‌یه ڕووی داوه نازانم چی بڵێم، ئنجا ڕۆژانه ده‌بوایه ئاگام له‌م مه‌سه‌له‌یه بوایه، ده‌ڕۆیشتم بۆ ماڵی عه‌لی بۆ هه‌واڵ پرسینو ده‌نگو باسی، له ڕێگه‌ی خه‌ڵکی سیته‌که‌وه که دراوسێمان بوون، له‌کوڕانی ماڵی کوێخا ڕه‌حیم هه‌واڵم ده‌زانی له دوای ئه‌شکه‌نجه‌و لێدانێکی زۆر هیچی له‌سه‌ر نه‌بوه‌و ئازاد کراوه.

ماوه‌یه‌کیش هه‌ر پێشمه‌رگه ده‌بێت له‌گه‌ڵ سه‌لاحی موهه‌ندیس، به‌ڵام دوایی بێزار ده‌بێتو ده‌ڕواته‌وه بۆ سه‌رکردایه‌تی، له‌وێ چه‌ک داده‌نێتو به‌ره‌و ئێران ده‌ڕوات.

له دوای ئه‌وه مه‌سه‌له‌ی عه‌لی کۆتایی هاتو چه‌ند براده‌رێکیش ده‌ستبه‌رداری کاری ڕێکخستن بووینو په‌یوه‌ندیمان نه‌ما، به‌ڵام خه‌می عه‌لی لای من ببووه

خەمێکی گەورەو هەمیشە ئەوەم لێکدەدایەوە عەلیو خیانەتیان نەوتووە، بەڕاستی منیش هیچم بۆ ڕوون نەبووەوە، عەلیشم لە دەستچوو بوو، نە دەنگم دەیگەیشتیو نە هیچ زانیارییەکی تەواویشم دەستدەکەوت.

با ئەوەش بڵێم ئەو شانەی ڕێکخستنە چەند چالاکییەکی تەقینەوەیان کرد لەناوشاردا، جگە لەبەیانات و پۆستەر بڵاوکردنەوەو ڕاپۆرت ناردن لەسەر کەسانی خراپ و خۆفرۆش، ئەو کارانەش بەسەرپەرشتی ئەحمەدی حاجی مەحمود دەکرا کەئێستا پێشمەرگەی خانەنشینە.

ڕاستی ڕووداوەکە هەر لەم بەشەدا باس دەکەم پاش چەند ساڵ لەیەکدابڕانی من و عەلی ئەو کارەساتەی بەسەریدا هات، لە زمانی عەلی عومەر خۆیەوە ئەینوسمەوە، کە خۆی بۆی گێڕامەوە:

من ئەوکاتە پەیوەندیم بە عەبدولڕەحیم سەنگەسەرییەوە کرد ساڵی ١٩٨٠، پەیوەندییەکەم لە ڕێگای ئەحمەدی حاجی مەحمودی گەڕەکی خۆمانەوە بوو.

ئەوکاتە ئەو لە چوارقوڕنە دادەنیشت، پەیوەندی دروستکردبوو، منیش وەکو گەنجێک حەزم دەکرد خزمەت بە گەلو نیشتمان بکەم، پاشان پەیوەندیم لەگەڵ بەکری شێخ مەحمود، کە خاڵی ئەحمەد خۆی دەکات، زاهیری حاجی مەجیدو تۆ دروستکرد، زۆر حەزم دەکرد ئیشی باش بکەم بۆ شۆڕش، بەڵام باوەڕم بە هەموو کەسێک نەبوو، لە ئەنجامی بێئەزموونی خۆمو دڵپاکیم لەگەڵ هاوڕێیاندا توشی ئەو کارەساتە بووم کە بەسەرم هات.

ئەوکاتە قالەی حەمەی مەلا نایەر، لە هەیئەی کەرکوک ئازاد کرا، منیش نەمزانی بۆ جاسوسیو خۆفرۆشی ئازادیان کردووە، لەگەڵ عەلی مام قایەری گەڕەکی خۆمان ڕۆیشتین بۆ لای ((ئەو کاتە شانازی بوو بۆ کوردێک ئەگەر بگیرایەوەو ئیعترافی نەکردایە و ئازاد بکرایە)) عەلی بەیەکی ناساندین کاک قادر لە زیندانی فاشییەکان ئازادکراوەو کەسێکی بەتواناو لێهاتووە، کاک عەلی لێپرسراوی شانەیەکی ڕێکخستنی ناوشار، ئێمەش یەکترمان ناسی، مەبەستی عەلی مام قادریش تەنها دڵسۆزی بوو چونکە ئەویش ئاگای لە هیچ نەبوو.

((عەلی مام قادر لە ئامادەیی هەڵکەوت لەگەڵ قالەی حەمەی مەلا نایەر بەیەکەوە خوێندکار دەبن، بۆیە هەمیشە بەیەکەوە بوون))، کاتێک قادر دەگیرێو ئیعتیراف دەکاو خۆی دەفرۆشێتو دەبێتە جاسووس بەسەر بەندییەکانی ترەوە، بەڵام دوای ئەوەی لەهەیئەی کەرکوک کەشف دەبێت کە جاسووسە، پاشان بەعسییەکان ئازادی دەکەن بەمەرجێ کاری سیخوڕییان بۆ بکات.

لە دوای ئەوە قادر لەگەڵما بوو بە بـرادەر ئەو ٢ - ٣ مانگە بەیەکەوە بووین، منیش پێمووت بۆ کاری ڕێکخستن ئەو ئامادەیی خۆی دەربڕی، هەتا ماوەیەک بەیەکەوە بووین، من هیچ گوومانێکم لێنەکرد، بەڵام ئەو لەژێرەوە ئەم زانیارییانەی منی داوە بە پیاوانی ڕژێم ئەوانیش داوای بەڵگەی تەواویان دەکرد، بۆیە شەوێک منو قادر دەستمانکرد بە بڵاوکردنەوەی بەیانات لە شەقامی ئیبراهیم پاشا، بۆ بەیانی سەیرمانکرد یەک بەیانی پێوە نەماوە، توومەس پیاوانی ڕژێم ئاگاداری مەسەلەکە بوون، لەدوای ئێمەوە بەیانەکانیان لێکردۆتەوە، هەتا ماوەیەک بەیەکەوە بووین بەڵام ئەو هەمیشە دەیویست هاوڕێیان بناسێتو شارەزایی تەواو پەیدا بکات لە ناوماندا.

* * *

مانگی ٤ ی ١٩٨١ قادر وتی: لەگەڵم وەرە بۆ هەولێر برادەرێکی خۆشەویستم لە هەیئەی کەرکوک ئازاد کراوە جوابی بۆ ناردووم سەردانی بکەم، کوڕێکی زۆر باشە هاوڕێی ئازارو ئەشکەنجە بوو لەگەڵما، ئەوکاتە قادر سەیارەیەکی ڕینۆی پێبوو، ئیتر منیش وەکو برادەرێتی لەگەڵیا ڕۆیشتم، لەبەردەم قەڵای هەولێر چەند تەلەفۆنێکی لێبوو، سەیارەکەی وەستاندو دابەزی دەستیکرد بە تەلەفۆن کردن قسەکانی عەرەبی بوون، کە تەواو بوو پێموت: ئەرێ تۆ عەرەبی قسەت کرد؟ وتی: ئەو برادەرە عەرەبەو ئێستا دەگات بۆ لامان، منیش لە دڵی خۆما گوومانی خراپم پەیدا کرد، پاش کەمێک سەیارەیەکی قەمەرەی شۆفرلێت هاتو وتی: سەرکەون قادر ڕۆیشتە پێشەوەو منیش لە دواوە، لە ڕێگا بەسایەقەکەی وت: ئەمە عەلی یە.

- وتم قادر بۆ کوێ دەڕۆین؟ قادر وەڵامی نەدامەوەو سەیارەکە خۆی کرد بە دائیرەیەکی گەورەدا سەربازەکانی بەر دەرگا هەموویان سڵاوی سەربازییان کرد، پاشان لە حەوشەکەدا ڕاوەستا، ئێمەش دابەزین، ئیتر بە تەواوی کەوتمە گومانەوە، ڕۆیشتینە ژوورێکەوە زۆر گەورەو فراوان بوو، کاکی سایەق ڕۆیشتە پشتی مێزەکەوە، منو قادریش بەرانبەری یەک دانیشتین، ئنجا قادر بە یەکتری

ناساندین، بەڕێز معاون مدیری ئەمنی هەولێر، ئەمەش عەلی رووی کردە من وتی: هەرچی لێپرسیت بەڕاستی وەڵامی بدەرەوە، پاشان معاون وتی: چی دەزانی بێ کەمو کوڕی بیخەرە سەر ئەم مێزە؟ ئەوەشی نەیڵێی خۆمان و قادریش زۆر باش لەسەرت دەزانین، کە زانیم هیچ دەسەڵاتێکم نیەو هەموو شتێک لەسەرم دەزانن، لەولاشەوە خەمی هاوڕێکانم بوو هەمویان بناسن و بگیرێن و توشی کێشە ببن، بۆیە لەدڵی خۆما وتم: با فێڵێک بۆ دەرباز بوون بدۆزمەوە بەڵکو لەم مەسەلەیە ڕزگار ببم، پێم وتن: با مشاوەرەی دڵی خۆم بکەم و قسە لەگەڵ قادر ئەکەم دوایی وەڵامتان ئەدەمەوە، معاون وتی: ئەمە ئەخیر مەجالە خۆت جەماعەت بەگرت دەدەیت؟ یان ئیعترافت پێبکەین! چونکە قادر هەمووتان دەناسێ، ئەگەر خۆت بیڵێی باشترە ئەوکاتە سودمەند دەبی!، لەولاشەوە قادر خێرا، خێرا دەیوت ها چیت وت؟ ووتم باشە، وامنیش ڕۆیشتمە پاڵ قادر، خۆ ئێستا ئەو برادەرانە ئامادەنین دەبێ من کۆیان بکەمەوە، تاهەموویان بەیەکەوە بگرین، بەڵام بەمەرجێ منیش بگرن لەگەڵ ئەوان، بۆ ئەوەی کەشف نەبم باناوی من دیار نەبێ، قادر وتی: ئەمە قسەی تەواوی خۆتە، دوایی پەشیمان نەبیتەوە چونکە ئەگەر ڕێگەت پێبدەن لەسەر بڕوای من ئەم کارە دەکەیت، بەناچاری وتم باشە! ئنجا قادر کەوتە هەڕەشەکردن، نابێت لای کەس باسی ئەم مەسەلەیە بکەی، لەئەمڕۆوە ئیش دەکەیت بۆ ئەم حکومەتە.

بەڵام قادر لەمن بە گومان بوو! هەمدیسانەوە وتی: تەواو؟! وتم: تەواو.

ئنجا ڕویکردە معاون و هەموو شتێکی تێگەیاند، پاشان معاون وتی: ئەم کارە دەکەیت لەسەر شەرەفی قادر؟، وتم: بابڕۆینەوە، هەمووی جێبەجێ دەکەم، پاشان وتی: چەند کەسن؟ ، وتم:

- ٤ کەسین.

- من دەتبەمە لای جەنابی بەڕێوبەر پێشکەشی ئەوت دەکەم، بزانم ڕازییە یان نا؟

ئنجا هەرسێکمان ڕۆیشتینە ژورێکی تر بۆلای بەڕێوەبەر، منیان پێشکەش کرد

به عەمید موحسین بەڕێوەبەری ئەمنی هەولێر، هەموو شتێکمان تێگەیان ئەویش ڕازی بوو، دەستی برد بۆ چەکمەجەی مێزەکەی دەمانچەیەکی برۆندیکی چواردە خۆری دەرهێناو پێشکەشی کردم، منیش وتم: خۆم دەمانچەم لایە، بابرادەران هەست نەکەن، جارێ دەمانچەم پێویست نیە، ئنجا ١٠٠ دیناری دامێ وتی: ئەوە بەخشیشی منە، پارەکەم لێوەرگرت، زۆری قسە کرد، بۆ وورە ڕوخاندنی من بەرامبەر بەشۆڕش، وتی: زۆربەی پێشمەرگەش پەیوەندییان بەخۆمانەوە هەیە، زانیارییەکان لای ئەوانەوە دێن، ئێوەی گەنجیش بە خۆڕایی خۆتان بە کوشتن دەدەن، ئینشائەڵڵا ئەم کارە بکە پارەیەکی باش بەخشیش وەردەگریت، پاشان وتی: من ئێستا لەگەڵ ئەمنی سلێمانی قسە ئەکەم پەیوەندی بکەن بەوانەوەو کارەکە ئەنجام بدەن، دەستی دایە تەلەفون، لەگەڵ ئەمنی سلێمانی قسەی کردوو ناوی منی دانێ، دوایی وتی: بڕۆن بۆ لای نەقیب موسەننا هەموو شتێکی تێبگەیەنن و ئیشەکە ئەنجامبدەن، ئەو کارەکانتان بۆ جێبەجێ دەکات.

ئیشمان تەواوبوو، سواری سەیارەیەکیان کردین بۆ ناو هەولێر، ڕۆیشتینەوە بۆ لای سەیارەکەی خۆمان، بەرەو سلێمانی گەڕاینەوە.

ماوەیەک ڕۆیشتین قسەمان بەیەکەوە نەکرد، قادر وتی:

- ها، بۆ قسە ناکەی؟! ئەڵێی پێت ناخۆشە؟! دنیا هەمووی فشەیە ئەم لا بیتو ئەولا، هەر دەمریت! سەری بەرزو سەری شۆڕ هەر یەک مردنە، هەتا ئەمری لە دنیادا بەخۆشی ڕابوێرە، من لەخەفەتا نەمدەزانی چیبکەم ؟ لە دڵی خۆما هەزار شتم دەوت من چیم کردوو تووشی چی بوم، هەر چۆنێک بوو کاتمان بەرێکرد.

گەیشتینە ماڵەوە وتی: باپێت بڵێم لای کەس ئەم مەسەلەیە باس نەکەی، چونکە زیانی بۆخۆت هەیە، ئەوە من چەند مانگە نەمهێشتووە کەس بزانێ، ئنجا بڕیارماندا بۆ ئەنجامدانی کارەکە، وتم: بەیانی یەکتر دەبینینەوە و قسەدەکەین.

بۆ ڕۆژی دوایی قادرم بینیەوە وتی: بابڕۆین بۆ دائیرەی ئەمن، ووتم: پرسەمان

هەیە، وتی: پرسەکە لەکوێیە؟ منیش لەگەڵت دێم، وتم: لەگەرمیانە، من لەگەڵ باوکم و خزم و کەسوکار ئەڕۆم، مەترسە خۆشم حەزدەکەم ئەو کارەبکەم، قادر دڵی خۆش بوو، وازی لێهێنام، پاشانماڵەوەم ئاگادار کرد، هەرکەسێ هات هەواڵی منی پرسی بڵێن پرسەمان هەیە.

ڕۆیشتم بۆ چوارقوڕنە ئەحمەدی حاجی مەحمودم ئاگادار کرد، کەچیم بەسەر هاتووە، لەوێشەوە ڕۆیشتم بۆلای عەبدولڕەحیم سەنگەسەری و برادەرانی سەرکردایەتی، کێشەکەم تێگەیاندن، وتیان دەبێت تۆ نەڕۆیتەوە، وتم: خەمی هاوڕێیانی ناوشارمە دەبێ بڕۆمەوە، ٢ ڕۆژ دوای ئەوە هاتمەوە بۆ ناوشار، قادر هات بۆ لام وتی: عەسر وەرە بۆ ماڵمان ئیشم پێتە.

کاتێک ڕۆیشتم بۆ ماڵیان، ٢ کەسی تری لێبوون، یەکێکیان باڵا بەرزێکی سمێڵ زەرد، پێی ناساندم، نەقیب موسەننا، پاش چەند قسەیەک وتیان: ئێوارە لەبارەکەی ئوتێل ئاشتی دەعوەتی ئێمەی، دەبێ بێیت بۆ ئەوێ.

لای ئێوارە من و قادر بەیەکەوە ڕۆیشتین، وتی: دەبێ لە دەرگای دواوە بڕۆین باکەس نەزانێ.

کە ڕۆیشتینە ژورەوە، ئەوان لەسەر مێزیک دانیشتبوون خواردنەوەیان ئامادە کردبوو، دەستمانکرد بە خواردنەوە، دەیانویست من زۆر عەرەق بخۆمەوە، بۆ ئەوەی سەرخۆشم بکەن و قسەم لێدەربهێنن، بەڵام من ملم نەداو دووبیرەم خواردەوە، نەقیب موسەننا وتی: ئێ کاکە عەلی چەند کەسن؟

- کۆمەڵێک
- ناویان چییە؟
- دوایی دەزانن
- دەمانەوێ ئێستا بیلێی ؟
- قادر دەیانناسێ.

قادر وتی: من نایانناسم، دەبێ خۆت ناویان بڵێی، لەو قسانەدا بووین، دەستم گرت بەدەممەوەو ڕامکرد بەرەو دەستشۆرەکەو ڕشامەوە، کەڕۆیشتمەوە

بۆ لایان پێکی تریان بۆتێکردم بیخۆمەوە.

من خۆم گێژکردو خۆمکرد بەسەرخۆش وتم: لەوە زیاتر ناتوانم لەبەردڵی ئێوە خواردمەوە، هەرچی قسەیان لێپرسیم وەڵامم نەدایەوە.

ئەو شەوە گفتم دانێ کارەکە زوو ئەنجام بدەم، بارەکەمان چۆڵکرد، بۆ ڕۆژی دوایی خۆم لە قادر ونکرد، خۆم ئامادەکرد بڕۆم بۆ شاخ، برادەرێک هات بۆ لام وتی: قادری برادەرت کوژراوە.

منیش ڕۆیشتم بۆ سەرکردایەتی بووم بە پێشمەرگە ماوەی مانگێک لەسەرکردایەتی مامەوە.

لەوێ زۆر بیزار بووم، حەزم لە گەڕان بوو لەناوچەکاندا، ڕۆژێک سەلاحی موهەندیس هات بۆ سەرکردایەتی منیش داوام کرد لەگەڵ کاک سەلاح بڕۆم بۆ ناوچەی شارباژێڕ، لەگەڵ کاک سەلاح دابەزین، ئەو ماوەیە هەر لەگەڵ خۆی بووم، شەوێکیان وتیان: کاک مستەفا چاوڕەش بەنیازە بپەڕێتەوە بۆ بەری قەرەداغ، دەبێ چەند پێشمەرگەیەک وەکو حیمایە لەگەڵی بڕۆن تا ئەوبەری جادە، ئەو شەوە کاک مستەفاو دەستەکەیمان پەڕاندەوە پاشان گەڕاینەوەو شەو لەگوندی خەراجیان خەوتین، کە بەخەبەرهاتم پێشمەرگەیەک قاچی خستۆتە سەر سنگم وتی: هەستەو چەک دانێ، مەخزەکانیان لێکردمەوە.

(لە دڵی خۆما وتم هەر مەسەلەکەیەو قسەم لەسەرکراوە)، بەیانی زوو بەڕێکەوتینەوە بۆ جادەی دوکانیان، تا گەیشتینە ژێر دارەکەی حسک، لەوێ خستمیانە ژێر لێدان و ئەشکەنجەوە ئەوەندەیان لێدام نەمدەتوانی بڕۆم بەڕێگادا، ئنجا لەگەڵ خۆیان بردمیان بۆ گوندی سیتەک، سەلاحی موهەندیس لەوێ بوو بردمیان بۆ ژێردارەکانی خوار گوندەکەوە، ئەوندەی تریان لێدام نەمدەتوانی قسەبکەم ئەیانووت ئیعتیراف بکەو ڕاستیمان پێبڵێ، تۆ پیاوی حکومەتیت، لەیەکەم ڕۆژەوە چیم بەسەر هاتبوو هەموویم بۆ کاک سەلاح گێڕایەوە، پێشم وت کەسەرکردایەتی ئاگادارە.

وتم ئەگەر من کەسێکی خراپ بوومایە لەگەڵ قادر کارم دەکردو ئەو هاوڕێیانەی

ناوشارم بەگرت دەداو دەبوومە کەسێکی خۆفرۆش، بەڵام هیچ مەبەستێکی خراپم نەبووەو لەئەنجامی کەم ئەزموونی خۆم ئەم کارەساتەم بەسەرهاتووە، ئەوەشی راپۆرتی لەسەر من نوسیووە، دەزانم کێیە؟ ئەویش لە دڵسۆزی خۆیدایە ئەمەی کردووە، دڵنیاتان دەکەمەوە خیانەت لەمن ناوەشێتەوە، ئەوەی بەسەر من هات لەرێگای هاورێی خراپو کەسێکی ناپاکەوە بوو.

ئەمانە قسەی من بوون لەگەڵ سەلاحی موهەندیس، بەڵام پێشمەرگەیەکیان لەگەڵدا بوو، بەناوی هاورێ جەبار پورزای سەلاح خۆی بوو، وەختی خۆی لەخوێندنگە بەیەکەوە بووین، ئەو منی دەناسیو یەکتریمان خۆشدەویست، بەراستی بەرگرییەکی زۆری لێکردم، زۆری پێناخۆشبوو کە من ئەوەم بەسەر هات.

دوای هەفتەیەک باوکم و کەسوکارم هاتن بۆ لام تکای زۆریان بۆ کردم، خەڵکی گوندی سیتەک بەرگرییان لێکردم و زۆریش یارمەتییان دام، ئەگەر ئەوان نەبوونایە پێدەچوو لەژێر ئەشکەنجەدا بمردمایە، پاشان بە کەفالەت ئازاد کرام، چەکیشیان پێ دامەوە تا ٢ مانگیش هەر لەگەڵ کاک سەلاح بووم، لەدوای ئەوە داوای سەرکردایەتیم کردەوە، لەرێگەی ئێرانەوە لەگەڵ پێشمەرگەیەکی تردا گەراینەوە بۆ سەرکردایەتی.

دوای ماوەیەک لەوێش چەکم داناو رۆیشتم بۆ ئێران، لە تاران جێگیر بووم، بریارم دا لە ژیانما روو لە کوردستان نەکەمەوە، لە تارانیشەوە رۆیشتم بۆ ئیتاڵیا، لە ئیتاڵیاش نەمتوانی بژیم، گەرامەوە بۆ کوردستان.

(ئەمانە قسەی عەلی عومەر بوون لەزمانی خۆیەوە).

* * *

ئەم بیرەوەرییو بەسەرهاتە کە دەیخەمە روو تەنها ٢ مەبەستم هەبوو:

١ - کەم ئەزموونی عەلی لەکاری رێکخستن، کە بەدڵسۆزی خۆی توشی هەڵدێر بوو.

٢- دەستی خیانەتی خۆفرۆشێک کە هیچ وەفاو چاکەیەکی بەرانبەر بەکەس

نەبوو، تەنها مەرامە گڵاوەکانی خۆی هێناوەتە دی، ئەویش پارەو حکومەتی بەعس لێی ڕازی بن.

خەڵک دوایی بۆیان دەرکەوت کە قادر لە هەیئەی کەرکوک وەک جاسووس لە ناو بەندییەکاندا کاری کردووە، پاش کەشف بوون لەوێش هاتە دەرەوە بووەوە بە ئەڵقە لە گوێی ڕژێمی بەعس، ئەم مەوزوعەی بۆ ڕەخساو برادەرێکی پاکو بێگەردو ڕەوشت بەرزی خۆی توشی ئەم کارەساتە کرد لە پێناوی مانەوەی خۆیو پارەدا، عەلیش لەپێناوی هاوڕێکانیدا ئەو فێڵەی بەکار هێناوە بۆ ئەوەی دەرباز بێت لەچنگی دڕندەیی حکومەتی بەعس.

(( لە کتێبی کاروانی بێ کۆتایی مامۆستا مەحمودی مەلا عیزەت، قادر ناوی هاتووە چۆن بووەتە بەڵا بۆ مامۆستا مەحمودو بەندییەکان لەهەیئەی کەرکوک، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە ئەو کتێبە)).

ئەمەش کارەساتی مرۆڤێکی دڵپاک، بەدەستی خۆفرۆشێک چی بەسەرهات، عەلی دەیتوانی ئەو هاوڕێیانە بەگرت بدات، بەڵام ئێستاو ئەوساش خیانەتی لێناوەشێتەوە، تەنها ئەوەندەم پێناخۆش بوو عەلی کەسێکی پاکو بێگەرد بوو، یان وەکو ئەو پێشمەرگە نەبەردانە شەهید دەبوو، یان کەسێکی بەسود دەبوو بۆ شۆڕشو گەلەکەی، بۆشاییەکی پڕ دەکردەوە لە خەباتی نوێی گەلەکەماندا.

دوای ئەو کارەساتە هەمیشە خولیای ئـەوەم بوو، پەیوەندی بکەمەوە بەرێکخستنی ناوشارەوە بەڵام کەسم نەدەناسی، ماوەیەک لەگەڵ هاورێی گەرەک جەباری مام قادر خەریک بووین بۆ دروستکردنەوەی شانە، بریارمدا برۆم بۆ لای سەڵاحی موهەندیس لەرێگەی ئەوەوە پەیوەندی بکەمەوە.

رۆژێ رۆیشتم بۆ گەراجی چوارتاو سواری سەیارە بووم، لەرێگای سیتەک دابەزیم بەو چەمەیا رۆیشتم تا گەیشتم بەچەند جوتیارێ، لێمپرسین پێشمەرگە لەکوێن، وتیان: ئیشت پێیان هەیە، وتم: برایەکم لەگەڵ سەڵاحی موهەندیسە دەمەوێ برۆم سەرێکی لێبدەم، وتیان: برۆ بۆ گوندی گەرەدێ لەو ناوە پرسیار بکە، پێت ئەڵێن، گەیشتمە نزیک گوندەکە، چەند پێشمەرگەیەک لە ژێر دارێکدا بوون پرسیارم لێکردن.

وتیان: لە دەوروبەری چنگیانە، بەم چەمەدا برۆ سەرەوە پێشمەرگەی لێیە پرسیار بکە دەیانبینی.

بەرەو گوندی گورگەیەر رۆیشتم، چەند کەسێکم پێگەیشتن، پرسیارم لێکردن وتیان: کۆمەڵێک پێشمەرگە لەو چەمەدان، رۆیشتم بۆ لایان پرسیاری کاک سەڵاحم کرد وتیان: بۆ چیتە ؟

- هەندێ ئیشی خۆم هەیە !
- ئێمە پێشمەرگەی لای ئەوین، چ کارێکت هەیە؟
- کاری خۆم پێیەتی.

پێشمەرگەیەک لەگەڵم هات، تا گەیشتین بە کۆمەڵێک پێشمەرگەی تر نیوەیان خەوتبوون، هەر یەکەیان بە شتێکەوە خۆی خەریک کردبوو، وتی: لێرە بوەستە، ئەوەندەم زانی کاک سەڵاحی لەگەڵ خۆی هێنا بۆ لام.

پاش سڵاو وتم:

- بەرێزت کاک سەڵاحیت! وتی: ئەو نیم چ ئیشێکت هەیە پێی بڵێم.
- نەخێر ئەویت من دەتناسم.

- چۆن دەمناسیت؟

- لە ماڵی کوێخا ڕەحیم لە سیتەک، ئێوارەیەک بەیەکەوە نانمان خوارد، ئێمە میوانی ئەوان بووینو بەڕێزیشت بریندار بوویت، لەو کاتەوە من تۆم لەبەر چاوە.

- ڕاست دەکەیت.

- ئیشارەتی بۆ پێشمەرگەکە کرد کە بڕوات، وتی: ئیشت بە من هەیە؟

بەسەرهاتی عەلی عومەرو هاوڕێیانم بۆ گێڕایەوە، وتی ئێمە لە عەلی خۆشبووین زانیمان هیچی لەسەر نەبوو پاش لێکۆڵینەوە چەکمان دایەوە، دوایی خۆی چەکی دانا، وتم:

-ئێستا منو ٢ هاوڕێی تر بە نیازین کاری ڕێکخستن بکەینەوە، بەڵام دابڕاوین و کەس ناناسین، دەمانەوێت لە ڕێگەی بەڕێزتەوە پەیوەندیمان بۆ بکەیتەوە.

- هەوڵدەدەم پەیوەندیتان بۆ بکەم بەڵام دەبێ زۆر ئاگاتان لە خۆتان بێت، چونکە کاری ڕێکخستن ئاسان نیە، لەبەرئەوەی ئێوە لەناو شاردانو لەبەر دەستی ڕژێمی بەعسدان.

زۆری قسەکرد دەربارەی کاری ڕێکخستن، پاشان وتی: سەرم لێبدەرەوە، بەڵکو شتێکتان بۆ بکەم، جارێ بەردەوام بن لەسەر خوێندن با خوێندنتان نەفەوتێ چونکە شۆڕش بەری دوورە، بۆ ڕۆژێ دووان نیە، فریای دەکەون، هەتا دەتوانن بخوێننەوە، مەسەلەی شۆڕشی نوێ لە خەڵک بگەیەنن.

ئەو قسانەی ئەو دەیکرد، هێشتا من نەمدەزانی، بۆیە زۆربەی وەڵامەکانم هەر بەڵێ بوو.

پاشان بە شوێنی خۆما گەڕامەوە بەرەو سلێمانی.

## خوێندنی ساڵی ١٩٨١ – ١٩٨٢
## لە ئامادەیی کشتووکاڵی بەکرەجۆ

- ٧ -

کاتی کردنەوەی خوێندنگە بۆ ساڵی نوێ، منو وەهاب عوسمانو حەمە عەلی شەریف وەک لە پێشەوە باسمکرد هاوڕێ و خۆشەویستی یەکتر بووین بڕیاری ئەوەماندا، هەرسێکمان بڕوانامەی پۆلی سێیەممان ببەین بۆ ئامادەیی کشتوکاڵی بەکرەجۆ، لەوێ بەردەوام بین لەسەر خوێندن.

دوای پێشکەشکردنی بڕوانامەکانمان لە دوای هەفتەیەک وەڵامیان داینەوە کە وەرگیراوین.

خوێندنگەکەمان کەشو هەوایەکی خۆشی هەبوو، بە جلی کوردییەوە دەوامماان دەکرد. وانەکانیش ئەوەندە گران نەبوون، پارەی مانگانەی هەبوو بۆ هاتووچۆ مانگی ٢٢,٥٠٠ دینار، ئەو پارەیە زۆر باش بوو بۆ ژیانی ئێمە، خوێندنگەکە بریتی بوو لە ٢ بەش:

١ – بەشی پەروەردەی ئاژەڵی.

٢ – بەشی پەروەردەی ڕووەکی.

ئێمە بەشی پەروەردەی ئاژەڵیمان هەڵبژارد.

خوێندنگەکە پانتاییەکی گەورەی لەناو بەکرەجۆدا هەبوو هەموو شوێنەکان جیا کرابوونەوە، بەشی ئاژەڵی چەند بەشێک بوو وەکو شوێنی مانگاو مریشکانو هەنگو...، هۆڵێکی گەورە دانرابوو بەناوی مەکائن، بەشی ڕووەکیش پانتاییەکی گەورەی داگیر کردبوو وەکو شەتڵگەو نەمامگە و زۆری ترشیاتو...، بەشی دەغڵو دانو زەوی بۆ گوڵەبەڕۆژە کردن، ڕەزی مێو، چەند هۆڵێکی گەورە بۆ خەوتنی خوێندکاران، لەگەڵ ماڵی مامۆستاکان لەو سەری خوێندنگەکە بەڕووی شەقامەکە ئەوەندە کەشو هەوای خۆش و جوانیەکی بێ وێنەی هەبوو،

لەسەیرکردنی بێزار نەدەبووین.

چەند پۆلێکی تیابوو، کچان و کوڕان تێکەڵ بووین، بەڵام پۆلی ئێمە تەنها کوڕ بووین دەستمانکرد بە خوێندن و یەکترمانناسی لەگەڵ خوێندکارەکاندا.

جگە لە کتێبەکانی خوێندن، من هەمیشە کتێبی ترم پێبوو بۆ خوێندنەوە، کاتێک لەگەڵ خوێندکارەکان دەوەستاین بۆ قسەکردن، قسەکانمان هەمووی بۆنی سیاسەتی لێدەهات، ڕۆژانە زیاتر لە یەک نزیک دەبوینەوە لەگەڵ خوێندکارو مامۆستاکاندا، دوای مانگێک دەوام، ڕۆژێک ٢ خوێندکاری کچ بانگیان کردم، منیش ڕۆیشتم بۆ لایان، خۆیان پێناساندم بەناوی بەدریەو پەخشان ئەو ڕۆژە زۆرمان قسەکرد دەربارەی خوێندنگەو خوێندکاری باش، چەند کەسێکی باشمان دەستنیشان کرد، ئەو ٢ کچە زۆر کچی باش و خێزانی شەهیدیش بوون، هەردووکیان ڕەشپۆش بوون، ڕۆژانە زیاتر لە یەک نزیک دەبووینەوە، تا کەوتینە سەرباسی ڕێکخستنو کاری سیاسی، ڕۆژێک کچێکی تریان لەگەڵ خۆیاندا هێنا، ناوی گەلاوێژ بوو ئەویش برای شەهید کرا بوو، ڕۆژانە لە پشوی وانەکاندا هەندی جار بەیەکەوە قسەمان دەکرد.

ڕۆژێک بەدریەو پەخشان بانگیان کردم، وتیان: بۆ زانیاریت سەبیحەخان، مامۆستای زیندەوەرزانی براژنی حەمەجەزای هونەرمەندە، ئافرەتێکی زۆر باشەو خۆتی پێبناسینەو خەمت لێی نەبێت.

دوای چەند ڕۆژێک ڕۆیشتم بۆ ژووری تاقیگە بۆ لای مامۆستا سەبیحەخان، هەر خۆی لەوێ بوو کاری شیکاری تاقیگەی دەکرد ووتم:

- تۆ براژنی حەمە جەزایت.
- کێ وتی من براژنی ئەووم.
- بەدریە و پەخشان وتیان.
- ئەوانە کچی باشن خەمم نییە. وتی:

-من هاوسەری قادری حاجی عەلیم، قادر لەشاخەو یەک کوڕم هەیە ناوی لاوکە بەهۆی دووری هاوسەرەکەمەوە بێزارم لە ژیان.

منیش دڵم دایەوەو وتم: ئێمەی خوێندکار زۆر کەسی باشمان تیایە خەمی هیچت نەبێ، چیت پێویست بێ من وەک برای خۆت بۆت جێبەجێ دەکەم، تۆ خێزانی پێشمەرگەی زۆر پیرۆزو سەربەرزیت، بەتایبەت لای خوێندکاران.
تکای ئەوەی لێکردم لای کەس ناوی نەهێنم.

* * *

لەکاتی پشووی وانەکاندا، خوێندکاران کۆمەڵ، کۆمەڵ چەند هاوڕێیەک بەیەکەوە دەوەستاین، ئەو کۆمەڵە خوێندکارەی ئێمە بریتی بوون لەجەزای ئەحمەد کوردە، عەلی حەمە ڕەحیم، وەهاب عوسمان، حەمە عەلی شەریف، حەمید ئیسماعیل، فەرەیدون حەمە عەلی، حەمە ڕەشید، هۆگر محەمەد، تارق غەریب سەعید محەمەد حەوێز، محەمەد عەبدولڕەحمان، لوقمان ئەحمەد کەریم، جەوهەر ئەحمەد ساڵح و چەند خوێندکارێکی تر کە ناوەکانیانم لە یاد نیە، داوای لێبوردنیان لێدەکەم.
ناو بەناو پیاسەی ناو خوێندنگەکەمان دەکرد، بەتایبەتی ئەو شەقامەی کە دەڕۆیشت بۆ ماڵی مامۆستاکان، ئەمبەراو بەری هەمووی دارو گوڵو گوڵزار بوو، پیاسەو گەڕان بە ناویدا زۆر خۆشبوو.
ڕۆژێک من و عەلی و وەهاب و حەمیدو چەند خوێندکارێک پیاسەمان دەکرد بەناو خوێندنگەدا، سەیرمانکرد ژوورێک کراوەتەوە، چەند خوێندکارێک هاتووچۆیانە لەسەر دەرگای ژوورەکە نووسراوە (اتحاد الطلبة)، بڵند گۆیان هێناوەتە دەرەوە، گۆرانی ناسری ڕەزازییان لێدەدا، منیش لە هاوڕێکانم جیابوومەوە، بزانم ئەم ژوورە چییە؟
چەند خوێندکارێک هاتنە دەرەوە، فەرموو، فەرموو، ئێرە شوێنی ئێوەیە، پێخۆشحاڵین بێن سەردانی یەکێتییەکەمان بکەن.
وتم: ئێرە چییە ؟
- ئێرە (اتحاد الطلبة) یە بۆ کێشەو گیروگرفتی خوێندکارانە.

- ببوورن، من گیروگرفتم نیە!

- پێمان خۆشە بێیتە ژوورەوە.

- ببوورە، ئێرە شوێنی من نیە !

- بۆ ئێرە بەچی دەزانی؟!

- ئەم شوێنە پێشکەش بە خۆتان بێت.

یەکێکیان تووڕە بوو وتی: مانای ئەم قسەیە چییە؟.ئێمە بەچی دەزانیت؟ خوێندکارەکانی هاوڕێم لەدواوە وەستا بوون، کردمان بە پێکەنینو ڕۆیشتین.

* * *

پاش چەند ڕۆژێک لە ئیتحاد بانگ کرام، خوێندکارێک لە پشتی مێزەکەوە دانیشتبوو وتی: من ناوم کەریم شەفیقە، ئەمەش حەمە ئەمین سوارەیە.

ئەمەش مهابادخان، ئەوەش فلان، ئەوەش فلان، منیش وتم: ئێ:

- وتی: ئەڵێیت نازانی بڵێیت خۆشحاڵم بە ناسینتان.

- پێویست ناکات، بەڵێ قسە بکەن.

- بەپێکەنینەوە وتی: یانی ئەوەندە ڕقت لێمانە.

- کاکە قسە بکەن، بزانم چیتان دەوێت!؟

- هەستدەکەین جمووجۆڵێکی زۆرت هەیە لەناو خوێندکارانداو باستدەکەن.

- کێ باسم دەکات ؟!.

- پێویست ناکات پێت بڵێین.

- یانی من لە ئێوە زیاتر جمووجۆڵم هەیە؟!

- ئێمە حەقی ئەوەمان نیە، ئەوە قبوڵ ناکەین تۆ لێرە ئاوا بکەیت، خۆت باش دەزانیت ئێمە کارمان چییە ؟!.

- دەزانم کارتان چییە، چاودێری خوێندکاران، وا نیە!

- بەڵێ.

- ئەو ڕۆژە بە منتان وت ئێمە دانیشتووین بۆ کێشەو ئیشی خوێندکاران.

- کاکە با پێت بڵێم: ئەگەر بزانین ئاوا دەکەیتو دژی ئێمە دەجوڵێیتەوە نایەڵین لەم خوێندنگەیە دەوام بکەیت.

بە ڕقێکی ئەستوورەوە وتم: چیتان لە دەستدێت بێمنەت بن، هەستام ڕۆیشتمەوە بۆ ناو پۆل، کە وانە تەواو بوو هاتینە دەرەوە بۆ پشوو، خوێندکارەکان دەوریان دام، هەموو پرسیاریان کرد مەسەلە چی بوو، منیش هەموویم بۆ گێڕانەوە، هاوڕێیان هەمویان وتیان: نەترسیت، چییان لە دەستدێت با بیکەن.

هەفتەیەکمان تێپەڕاند، منیش هەمان کەس بووم جمووجۆڵم زیادی کرد کەمی نەکرد، لەبەردەمی ژوری ئیتحاددا باخ بوو، کورسی تیا دانرابوو، ئێمەش لەسەر کورسییەکان دادەنیشتین و دەستمان دەکرد بە پێکەنین و قسەکردن لەدژی ئەوان.

* * *

بەڕێوەبەری خوێندنگەکەمان ناوی عادل تۆفیق، کەسێکی باڵا بەرزی گەنج بوو، بەعسی بوو بەڵام توندوتیژ نەبوو، بەڕەگەز تورکمانی کەرکوک بوو، کوردی دەزانی، ڕۆژێک بانگی کردم بۆ ژوری خۆی وتی: دەرگاکە دابخە.

- تۆ، ڕەئووف ناوتە ؟!

- بەڵێ، من ناوم ڕەئووفە.

- عەفوو، من باش کوردی نازانم.

- گرنگ نیە.

- تۆ حەرەکەی زۆر هەتە لە ناو مەدرەسە بۆچی؟ وتم:

- تۆ خەڵکی کوێیت؟

- تۆ حەقت لەسەر من نیە!

- حەز ئەکەم بزانم.

- من تورکمانی کەرکوکم !

- من غەڵەتم هەیە؟

- نەزانم، وا ئەڵێن بە من وتیان: ئەو تەڵەبە بانگ بکە قصەی لەگەڵ بکە

بزانە چی دەوێت؟

- ئیتحادییەکان وتیان؟

- من حەقم لەسەر ئیتحاد نیە.

- کەواتە من کەسێکی خراپم، باشە خراپەی من چییە؟ پێم بڵێ با خۆم چاک بکەم.

- وەڵڵا من نەزانم.

- ئەی چۆن من بانگ دەکەیت بۆ ئێرە!

- تۆ هاتوویت بۆ خوێندن، تۆ کوڕی فەقیر حەقت لەسەر کەس نەبێ، بڕۆ دەرس خۆت بخوێنە باشترە بە قصەی من بکە.

بە پێکەنینەوە وتم: بەسەر چاو چاکتر دەبم !!

بەرەو پۆل گەڕامەوە، سەیرمکرد سەبیحەخان لەناو پۆلدایە، ڕۆیشتمە ژورەوە چەند خوێندکارێک وتیان چی بوو؟

منیش بە تووڕەییەوە وتم: دیسانەوە تەحقیقە، وەڵڵاهی دەڵێیت لە هەیئەی کەرکوک گیراوم، هەموو دەستیانکرد بەپێکەنین.

* * *

چەند ڕۆژێکی بەسەردا ڕۆیشت، لەکاتی پشوودا لەگەڵ چەند خوێندکارێک وەستا بووم، خوێندکارێکی سەر بە ئیتیحاد هات وتی: بانگت دەکەن.

- لە کوێ ؟

- ئیتیحاد.

خوێندکارەکان تکایان لێکردم لەسەر خۆ بم، نیوەشیان دەیانوت قسەیان لێ قبوڵ نەکەیت، کە ڕۆیشتم هەر ئەو چەند کەسە بوون.

- چییتان دەوێت ؟

- فەرموو دانیشە !

- دانانیشم.

- کاکە دانیشە قسەت لەگەڵ دەکەین.
- قسە بکەن.
کەریم شەفیق وتی:
- کاکە بڕوابکە ئێمە لەبەر قازانجی تۆ قسەدەکەین ئەوەتا ڕاپۆرتت لەسەر هاتووە، پەیوەندییەکی زۆرت هەیە لەگەڵ خوێندکاران و جموجوڵت زۆرە، بڕوا بکە پێمان خۆش نییە هیچ کێشەیەک بێتە ڕێگەت، ئێمەش وەکو تۆ کوردین.
- من هیچ کێشەم نیە، ئەگەر ئێوەش بۆم دروستدەکەن، دەستتان خۆشبێت.
وتی: ئێمە دانیشتوین بۆ کێشەی خوێندکاران، نەک کێشە دروستکردن، حەز ناکەین توشی هیچ ببیت ئەوان زۆریان وت و من کەمم بیست.
مهاباد، دەستی خستە سەر شانم وتی: کاک ڕەئووف زۆر کوڕێکی ڕێک و پێکە، من پێمخۆش نییە بەو شێوەیە قسەی لەگەڵ بکرێ، بەتوڕەیەوە وتم: دەستت لابە هەموو بەزمەکە تۆی، جارێ ئەمە شوێنی تۆ نییە کەمێک لە خوێندکار بچویتایە لێرە دانەئەنیشتی. مهاباد توڕە بوو وتی:
- بۆ ئێرە بە چی دەزانی؟ زیاد دەڕۆی، شەرم ناکەیت ئەو قسانە دەکەیت، دەنگمان بەرز بۆوەوە، ئەوەندەمزانی کۆمەڵێک خوێندکاری تر هاتن وتیان: ئەوە چیە؟ خۆتان بەچی دەزانن.
دوای خوێندنی ٢ وانە، هەمدیسان بەڕێوەبەر بانگی کردمەوە.
- ڕەئووف تۆ موشکیلە؟ ئاوا بکەیت من نەقڵی تۆ دەکەم.
- ئەگەر یەک هەڵە لەمنەوە هەیە چی دەکەی بیکە! ئەوان واز لەمن ناهێنن.
- ئێرە شوێن خوێندنە، شوێن سیاسەت نیە.
- منیش هاتووم بۆ خوێندن.
- بۆچی ئیتحاد بانگت دەکات، تەڵەبەی تر بانگ ناکات ها؟ ئێستا تۆ لەگەڵ تەڵەبەی تر تەعداتان کردووە لەسەر ئیتحاد، وەڵاهی ئەلئان بە ئیتحادو تەڵەبە بڵێم حساب بۆتان دەکەن، بڕۆ صەفی خۆت عاقڵ بە، داوای عەفوو بکە لە

ئیتحاد.

منیش کەمێک سەیرمکردوو ڕۆیشتم.

دوای ٣ ڕۆژ بەیانییەک ڕۆیشتم بۆ خوێندنگە سەیرمکرد خوێندنگە زۆر بێدەنگە، کچەکان زۆربەیان ماتن، خوێندکارە کوڕەکان، کۆمەڵ کۆمەڵ سەریانکردبوو بەیەکدا، کۆمەڵێک هاوڕێی خۆم وەستا بوون منیش ڕۆیشتم بۆ لایان، باس باسی مهاباد بوو، وتم: چیبووە؟

وتیان: مهاباد کوژراوە، وتم چۆن کوژراوە، وتیان نازانین.

دوایی ڕونبووەوە ئامۆزایەکی خۆی بە سەیارە بردبووی بۆ ڕێگای عەربەت لەوێ کوشتبووی، بەماڵی مامیشی وتبوو من کوشتومەو بەئارەزوو لەبەرئەوەی وایەو، وایە، ئیتر بەجارێ ئیتحاد هەرەسی هێناو دەرگای بە تەواوی داخرا، ئیتحادییەکان ٧ - ٨ کەس بوون یەکێکیان خۆی گواستەوە بۆ خولی نائب ضابط، ئەوانی تریش وازیان هێناو کۆتایی بەمەسەلەکە هات. مایەوە سەر کەریم شەفیقو حەمە ئەمین سوارە، ئەوانیش هەر ئەو ساڵەیان مابوو، بەڵام زۆر بێدەنگ بوون.

لە دوای ئەوە ڕێگامان بۆ خۆشبوو، خوێندنگە بوو بەهی خۆمان، کەریم شەفیقو حەمە ئەمین سوارە زۆر کوڕی باش دەرچوون تەنانەت بوون بە هاوڕێی خۆشم.

* * *

دوای نەمانی ئیتحاد حکومەت مەفرەزەیەکی ١٥ سەربازی نارد بۆ ناو خوێندنگەکەمان کەسەر بە ئیستخباراتی عەسکەری بوون، بۆ جموجۆڵی خوێندکارانو بە شەویش پاسەوانی خوێندنگەکەو ئاگاداری ماڵی مامۆستاکان بن، ئەوەش لەسەر داوای بەڕێوەبەر عادل تۆفیق هاتبوون.

بەڵام ئەوەش کۆڵی بە ئێمە نەداو نەیترساندین، چونکە کۆمەڵێک مامۆستامان هەبوو هەموویان کورد پەروەر بوون، زۆر ڕێزیان دەگرتین، مامۆستا فایەقی حاجی ڕەفیق خراجیانی هەتا بڵێیت مامۆستایەکی قسەخۆش و بەڕێز بوو

هەڵویستێکی جوانی هەبوو بەرانبەر خوێندکاران، بەداخەوە لەکۆڕەوەکەدا کۆچی دوایی کرد، مامۆستا محەمەد سەردار برای ئەحمەد سالار، ئەویش بەڕاستی مامۆستای چاکبوو وانەی هەنگی پێدەوتین، مامۆستا حەسەن گەرمیانی و مامۆستا کیومەرز نیک ڕەفتار خەڵکی ڕۆژهەڵات بوو، وانەی کوردی پێدەوتین مامۆستایەکی زیرەکو زمانەوانی بوو لە کوردیدا، زۆر هەوڵی دا تا کتێبی دیوانی بێسارانی چاپکرد، نوسخەیەکیشی بەخەتی خۆی لەو دیوانە پێشکەش بەمن کرد، هەتا ئێستاش ماومە.

خوێندکارانیش گوێیان نەئەدا بە هیچ ڕووبەڕوو بوونەوەیەکی ڕژێم، هەموو هەڵویستیان هەبوو، زۆربەی سەر بە ڕێکخراو بوون، بۆ هەموو شتێک پشتی یەکترمان دەگرت.

* * *

ڕۆژێک خوێندکارێک هات بۆ لام، وتی: پێمخۆشە بەیەکەوە کەمێک قسە بکەین، وتم فەرموو، بەناو شەقامی خوێندنگەکەدا کەوتینە پیاسەکردن، وتی: دەستخۆشی ئەو ئیشە باشەتان لێدەکەم، کە ئیتحادتان نەهێشت لەناو خوێندنگەدا.

- سوپاست دەکەم، ئیش بە تەنها ناکرێت، ئێمەش بە هاوکاری خوێندکاران کردوومانە، هەتا دەستی ڕژێمی بەعسمان تیادا نەبێت.

- وتی: من فازیلی سەید عەلیم، برازای جەلال سیرەمێرگی.

فازیل کەسێکی زۆر توندوتیژ بوو، وتی: وەڵڵاهی هەتا ئێستا ئیتحادی تیادا بمایە، شەوێک دەمسوتان نامەوێ بەسەر شۆڕی بژیم، دەبێت دەستێکی باش لەم ڕژێمە بوەشێنم ئیتر شەهیدیش بم گوێ نادەمێ، بەرخی نێر بۆ سەربڕینە، مرۆڤ یەکجار دەمرێت، حەیف نیە شەهید نەبیت لە پێناوی کوردستانا.



لەڕاستەوە: حەمەئەمین سوارە - کەریم شەفیق — ئەو بەعسییە عەرەبەی کە کۆبووتەوەی بە خوێندکارە ئیتحیادییەکان ئەکرد لەئامادەیی کشتوکاڵی بەکرەجۆ

لەناو حەوشەی خوێندنگەدا ماتۆڕێکی سوور وەستا بوو، منیش وتم:

- ئەم ماتۆڕە هی کێیە ؟

عەلی حەمە ڕەحیم وتی: هی منە.

- ماتۆڕی چاکە، زۆریش جوانە، پیرۆزت بێت.

- سوپاست دەکەم، دەڵێیت حەزی لێدەکەیت ؟!

زۆرمان قسە کرد دەربارەی ماتۆڕ، بۆ ڕۆژی دوایی لە حەوشەی خوێندنگە، لەگەڵ چەند خوێندکارێک یاری تۆپی بالەمان دەکرد، ڕوومکردە عەلی حەمە ڕەحیم وتم:دەتوانی بەیەکەوە، بە ماتۆڕەکە بڕۆین تاماڵەوەمان هەندێ ئیشی خۆمم هەیە.

سواری ماتۆڕەکە بووینو ڕۆیشتین، لە ڕێگا زۆرمان قسەکرد لەبارەی ماتۆڕەوە بۆ کاری ڕێکخستنو ئیشی ناو شار، تێبینیم کرد عەلی هەڵوێستی باشە.

بۆ ڕۆژی دوایی عەلی وتی: بابەیەکەوە بڕۆینەوە، لەڕێگا وتم: حەزت لە خوێندنەوە هەیە؟ وتی: تا ئێستا نەمخوێندۆتەوە!

- من چەند کتێبێکت بۆ دەهێنم، بیانخوێنەرەوە، بزانە چەند سوودی هەیە بۆ خۆ ڕۆشنبیر کردن، گەیشتینە ماڵەوە، ٣ کتێبم بۆ هێنا، پاش چەند ڕۆژێک کتێبەکانی هێنایەوە، وتم: باسی چییان دەکرد؟

- یەکێکیان چیرۆکێکی خۆشبوو، بەڵام دوانیان باش تێنەگەیشتم !

- باشە ئەم جارە هەر چیرۆک و شیعری خۆشت بۆ دەهێنم هەتا ڕا دێیت لەسەر خوێندنەوە.

- نەخێر، بۆم مەهێنە، ئەمشەو قوات خاسە دەوری گەڕەکی ئێمەیان گرتبوو، بەڕاستی ترسی زۆرم هەبوو هەموویانم شاردەوە. منیش پێکەنیم وتم: جا ئەوانە چین تا بترسیت، تۆ خۆت تاقەتی خوێندنەوەت نیە، ئەم قسانە دەکەیت.

- بەخوا ئەوەی ڕاستی بێت، حەز ناکەم خۆم بە خوێندنەوەو سیاسەتەوە

خەریک بکەم.

تا ماوەیەک بەردەوام بووین هەرچۆنێک بوو هاتە سەر خەت و فێری خوێندنەوەم کرد.

وردە وردە بووین بە ٢ هاوڕێی خۆشەویست لەناو خوێندنگەدا.

(عەلی حەمە ڕەحیم لە ساڵی ١٩٦٤ لە گوندی کچانی سەر بە ناحیەی سەنگاو لە خێزانێکی هەژار هاتبوە دنیاوە، پاشان بەماڵەوە دێنە سلێمانی لە ساڵانی حەفتادا لەخوێندنگەی سەرەتایی دەخوێنێت پاشان دەڕواتە ناوەندی جمهوری لە گەڕەکی سەرشەقام، لە دوای پۆلی سێیەمی ناوەندی دێتە خوێندنگەی کشتوکاڵی بەکرەجۆ، کاتێک من تێکەڵیان بووم ئەوان خێزانێکی کەم بوون، تەنها ٢ براو ٢ خوشک بوون، عەلی دووەم کەسی خێزانەکەیان بوو، ماڵیان لە گەڕەکی خەبات بوو، خێزانێکی زۆر بەڕێز بوون، دوایی ئەوەندە تێکەڵ بووین تەنانەت بە خێزانی هەمیشە بەیەکەوە بووین، تا ئێستاش پەیوەندیو دۆستایەتم لەگەڵ ئەو خێزانەدا بەردەوامە).



عەلی حەمەڕەحیم ڕەئووف شێخ جەمیل

پۆلی یەکەمی کشتوکاڵ

# پەیوەندی کردنم بە ڕێکخراوی سلێمانیەوە

- ٩ -

بەرەو مانگی ١٢ دەڕۆیشتین، زۆر خولیای خوێندنەوەی کتێبی دایک بووم، ڕۆژێک لە خوێندنگە هاتمەوە، دوای نیوەڕۆ دەستمکرد بە خوێندنەوەی هەتا دوانزدەی شەو ٢٠٠ لاپەڕەم لێخوێندەوە، بڕیارمدا بۆ بەیانی نەڕۆمەوە بۆ خوێندنگە هەتا تەواوی نەکەم، بەیانیەکەی دەستم پێکردەوە، بۆ شەوەکەی تەواوم کرد.

(کتێبی دایک، لە نووسینی ڕۆماننووسی گەورەی ڕووسی مەکسیم گۆرکییە، وەرگێڕانی کەریمی حیسامی. ٥٠٢ لاپەڕەیە ڕۆمانێکی زۆر بە نرخو بە تامو چێژە، باسی شۆڕشی کرێکاریو چەوساندنەوەی چینایەتی دەکات).

بۆ ڕۆژی دوایی کە ڕۆیشتم بۆ خوێندنگە، خوێندکارەکان هەمویان هەواڵیان پرسیم بۆ دوێنێ نەهاتیتەوە؟ منیش چاودێری پۆل بووم، بەسەر خوێندکارەکانەوە دەوەستام، وتم ئەوەی ڕاستی بێت کتێبی دایکم خوێندەوە، حەزم نەکرد دەستبەرداری ببم، ئەوەندە ڕۆمانێکی خۆشبوو هەتا مامۆستا هات بۆ پۆل، هەر باسی ئەو ڕۆمانەم بۆیان دەکرد، کاتی پشوو لەگەڵ جەزای ئەحمەد کوردە بەیەکەوە کەوتینە قسەکردن، ڕۆیشتینە خوارەوە بۆ ناخی سیاسەتو هەوڵدان بۆ میللەت، خۆ ئامادەکردن بۆ خزمەتی شۆڕشی نوێو باسی ڕێکخستنو خەباتی خوێندکاران شانبەشانی خەباتی نەتەوایەتی.

(جەزا کوڕی کاک ئەحمەد کوردەیە، لەخێزانێکی تێکۆشەری شاری سلێمانین، برای کاک هەڵۆو کاک عەتایە، کاک ئەحمەد زیاتر لە کوڕەکانی تێکۆشەرتر، کەسێکی زۆر خۆڕاگرو شۆڕشگێڕ بوو).

لەخوێندنگە جەزا سەیارەی پێبوو، ڕۆژێک وتی: ئەمڕۆ بەیەکەوە دەڕۆینەوە بۆماڵەوە هەندێ قسەم هەیە لەگەڵت، لە ڕێگا لەناو سەیارەکەدا نامیلکەیەکی

دامێ، وتی: دەتوانی ئەم نامیلکەیە بخوێنیتەوە.

سەیرمکرد یادی ٦ ساڵەی شەهید بوونی خاڵە شەهابو هاوڕێکانیەتی.

لای سلێمانی پالاس لەگەڵ جەزا لەیەک جیابووینەوە، شەوێ دەستمکرد بەخوێندنەوەی نامیلکەکە ٨ لاپەڕە بوو، ٤ لاپەڕەی وەکو بەیاننامەی یەکێتی نیشتمانی کوردستانو ٤ لاپەڕەشی لەسەر قارەمانێتی ئەو شەهیدە نەمرانە بوو، نامیلکەیەکی زۆر بە نرخ بوو، بۆ ڕۆژی دوایی بردمەوە بۆ جەزاو دەستخۆشیم لێکرد، پاشان لە خوێندگەدا، بەدەم ڕۆیشتنو پیاسە کردنەوە قسەمانکرد، لە دوای ئەوە قسەی منو جەزا بەردەوام بوو.

لەملاشەوە لەگەڵ عەلی حەمە ڕەحیم، باسی شۆڕشو خەباتی خوێندکارانمان دەکرد، هەروەها لەگەڵ ئەو ٣ کچە خوێندکارەی لە پێشەوە باسمکردن بەدریەو پەخشانو گەلاوێژ جار ناجارێکیش لەگەڵ پەری کە ئەویش کچێکی زۆر باش بوو، ئەو ئەوەندە زیرەک بوو هەموو ساڵێک یەکەمی خوێندنگەکە بوو، بەڵام زۆر خۆی لە قەرەی سیاسەت نەدەدا، پەری شاجوانی خوێندنگەکەمان بوو ئەوەندە بەڕێزو بە ڕەووشت بوو لە باسکردن نایەت.

لەگەڵ کچەکان باسی ڕۆشنبیریو دەوری ئافرەت لە شۆڕشدا، شانبەشانی پیاوان، ئەوان ئاستی ڕۆشنبیرییان باشبوو دەیانخوێندەوەو نهێنی پارێز بوون، لەبەرئەوەی خوشکو خێزانی شەهید بوون، زۆر دڵگەرم بوون.

جەزا دەیویست دەستی نهێنی خۆی لای من بکاتەوە بۆ کاری ڕێکخستن، تا ڕۆژێک پێموت: ئەگەر تۆ لە ڕێکخراودا ئیش دەکەیتو دەتەوێت من ڕابکێشیت بۆ کاری ڕێکخستن، ئەوە من ئامادەم گیانی خۆم ببەخشم بە شۆڕش، پێویست ناکات بە هەنگاو لە من نزیک ببیتەوە، چونکە من ئەو قۆناغەم تەواوکردووە، لەوەوپێش من کارم کردووە، ئێستا من بەهۆی چەند مەسەلەیەکەوە دابڕاوم، پاشان باسی زروفی خۆمم بۆ کرد کە لەگەڵ عەلی عومەر ڕێکخستن بووم و کاک سەلاحی موهەندیسیش ئاگادارەو بەنیازیشم سەردانی بکەمەوە لەسەر وەعدی خۆی، شتێکم بۆ بکات لەڕێکخراوی سلێمانی، ئێستا ئەگەر تۆ دەتوانی

پەیوەندیم بۆ بکەیتەوە بە کۆمەڵەوە، ئەوە زۆر باشەو ڕێگەی دوور بۆ من نزیک دەخەیتەوە، وە ئەگەر ڕێکخراوی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان نەبێت، من پەیوەندی ناکەم بە هیچ لایەنێکی ترەوە.

وتی: من پەیوەندیت بۆ دەکەم بەڵام دەبێت کەسێکی نهێنی پارێزو خۆڕاگر بیت، دەبێت ئەوەی ڕێکخراو پێت دەڵێت لە هەموو کارو فەرمانێکی ناوشاردا ئامادە بیت، منیش خۆشحاڵی خۆم دەربڕی، چونکە ڕێکخراوی سلێمانی نوسینی سەر دیوارەکانیان لەناو شاردا زۆر دروشمی جوانیان دەنوسی، وە لە شوێنی مەبەستدا، لە شەقامە سەرەکییەکان زۆر بوێرانە دەیاننوسی، پۆستەری شەهیدەکانیان هەمووی کەسانی ڕۆشنبیرو لێهاتوو بوون، لەبەرئەوە حەزو هیوام ڕێکخستنی سلێمانی بوو، ئەوکاتە کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان هەوڵی دەدا بۆ ڕزگاریو سەرفرازی هەژاران و ڕەنجدەران و زەحمەت کێشانی خەڵکی کوردستان، هەمویان خەڵکی ڕۆشنبیرو بە هەڵوێست بوون.

جەزا وتی: ڕاپۆرتێک بنووسەو باسی ژیانی خۆتی تیا بکە، کە پەیوەندیت هەبووە لەوەو پێش، ئێستاش ئامادەییت تیادایە لە خەبات بەردەوام بیت، منیش ڕاپۆرتێکم نووسی و دامە دەست جەزا پاش چەند ڕۆژێک وتی: ڕاپۆرتەکەت جێی خۆی گرتووەو چاوەڕەوانی وەڵام بە.

حەمە عەلی شەریف ئەیوت: ئەمەوی ماتۆڕ بکڕم، ئەویش ماتۆڕێکی کڕی، بەچەند ڕۆژێک خۆی فێرکرد، ڕۆژانە لەگەڵ عەلی حەمە ڕەحیم دەڕۆیشتن بۆ شەقامی ٦٠ مەتری، دەستی خۆی ڕادەهێنا بۆ فێربوون.

پاش چەند ڕۆژێک حەمە عەلی ماتۆڕی هێنا بۆ خوێندنگە، ئنجا ماتۆڕەکان بوون بە دوان، واتە هەردوو عەلی ماتۆڕیان هەبوو، ڕۆژانە من و عەلی حەمە ڕەحیم، بەماتۆڕێک و وەهاب و حەمە عەلی تریش بە ماتۆڕێک هاتووچۆمان دەکرد، بەهۆی ئەو ٢ ماتۆڕەوە ژیانمان ئاسان ببوو، چونکە دەبوایە ڕۆژانە لەسلێمانیەوە بڕۆیشتینایە بۆ بەکرەجۆ و بگەڕاینایەتەوە.

* * *

هەر خوێندکارێک کچ بێت یا کوڕ، بڕواتە خوێندنگەی کشتوکاڵی، یەکەم مامۆستا، مامۆستا عیزەت عەزیز دەناسێتو بە ماوەیەکی کەم دەبێتە هاوڕێی، چونکە ئەو مامۆستایە ئەوەندە مامۆستایەکی خاکیو قسە خۆشە.

مامۆستا عیزەت خەڵکی شاری سلێمانیەو دانیشتووی گەڕەکی چوارباخ برای مامۆستا مەجیدە بچکۆل و حەمە عەزیزی شاعیرە.

(مامۆستا عیزتی بێدەنگ و قسەخۆش،ماڵیان لە کۆڵانەکانی ئەمبەری پارکی ئازادییەو ئێستا خانەنشینە) ئەوەندە بە وەفایە، ئێستاش هەرچی خوێندکارێک ببینێ، هی ٤٠ ساڵ لەوە پێشیش بێت، دەیناسێتەوەو قسەی لەگەڵ دەکاتو هەواڵی دەپرسێت، ئەگەر ئەم قسەشی لەگەڵ نەکات، ئەوا خوێندکارەکە دەیوەستێنێتو قسەی لەگەڵ دەکات، بۆیە بەتایبەتی من مامۆستا عیزەتم خۆشدەویست.

هەر ئەو ساڵە پەیوەندیو هاوڕێیەتیم لەگەڵ چەندەها خوێندکاری کچو کوڕدا پەیدا کردبوو بەتایبەتی لە پۆلەکانی دووەمو سێیەم کە کەسانی زۆر چاکیان

تیابوو، ئەتوانم بڵێم هەتاکو ئێستاش دەیانبینم و هەواڵمان هەیە، عوسمان گێچنی خەڵکی گوندی گچێنەیە، هەرچەندە لە پۆلی ٣ بوو، بەڵام هاوڕێتیمان زۆر خۆشبوو، ئێستا لە ئەڵمانیا دەژی، شێخ عەزیز ئەویش بەهەمان شێوە لە پۆلی سێ بوو، کەسێکی بەوەفاو هاوڕێیەتی زۆر خۆشبوو ئیستا ئەویش بەڕێوەبەری خانەنیشینی پێشمەرگەیە لە سلێمانی، مەحمود کەنەکەوەیی و ئەلیاس و نزارو حەمە کەنەکەوەیی و ئەحمەد زرار (ئێستا ئەندامی مەڵبەندی ڕانیەیە) چەندەها خوێندکاری تر کەئێستا ناویانم بۆ نایە لەگەڵ شێخ فاروقی باخ هاوڕێیەتیمان خۆشبوو بەداخەوە لەشەڕێکی لابە لای خێڵەکیدا کوژرا، هەروەها لەگەڵ کچەکاندا گێلاس خان کچێکی زۆر چاکبوو ئێستا هاوسەری محەمەد پێنجوێنیە کە ئەویش لە هەمان خوێندنگە هاوڕێ بووین، هەروەها شاناز خان کە کەسێکی دەرکەوتەی ناو خوێندنگە بوو ئەویش دەستی نوسینی هەبوو لەناو چالاکی خوێندنگەشدا دەردەکەوت، نیگار خانو چەندەهای تر، ئێستا ئەم کۆمەڵە ئافرەتە هەموویان لە بەڕێوەبەرایەتی باخچەکانی سلێمانی کارمەندن، هەتاکو ئێستاش دەیانبینم، هەروەها عومەر مەرگەیی، نەهرۆ کۆیی، ئەوانە زۆر خۆشەویستی یەک بووین نەهرۆ ئێستا ئەویش لە ئەمریکایە.

لە پۆلەکەی خۆشماندا ژمارەی خوێندکاران لە ٣٠ خوێندکار زیاتر دەبووین هەر یەکەمان خەڵکی ناوچەیەک بوو، چەند کەسێک خەڵکی بەکرەجۆو زۆریان خەڵکی مەرگەو پشدەرو خەڵکی چەمچەماڵ و کفری و هەموو لایەکی تیادا بوو، بەڵام ئەوکاتە هەمومان بەبیروباوەڕ یەکێتی بووین، کەس لەکەس نەدەترسا، دەستی خیانەتمان تیادا نەبوو، هەموو ڕێزی یەکترمان دەگرت و پشتی یەکترمان بەرنەدەدا.

وەرزی بەهار لەلایەن یەکێتی و جەماوەرەوە بڕیاردرا لەسەرتاسەری کوردستاندا خۆپیشاندان بکرێت، شاری سلێمانی بەتایبەتی خەڵکەکەی ئامادەیی تەواوی تیادا هەبوو بۆ ئەو هەڵوێستەو خوێندکارانیش خۆیان ئامادە کرد.

ڕێکخراوی سلێمانیش لەو ڕووەوە هەڵوێستی خۆی دەربڕی، دژی ڕژێمی بەعس دەستپێشخەری خۆیکرد بە نوسینی سەردیوارەکانی ناو شارو شوێنە گشتییەکان، وە دەرکردنی بڵاوکراوە دژی ڕژێمی بەعس، بە دروشمی شۆڕشگێڕانە خەڵکیان هاندەدا بۆ ئەو مەبەستە.

جەزا پێی وتم: ڕێکخراوی شارەکان بە نیازن ئەم بەهارە خەڵکی کوردستان بە گەورەو بچووکو خوێندکارو ڕۆشنبیرەوە هان بدەن بۆ خۆپیشاندان، ئێستا ئەمر لە ڕێکخراوەوە هاتووە کە خوێندنگەکان هانبدەین بۆ خۆپیشاندان، ئایا تۆ دەتوانی بەشەو خوێندنگەی خۆمان بنوسی؟ وتم: ئامادەم.

- دەبێت ئاگات لەخۆت بێت، چونکە خۆت دەزانی خوێندنگەی ئێمە بەشەو پاسەوانی تیایە.

- لەم ٢ - ٣ شەوەدا ئەینووسم، بەڵام هاتنم لە سلێمانیەوە بۆ بەکرەجۆ بەشەو ئاسان نیە، بەتایبەتی دوای نیوە شەو، ئەی تۆ سەیارەت پێیە بۆ نامهێنی؟!

- کاکە هەوڵبدە خۆت بێیت، بۆ من نابێت!

هەر ئەو ڕۆژە ڕۆیشتم بۆ بازاڕ، پەمپێکی سپرای ڕەشم کڕیو خۆم ئامادە کرد شەوێک بڕۆم.

(وەکو لە پێشەوە باسمکرد، زۆربەی شەوان لە ماڵی کاک حاجی جەلالی دراوسێمان دەخەوتم بە هۆی هاوڕێیەتی کوڕەکانیەوە).

شەوی ٢ / ٣ / ١٩٨٢ لە ماڵی کاک حاجی بووم، ئەو شەوە ئیسماعیلی خزمیان هات بۆ ماڵیان پێیان دەووت ئیسماعیلی پوورە فاتە، خەڵکی گوندی

چوارتاق لای عەربەت بوو، تەکسییەکی لادای پێبوو وتی: نیازم وایە شەو لێرە بم، بە نیاز بوو بەیانی زوو دەربچێت بۆ ئیشی تەکسی، کاک ئەحمەدی کاک حاجیش ئەو کاتە سەرباز بوو لە (مەعەسکەر سەلام) بەشەو دەهاتەوە بۆ ماڵەوەو بەیانیان زوو دەڕۆیشت بۆ مەعسکەر، لە قسەکانا وا بڕیار درا بەیانی زوو کاک ئەحمەد ببات بۆ (مەعەسکەر سەلام)، منیش لەویادا بە فرسەتم زانی قسەکانی خۆم تێهەڵکێش کرد.

وتم: زۆر باشە منیش بەرن بۆ بەکرەجۆ، چونکە بەیانی زوو لەگەڵ چەند خوێندکارێکی هاوڕێم نیازمان وایە بۆیاخی پۆلەکانی خوێندنگەکەمان بکەین ئەگەر بمبەن سوپاستان دەکەم، ڕێگای دوورم بۆ نزیک دەخەنەوە.

هەرچەندە من شتی نهێنیم نەبوو لە ماڵی کاک حاجی وەکو کوڕی ئەو ماڵە وابووم، بەڵام هیچم ئاشکرا نەکرد، وتم نەک بڵێن با لەماڵی ئێمەوە توشی کێشە نەبیت.

ڕۆیشتمەوە بۆ ماڵی خۆمان، قوتووە پەمپەکەم هێناو بە دایکم وت شەو لە ماڵی کاک حاجی دەبم، خەمتان نەبێت.

بەیانی سەعات ٤ هەرسێکمان هەستاین ڕۆیشتین، لە پێشا منیان برد بۆ بەکرەجۆ، ئاسمان هەور بوو کەمێک باران دەباری، لەمدیو خوێندنگەکەوە وتم: لێرە دائەبەزم، ئەوان ڕۆیشتن و منیش لەملاوە کەپێی ئەڵێن ئەلبانەکە زۆر بە ئاگاداری ڕۆیشتمە ناو خوێندنگەکەمانەوە، خوێندنگەی ئێمە دیواری نەبوو، هەمووی سیم، واتە تەلبەند بوو، سیمەکانیش ناو بەناو دڕابوون خەڵک هاتوچۆیان لێدەکرد، ڕێگای باش هەبوو بۆ ڕۆیشتنە ژوورەوە، ٣ ژوور لەملاوە هەبوون کە یەکێکیان پۆلی خۆمان بوو، هەموو دیوارەکان بەدروشمی حیزبی بەعس بەخەتی خۆش نووسرابوون (عاش حزب البعث، عاش قائد صدام حسين، وحدة، حرية، اشتراكية، امة عربية واحدة، ذات رسالة خالدة)، ئەم دروشمانە هەمووی بە گەورەیی نووسرابون، منیش هەموویم بەپەمپەکە کوژاندەوە لە جێی ئەوانە دروشمی (بژی پێشمەرگە، سەرکەوتوو بێت خەباتی ڕەوای گەلەکەمان، بژی

کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان)، نووسی، ئنجا خۆمکرد بە ژوورەکانا، وێنەی سەدام حسێن بە گەورەیی هەڵواسرابوو لە پشتی تەختە ڕەشەکانەوە، وێنەکانم هەمووی ڕەشکردەوە، دەستمکرد بە نووسینی دیواری پۆلەکان (خوشکو برایانی خوێندکار، کاتی ڕاپەڕینو خۆپیشاندانە، دژی ڕژێمی بەعسی فاشست چاوەڕوانی دەستو بازووی ئێوەی ڕۆشنبیرین، جەژنی نەورۆز خۆتان ئامادە بکەن، گەلی کورد چاوەڕێی هەڵهاتنی ڕۆژی ئازادییە)، لەگەڵ چەند دروشمێکی تر.

ئەو ٣ پۆلەم تەواو نوسی، ویستم بڕۆم بەرەو پۆلەکانی ئەو بەرەوە، سەیرمکرد پاسەوانێک چەکەکەی گرتووە بە دەستییەوە بەشەقامی خوێندنگەکەدا لەو سەر پیاسە دەکات، ئاسمان خەریک بوو ڕووناکی تێدەکەوت، نمە نمە باران دەباری، منیش چاودێری پاسەوانەکەم دەکرد، کەپشتی کردە من، بەڕاکردن خۆم پەڕاندەوە بۆ پۆلەکانی ئەوبەر، پاسەوانەکە هەستی نەکرد، ئنجا دیوارەکانی ئەو بەریشم نوسی، خۆمکرد بەژوورەکانا، وێنەکانی سەدامم ڕەشکردەوە، دیواری پۆلەکانم بەدروشمی کۆمەڵە نووسی، دروشمەکانی حیزبی بەعسم هەمووی کوژاندەوە، بەچاودێرییەکی ورد هاتمە ئەملاترەوەئەو شوێنە پێیان دەووت حانووتەکە، سەربانەکەی تەنکی گەورەی بەسەرەوە بوو بۆ ئاوی خوێندنگە دانرابوو ئەمبەریشی تەوالێتی کچان بوو، دەستم کرد بە نووسینی دیوارەکەو ٢ - ٣ وشەم نووسیو لە دواوە دەمانچەم لێڕاکێشرا، وتی: دەست نەجوڵێنی، ئاوڕمدایەوە حەمە ئەمین سوارەی ئیتحادە.

(حەمە ئەمین خەڵکی چوارقوڕنە بوو، شەو لەژووری ئیتیحاد لە تەنیشت ژووری پاسەوانەکانەوە دەخەوت، لەوەوپێش لە بەکرەجۆ دەخەوت، شەوێک پێشمەرگە دەڕۆنە سەریو ئەویش ڕادەکاتو تەقەی لێدەکەن و برینداری دەکەن، لە دوای ئەوە لەناو خوێندنگە دەخەوت).

کاتێک من دیوارەکانی ئەو دیوم نوسیبوو، ئەو ڕۆیشتبوو بۆ تەوالێتی کچەکان، ئاگام لێی نەبوو، ئەویش ئاگای لە من نەبوو، من پشتم لەو بووە، کاتێک هاتە دەرەوە منی بینی، وتی: چ دەکەی؟

- چی دەکەم؟ دیوار دەنووسم.

- بە ئەمری کێ؟

((لە دڵی خۆما وتم خۆ من هەر دەگیرێم، با توندو تیژ بم لەگەڵی))

- وتم: دەستت لابە، بە ئەمری ڕێکخراو ئەینووسم، تێگەیشتی؟!

- بە ڕێکخستندا دەنازی، بۆیە وا دەکەی لەناو خوێندنگە!

- ئەی وەکو تۆ بم؟!

- بۆ من چیمە؟ ئەگەر خراپ بم ئێستا دەتوانم هەموو شتێک لەگەڵ تۆدا بکەم ئێستا کێ بەم کارەی تۆ دەزانێت!

- چۆن کێ دەزانێت، باش بزانە من ٢ کەسی ترم لەگەڵدایە.

- لە کوێندەرن.

- ئەوان چاویان لە تۆیە.

- چاو بەستەکی لە من دەکەی؟

- بەنیازیت ئەوانیش ئاشکرا بن.

- خوێندکاری ئێرەن؟

- کەمێک خلافاندمو ئیشارەتێکم بۆ دواوە کرد، دەستێکم وەکو سەلام بەرز کردەوە.

- ئەوە چییە؟

- هیچ نیە ئیشارەتم بۆ دواوە کرد بۆ ٢ هاوڕێکەی ترم، کەمێک هیواشم کردەوە.

وتی: خێرا بڕۆ با تووشی موشکیلە نەبیت.

- ئێرە دەنوسمو ئەو دیوارەی لای ژوری بەڕێوەبەر ماوە ئەینووسمو ئەڕۆم.

لەگەڵ وام ووت کەوتە پاڕانەوە بۆ خاتری خودا چ دەکەی، سەربازەکان بزانن منیش تووش دەبم، خێرا بڕۆ، دوایی قسان دەکەین، ئێستا من چی بڵێم لای پاسەوانەکان، چونکە ئەم بەیانیە هەر من هاتووم بۆ ئێرە، دەترسم بڵێن خۆت نوسیوتە.

- وتم: بە هیچ شێوەیەک ناوم نەهێنی، چونکە خۆت زەرەر دەکەیت!
- خۆم دەبری دەکەم، تۆ برۆ.

بە شوێنی خۆما گەڕامەوە بۆ دائیرەی ئەلبانەکە، هاتمەوە بۆ سەر شەقامە سەرەکییەکەی بەکرەجۆ، بارانەکە زیادی کردو منیش بە شەقامەکەدا ڕامکرد ترسی ئەوەم هەبوو پاسەوانەکان دوام بکەون، گەیشتمە سەرجادەی گوندی عەواڵ، تەکسییەکی لادا هات ڕامگرت، سەیرمکرد ٣ کەس لە دوای تەکسییەکەدان و پێشەکەشی چۆڵە، لەپێشەوە دانیشتم شۆفێرەکە وتی: بۆ کوێ دەڕۆی؟

وتم: بۆ کارگەی جگەرەکە.

گەیشتینە لای گەراجی مەسلەحەی پاسەکان تەنیشت مەڵبەندی ڕێکخستنی ئێستا، چارەکە دینارێکم دایەو دابەزیم، کەمێک بە شەقامەکەدا ڕۆیشتم و پێچمکردەوە بۆ ماڵی جەزا،ماڵیان لە گۆشەی شەقامە سەرەکییەکەی شەقامی سالم ، خوار (رعایە شباب) بەرانبەر بەڕێوەبەرایەتی شارەوانی ئێستا بوو، هێشتا کات ٦ ی بەیانی بوو، یەکەمجار بوو بڕۆم بۆ ماڵیان، لە دەرگام دا جەزا خۆی دەرگای کردەوە، کە منی بینی، وتی: چیبووە؟

- ئەم بەیانیە دیوارەکانی خوێندنگەم نوسی کەشف بووم.
- بەڕاستتە! کێ بینیتی؟
- حەمە ئەمینی ئیتحاد گرتمی.

بوەستە با خۆم بگۆڕم، خۆت دەزانی ماڵی ئێمە بە کەڵک نایەت لێرە بیت، پاشان بەرەو ماڵی حەمیدی هاوڕێمان ڕۆیشتین.

(حەمید کوڕێکی زۆر باش بوو، لە یەک پۆلدا بووین، زۆر ڕوو خۆش و نهێنی هەڵگر بوو، لێی نەدەترساین، برایەکی بەناوی مەجید پێشمەرگە بوو، ماڵیان بەرانبەر ماڵی جەزا بوو، لە کۆڵانەکانی ئەوبەر شەقامەکە پشتی عیمارەی عەتار، بەداخەوە لەم دواییەدا بە کارەساتی سەیارە کۆچی دوایی کرد).

لە دەرگای ماڵی حەمیدمان دا، حەمید خۆی کردیەوە.

- دەتوانین بێینە ژورەوە !؟

- فەرموون.

ڕۆیشتینە ژووری میوانەکەیان دانیشتین بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕانەوە، وتم: لەوانەیە هیچ نەبێت لەوە دەترسم سەربازەکان منیان بینیبێت بڕوا ناکەم حەمە ئەمین هیچ بکات، مەگەر زۆری لێبکەن.

هەرسێکمان قسەمانکرد بەیەک، کە ئەوان بڕۆن بۆ خوێندنگە، ئەگەر کەشف بوو بووم، ئەوا بێنەوە پێم بڵێن.

کات ٩ ی بەیانیمان دانا ئەگەر تا ئەوکاتە نەهاتنەوە بۆ لام مانای وایە هیچ نەبووە، خۆم ئەڕۆم بۆ خوێندنگە.

جەزا ڕۆیشتەوە بۆماڵی خۆیان.

حەمید وتی: بەخوشکەکەمم وتووە دەرگای میوانەکەمان لەسەرت دابخات تا باوکم دەڕوات، بڕوا بکە باوکم بزانێت حسابی منیش دەڕوات نەک تۆ!! کردمان بە پێکەنین.

داوای پاککردنەوەی دەستمم کرد، حەمید کەمێک نەوتی هێناو لەسەر دەست شۆرەکەیان دەستم پێشت، پاشان بە سابوون شتم تا بۆیاخەکە لێبووەوە.

ئنجا حەمید نانی بەیانی هێنا، من لە بێزاریدا نانم بۆ نەخورا وتم: هەر خوێندنەکەم نەفەوتێ چونکە ئەوە دواڕۆژمانە.

حەمید دڵی دامەوە وتی: دوا ڕۆژ کوا لەم وڵاتەدا دواڕۆژی ئێمە ئەو شاخەیە.

- من ئەڵێم: مانەوەمان لە ناو شاردا درێژە دانە بەخەبات.

- کە شتیش هات، دەسەڵات نیە.

سەعات حەوت و نیو جەزا هاتەوە، هەندێ قسەی ترمان کردو ئەوان ڕۆیشتن.

کات بوو بە ٩ هیچ دەنگو باسێک نەبوو، خوشکەکەی حەمیدم بانگکرد وتم: من ئەڕۆم ئەگەر ئەوان هاتنەوە بڵێ: ڕۆیشتەوە بۆ ماڵی خۆیان خۆی بگۆڕێت، ئەگەر شتێک ڕوویدا بوو، با لە دووڕیانەکەی بەکرەجۆ بە سەیارەکەوە بوەستن،

منیش بە تەکسی ئەڕۆم لەوێ دەیانبینم و قسەیان لەگەڵ دەکەم.

ڕۆیشتمەوە بۆماڵەوە، جلەکانم گۆڕی و چەند کتێبێکم هەڵگرتو هاتمە سەر شەقامەکەی لای ماڵی خۆمان، لای مزگەوتی حاجی مەلا شەریف تەکسییەک هات دەستم لێڕاگرت، سەیرمکرد هەمان تەکسی ئیسماعیلی شەو بوو کەخۆمی گەیاند بۆ بەکرەجۆ، وتم: کاکە ئەڕۆمەوە بۆ بەکرەجۆ؟ بەمەرجێ پارەی خۆم نەدەم سوار نابم، مەرجم لەگەڵدا کرد، لە ڕێگا دینارێکم دایە، وتی: بۆیاخەکەتان تەواوکرد.

- بەڵێ ئێستاش هاتمەوە خۆم گۆڕیو دەگەڕێمەوە بۆ خوێندنگە.

بەدەم قسەوە گەیشتینە دووڕیانی بەکرەجۆ، سەیری ئەو ناوەم کرد، نەسەیارەو نەجەزا وەستاوە، لەڕێگا بیرم لەوە کردەوە بڕۆم بۆ نەخۆشخانەی بەکرەجۆ سەردانێکی دکتۆر بکەم، ئنجا بڕۆمەوە بۆ خوێندنگە.

(چونکە گوێچکەیەکم تەنینەوەی هەبوو، دەئێشا).

بە ئیسماعیلم ووت: تا بەکرەجۆم ببە سەردانێکی دکتۆر دەکەم بۆ گوێچکەم، ئێستا نەخۆشخانەی بەکرەجۆ کەسی لێنیە.

لە نەخۆشخانە، هەندێ حەب و دەرزییەکم وەرگرت گەڕامەوە بۆ خوێندنگەو تەکسییەکەم ئیزندا، ڕۆێشتمە ژورەوە، سەیرمکرد جەیشی شەعبیەک وەستاوە، ناوی مستەفا، کارمەندی خوێندنگە بوو لە کاتی پێویستدا جلی جەیشی شەعبی لەبەردەکردو ئامادەدەبوو.

- وتی بۆ ئێستا هاتی؟

- لە نەخۆشخانە بووم.

- وەرەقەی نەخۆشخانەت پێیە؟

- وەرەقەو حەبەکانم پیشانداو، وتم:

بۆ هەواڵ دەپرسی؟ خێرە؟

- ئەڵێ: خێرە، ئا سەیری خوێندنگە بکە؟!

(دەرگای خوێندنگەکەمان ١٥٠ مەترێک لە پۆلەکانەوە دوور بوو).

سەیرمکرد ۳ پیکاب قوات خاسە وەستاوەو هەموو مامۆستاو خوێندکارەکان بە کۆمەڵ وەستاون، وتم: چی بووە؟

- ئاگات لە خۆت بێت خوێندنگە شێواوە.

- بۆ هیچ بووە؟

- ئەمشەو ڕێکخستن هەموو دیوارەکانی ناو خوێندنگەیان نوسیووە.

بەرەو پۆلەکان ڕۆیشتم قوات خاسەکان بڵاوبوبونەوە، مامۆستاکان هەمویان بێدەنگ وەستا بوون، خوێندکارەکان ناو ژوورو بەردەم سالۆنەکانیان بۆیاخ دەکرد.

کە گەیشتمە ناو حەوشەی خوێندنگە، حەمە ئەمین هات بەرەو ڕووم وتی: لەگەڵ من وەرە بۆ ناو پۆلەکان، با قوات خاسەکان شکت تێنەکەن، وتم: خۆ گومان لەسەر من نییە.

- وتی: نەخێر خەمت نەبێت. وتم:

- تۆ برۆ ترست نەبێت.

بە ناو قوات خاسەکاندا ڕۆیشتم، سەرم هەڵبڕی بەڕێوەبەر وەستاوەو خێسەم لێدەکات، زۆربەی خوێندکارەکان پێدەکەنین، خوێندکارە کچەکان لەبەردەم پۆلەکاندا وەستابوون سەیریان دەکردم.

قوات خاسەکان وێنەکانی سەدامیان لەژوورەکان لێکردبووەوەو خستبوویانە ناو سەیارەکانیانەوە، سەربازە پاسەوانەکانی ناو خوێندنگە گریان گرتبوو، چونکە گۆڵەکە لەوان کرابوو، حەمەئەمین خۆی گۆڕی بوو بە جلی قوات خاسەو دەمانچەکەی بەستبوو، وەکو لێپرسراوێک، ڕۆیشتبووە تەنیشت قوات خاسەکانەوە قسەی بۆ دەکردن.

خوێندنگە وا شێوا بوو بۆنی خوێنی لێدەهات، منیش ڕۆیشتم بۆ لای پۆلەکەی خۆمانەوە، ئەو ڕۆژە هیچ وانەیەک نەخوێندرا، چونکە دیواری پۆلەکان بۆیاخ کرابوون، ڕۆژەکەشی هەور بوو وشک نەدەبووەوە، ئەو ڕۆژە تەنها کێشە بوو، بەڕێوەبەری پەروەردە هاتبوو بۆ ئەوێ، خۆم لە جەزاو حەمید نزیک

نەخستەوە، (بەڵام چاومان هەموو شتێکی دەخوێندەوە).

سەعات یەک کاتی دەوامی خوێندنگە تەواو بوو، منو عەلی حەمە ڕەحیم بە ماتۆڕ ڕۆیشتینەوە بۆماڵەوە لە ڕێگا بە عەلیم وت: کێ ئەم ئیشەی کردووە؟

- کێ کردوویەتی کوڕی باشێک کردوویەتیو ئێمە تووش بووین (کردمان بە پێکەنین)، وتی دەستی ئەوە خۆشبێت کردوویەتی .

- باشە من لەوێ نەبووم قوات خاسەکان چییانکرد؟

- جا چییان نەکرد، کە من ڕۆیشتم ئەوان لەوێ بوون هەموو مامۆستاو خوێندکارەکانیان ڕیزکرد، بەڕێوەبەری پەروەردە هات، هەمویان غەزەبیان لێدەباری، هەڕەشەو قسەکردنو جوێندان بوو بە کوردو قسەی ناشیرین پێمان، وتم: ئەبێ ئێمەی خوێندکار هەڵویستمان بەهێز بێت، هەرچەندە ئەوان هەڕەشە بکەن، بەڵام دەبێت ئێمە زیاتر بەرەنگاریان ببینەوە.

* * *

لە خوێندنگە دوای ۳ ڕۆژ حەمە ئەمین هات بۆ لام، وتی: کوڕی باش، ئیشەکەمان هەر ئەوەندە بوو.

- ئەمەوێ کەمێک کۆن ببێت، پاشان قسە دەکەین.

- ئەڵێم خودا، ئەو خودایەیە، کە من و تۆ بەیەکەوە وەستاوین قسان دەکەین، ئەو هەموو شەڕو هەڕەشەیەی ناو ئیتحاد لەیەکترمان دەکرد.

- با خوێندکارەکان هەستنەکەن.

- ئێستا تۆ بەنیازی چی بۆ من بکەیت؟

- ماوەیەکی تر ڕاپۆرتێک بنووسە، خۆشم ڕاپۆرتێکت لە سەر دەنووسم، تۆ حەقی هیچت نەبێت!

* * *

ڕۆژێ بەدریەو پەخشانو گەلاوێژ بانگیان کردم. وتیان:

- دەنگو باس چییە؟

- هیچ نازانم !

- پەخشان وتی: تۆ هیچ نازانی ئاگری بنکا.
- بۆ چیم کردووە.
- ئاه، باوکە گیان، ئاگرت ناوە بە خوێندنگەکەوە، خۆشت لێ کەڕ کردووە.
- بڕوا بکەن ئاگام لە هیچ نیە!
- لە ئێمەی دەشاریتەوە!
کۆمەڵێک قسەمان کرد، دەربارەی خۆپیشاندان.
- وتم: ئێوە ئامادەن؟
- گەلاوێژ وتی: ئێمە ئامادە نەبین، کێ ئامادەیە.
- کچەکان تێبگەیەنن، با چاونەترس بن!
- خەمی هیچت نەبێت، بەسەری تۆ لە کوڕەکان ئازاتر دەبین.
- بەدری وتی: خۆت دەزانیت ئێمە خوشکی شەهیدین، لە شەهیدی برامان ئازیز تر نین.

منیش ئەم شیعرەی وریا قانعم وت:

کچی چواردە ساڵ بۆ زیندان نەبرێت
پرچە جوانەکەی دەسکەنە نەکرێــــت
ڕزگــاری نابێت ئەم کوردســـتانــە
تــیــایــدا دەرنــاچێـت سوپای بێگانە

سەرەتای بەهار بوو، کەش و هەوا خۆش، خوێندنگەی ئێمەش وەکو باخی گشتی وابوو، هەمووی دار و درەخت و گوڵو گوڵزار نەشئەیەکی خۆشی دەبەخشی، ئێمەی خوێندکاران زۆر ڕۆژ ١- ٢ سەعات دوای دەوام دەڕۆیشتینەوە بۆ ماڵەوە ئەوەندە خۆشبوو بێزار نەدەبووین.

ئەوکاتە منیش خولیای ماتۆڕ کەوتبووە سەرم، زۆرم حەز لێدەکرد، بەڵام پارەم نەبوو بیکڕم، بۆیە ڕووم لە هیوای برام نا، هەرچەندە ئەویش سەرباز بوو بەڵام شتێ پارەی هەبوو، دڵی نەشکاندم ماتۆڕێکی بۆ کڕیم، ئەوکاتە بۆ من زۆر خۆشبوو کە دەستی نەنا بەڕوومەوە، من و عەلی و حەمە عەلی ڕۆیشتین بۆ شەقامی ٦٠ مەتری، بەیەک ڕۆژ خۆم فێرکرد، بەڵام باش ڕانەهاتبووم تا حەفتەیەکیش نەمدەبرد بۆ خوێندنگە تا فێربووم، ئنجا ماتۆڕەکان بوون بە ٣ ماتۆڕ من و عەلی و حەمە عەلی، هەریەکە ماتۆڕی خۆمانمان پێبوو، بەهارەکەشی خۆشبوو لەگەڵ برادەران دەڕۆیشتین بۆ گەڕان و سەیران و دەشت و دەر.

پێمان نابووە مانگی ٤ وە مقۆمقۆی ئەوە هەبوو کە خۆپیشاندان دەکرێ، ئێزگەی یەکێتی ڕۆژانە بەرنامەی دادەنا بۆ خۆپیشاندان، کۆمەڵانی خەڵکی ئاگادار دەکردەوە کە خۆپیشاندان دژی ڕژێمی فاشستی بەغداد بکەن، لە شاری سلێمانی لە گەڕەکی مەجید بەگەوە سەری هەڵداو پاشان خوێندنگەی سلێمانی کچان زۆر بەگەرمی پێشوازییان لە خۆپیشاندان کردو بوونە سەر تۆپی خوێندنگەکان، پاشان هەموو گەڕەکەکانو خوێندنگەکانی گرتەوە، حکومەتی بەعس بەتەواوی کەوتبووە خۆی بە زەبری دارو گولله وەڵامی خەڵک و خوێندکارانی دەدایەوە، شاری سلێمانی بەجارێ خرۆشابوو، هەموو شەقامو ڕێگا سەرەکییەکان بە قوات خاسەو جەیشی شەعبی و سیخوڕەکانی ڕژێم تەنرابوو، هاتووچۆ زەحمەت ببوو لە هەموو لایەکەوە بانگکردنو پشکنین بوو، ڕێکخراو و

لیژنەی ناوشارو پێشمەرگەش درێغیان نەدەکرد بەرانبەر ڕژێم، دەستی باشیان لێدەوەشاندن.

ئێمەش وەک ئامادەیی کشتوکاڵی خۆمان ئامادەکرد، خەریکی پلاندانان بووین بۆ خۆپیشاندان، چونکە ئەوکاتە ئیزگەی یەکێتی ڕۆژانە ناوی ئەو خوێندنگەو گەڕەکانەی دەخوێندەوە کە خۆپیشاندانیان دەکردو خەڵکیان هاندەدا دژی سیخوڕەکانی ڕژێم.

بەڕێوەبەری خوێندنگە دکتۆر عادل مەترسی لێنیشتبوو منی بانگکرد بۆ ژووری خۆیو دەرگاکەی داخست، وتی: ڕەئووف ئیخبار چییە؟

- نازانم دکتۆر.

- یەعنی تۆ هیچ نازانی!؟ ماشاڵلا.

- ڕەئووف لە من قصە وەربگرە، ئەڵێن تەزاهورات دەبێت لەناو مەدرەسە ڕجا دەکەم با نەبێت، وەڵلاهی هەمومان زەرەر دەکەین تۆ بە تەڵەبەکان بڵێ با تەزاهورات نەکەن، وەڵلا حکومەت ڕەئی باش نیە مقابلتان تۆ چ دەڵێیت من لەگەڵ تۆ دەیکەم.

- دکتۆر عادل من دەمی ئەو هەموو خوێندکارەم پێناگیرێ؟!

ئەوەندەم وتو ڕۆیشتم.

لە دوای من چەند خوێندکارێکی تری بانگکردبوو، بەڵام کەس بە قسەی نەکرد.

ڕۆژانە پیکابەکانی قوات خاسەکان دەهاتنە ناو خوێندنگە بۆ چاودێری، چونکە هەموو خوێندنگەکان خۆپیشاندانیان دەکرد، ئێمەش ڕۆژێکمان دانا، بەیانییەکەی چەند خوێندکارێک هەستاین بەکارەکانو بەخوێندکارەکانمان وت: کەس نەڕواتە ناو پۆلەکانەوە، ئەمڕۆ خۆپیشاندان دەکەین، هەرچەندە بەڕێوەبەرو مامۆستاکان تیاماندا خەریک بوون و قسەیان بۆ کردین سودی نەبوو، کەس نەڕۆیشتە پۆلەکانەوە زۆربەی مامۆستاکان پێیانخۆشبوو بەس نەیاندەتوانی هانمانبدەن، بەڕێوەبەریش چونکە کەسی یەکەم بوو، خەمی خۆی بوو.

ئەوەندەمانزانی ٤ پیکاب قوات خاسە گەیشتنە ناو خوێندنگەو چواردەوریان گرتین، پاسەوانەکانی ناو خوێندنگەش کە ١٥ پاسەوانی سەر بە ئیستخبارات بوون هەمویان هاتن زۆریان لە ئێمە دەکرد کە بڕۆینە ناو پۆلەکان ئێمەش هیچمان نەڕۆیشتینە ژورەوە، لە حەوشەی خوێندنگە کۆبووینەوە، دەستمانکرد بە قسەکردنو هوتاف کێشان بە دەنگی بەرزو چەپڵە لێدان، بوو بە فیکو هوڕ بەرانبەر بە قوات خاسەکان.

خوێندکار تارق غەریب سەعید ڕۆیشتە پۆلێکەوەو ڕەسمێکی سەدامی هێناو بە ئاسمانا هەڵیدا بەرەو ڕووی قوات خاسەکان، شووشەو چوارچێوەی وێنەکە شکا، بوو بە فەرتەنە.

ئەوان بە چەکو کێبڵ و دار هاتن بۆمان، ئێمەش بەرامبەری ئەوان وەستاین، بوو بە تەقەکردن بەسەرماندا.

هەموو خوێندکارەکان بە کچو کوڕەوە کەوتینە ژێر ڕەحمەتی لێدانو تەقەوە، بڵاوەیان پێکردین، هەرچی هاوارم دەکرد ڕامەکەن، سەیرمکرد دەورم چۆڵبووەو دوو قوات خاسە هاتن بمگرن، ڕامکرد بۆ پشتەوە بۆ لای ماڵەکانەوە، لەگەڵ چەند خوێندکارێک ڕۆیشتین بۆ سەرجادەی بەکرەجۆ، ٣ قوات خاسە لولەی چەکەکانیان تێکردین دەستیانکرد بە تەقە وتیان نەگەڕێنەوە دەتانکوژین، ئێمەش گەڕاینەوە بۆ ناو خوێندنگە، بە ناو قوات خاسەکانا بە قۆناغە تفەنگ کەوتنە گیانمان، بردیانین بۆ ژووری مامۆستاکان، کە ڕۆیشتینە ژوورەوە سەیرمان کرد پڕە لە خوێندکار، بە خۆمەوە ١٧ کەس گیراین ٨ مان کچ بوون، بەدریەو گەلاوێژو پەخشانیش گیرابوون، ئەوان جلی ڕەشیان لەبەردا بوو، ئێمە زۆر خەمی ئەوانمان بوو.

پێموتن: کەس قسەی بەرزو نزم نەکات، با بەشێوەی بەرەڵلایی تێمان نەگەن، خۆمان ئەم ڕێگەیەمان هەڵبژاردووە، مرۆڤ یەکجار دەمرێت، هەندێک قسەم بۆ کردن.

ئەفسەرێکی ئەمن بە جلی مەدەنیەوە هاتە ژورەوە دەرگاکەی داخست، ڕۆیشتە

لای سەرەوە لە پشتی مێزەکە دانیشت، وتی: بۆ وا دەکەن چیتان دەوێت؟ لە چیتان کەمە قسە بکەن؟ ڕەفیقی ئێوە لە بەرەکانی جەنگ دیفاع لە خاکی عێراق دەکات، خۆی بە کوشت دەدات لە پێناوی نیشتماندا، ئێوەش لێرە خەریکی ئاژاوەن.

منیش هەستام وتم: لە هەموو شتێکمان کەمە، وتی: دەفتەر قەڵەم، مامۆستای خراپ، بیڵێ؟

- نەخێر ئازادی، ئێمە لەخوێندنگەین یا لە سجن داین، هەموو ڕۆژێک قوات خاسە دەوری خوێندگەکەمان دەگرێ.

وتی: دانیشە، گوێ بگرن وەڵڵاهی بەیەک ئیشارەت هەمووتان دەبەم بۆ دائیرە، بەس برۆنە ئەوێ چاوتان بە خۆتان ناکەوێتەوە، ئێوەش کوڕی فەقیرن خەریکی خوێندنی خۆتان بن قسە مەکەن حەز ناکەم هیچتان بۆ ببێت، جارێ ئێوە ٨ کچتان لەگەڵدایە لەبەر شەرەفی ئەو کچانە خۆتان توشی هەڵە مەکەن.

پاشان لای دەرگاکەوە وەستاو کەوتە هەڕەشەکردن، هەرکەس بڕوا بۆ پۆلی خۆی.

لەویادا ئەو ئەفسەرە فریامان کەوت، هەر خوێندکارە بۆ پۆلی خۆی، دەرگای هەر پۆلێک ٢ قوات خاسەی لێ وەستا بوو وردە وردە خوێندکارەکان هاتنەوەو کۆتایی بە خۆپیشاندان هێنرا، هەتا ڕۆیشتینەوە بۆ ماڵەوە چواردەورمان گیرا بوو.

ڕۆژی دوایی هاتینەوە بۆ خوێندنگە بەهەمان شێوە قوات خاسەکان لەوێ بوون، کۆمەڵێک خوێندکار وەکو نوێنەری خۆیان منیان نارد بۆ لای بەڕێوەبەر کە پێی بڵێم ئەگەر ئەو قوات خاسانە نەڕۆن خۆپیشاندان دەکەینەوە.

منیش ڕۆیشتم بۆ لای بەڕێوەبەر، ڕاسپاردەی خوێندکاران بگەیەنم، وتی: ڕەئووف هیچ مەکەن، ئەوە قەرار درا مەدرەسە دابخرێت، ئەمر لە تەربییەوە هات (حتی ئەشعار الآخر) بە ئەمری ئەمنی سلێمانی.

- ئەی تاقیکردنەوە؟

لای سەرەوە لە پشتی مێزەکە دانیشت، وتی: بۆ وا دەکەن چیتان دەوێت؟ لە چیتان کەمە قسە بکەن؟ ڕەفیقی ئێوە لە بەرەکانی جەنگ دیفاع لە خاکی عێراق دەکات، خۆی بە کوشت دەدات لە پێناوی نیشتماندا، ئێوەش لێرە خەریکی ئاژاوەن.

منیش هەستام وتم: لە هەموو شتێکمان کەمە، وتی: دەفتەر قەڵەم، مامۆستای خراپ، بیڵێ؟

- نەخێر ئازادی، ئێمە لەخوێندنگەین یا لە سجن داین، هەموو ڕۆژێک قوات خاسە دەوری خوێندگەکەمان دەگرێ.

وتی: دانیشە، گوێ بگرن وەڵڵاهی بەیەک ئیشارەت هەمووتان دەبەم بۆ دائیرە، بەس برۆنە ئەوێ چاوتان بە خۆتان ناکەوێتەوە، ئێوەش کوڕی فەقیرن خەریکی خوێندنی خۆتان بن قسە مەکەن حەز ناکەم هیچتان بۆ ببێت، جارێ ئێوە ٨ کچتان لەگەڵدایە لەبەر شەرەفی ئەو کچانە خۆتان توشی هەڵە مەکەن.

پاشان لای دەرگاکەوە وەستاو کەوتە هەڕەشەکردن، هەرکەس بڕوا بۆ پۆلی خۆی.

لەویادا ئەو ئەفسەرە فریامان کەوت، هەر خوێندکارە بۆ پۆلی خۆی، دەرگای هەر پۆلێک ٢ قوات خاسەی لێ وەستا بوو وردە وردە خوێندکارەکان هاتنەوەو کۆتایی بە خۆپیشاندان هێنرا، هەتا ڕۆیشتینەوە بۆماڵەوە چواردەورمان گیرا بوو.

ڕۆژی دوایی هاتینەوە بۆ خوێندنگە بەهەمان شێوە قوات خاسەکان لەوێ بوون، کۆمەڵێک خوێندکار وەکو نوێنەری خۆیان منیان نارد بۆ لای بەڕێوەبەر کە پێی بڵێم ئەگەر ئەو قوات خاسانە نەڕۆن خۆپیشاندان دەکەینەوە.

منیش ڕۆیشتم بۆ لای بەڕێوەبەر، ڕاسپاردەی خوێندکاران بگەیەنم، وتی: ڕەئووف هیچ مەکەن، ئەوە قەرار درا مەدرەسە دابخرێت، ئەمر لە تەربییەوە هات (حتی ئەشعار الآخر) بە ئەمری ئەمنی سلێمانی.

- ئەی تاقیکردنەوە؟

- وەڵڵا من نازانم !

منیش هاتمەوە بۆ لای خوێندکارەکان پێمڕاگەیاندن کە خوێندنگە دادەخرێت لەسەر بڕیاری ئەمنی سلێمانی.

لەگەڵ وامووت: بوو بە فیکەو هوتاف کێشان، هەموو بەجارێک ووتیان: سەرکەوتین ڕژێم لە ترسا خوێندنگەکانی داخست.

خوێندنگەکانی سلێمانی هەموویان داخران تا کاتی تاقیکردنەوە، تەنها مەبەستیان ئەوەبوو دژی ڕژێمی بەعس نەوەستینەوە.

* * *

دەرگای خوێندنگەکان داخران بڵاوەیان بەخوێندکاران کرد، تەنها بۆ ئەوەی خۆپیشاندان نەکرێت، ئەمە سیاسەتی ڕژێمە فاشستەکەی بەغداد بوو، تەنها لەبەر مانەوەی حوکمی خۆی ڕۆشنبیریی شارێکی پێشێلکرد.

بەڵام خۆپیشاندان بەوە کۆتایی نەهات لە گەڕەکو جادەکانی ناوشاردا هەر بەردەوامبوو، بەتایبەتی شەو چونکە حکومەت نەدەما، شار بەدەست کۆمەڵانی خەڵکەوە بوو زیاتر لە گەڕەکەکانی مەجید بەگو خەبات و شەهیدان، شەوانیش پێشمەرگە دەهاتنە ناوشار تێکەڵ بەخەڵک دەبوون.

* * *

١ / ٥ / ١٩٨٢ یەکەم ڕۆژی تاقیکردنەوەی خوێندکاران دەستپێکرد، خوێندکاران بەیەک شاد بووینەوە.

جەزا زۆر بێزار بوو، منیش پرسیارم لێکرد وتی: چەند ڕۆژێکە باوکم گیراوە، تەواوی خێزانەکەمان بێزارین لە خەفەتی باوکم تاقیکردنەوەم لە بیر نەماوە، حەزمدەکرد خۆمو براکانم هەموومان بگیرایینانەیە بەڵام باوکم نەبوایە، منیش دڵخۆشیم دایەوە، لەگەڵ ئەوەشدا ورەی بەرز بوو.

دوای چەند ڕۆژێک تاقیکردنەوەکانی کۆتایی ساڵ تەواو بوو، پاشان نمرەمان وەرگرت، ئێمە ئەو کۆمەڵە خوێندکارە هەمومان دەرچوین.

*

٣ ڕۆژ دوای تاقیکردنەوەکان هەواڵێکی ناخۆشم پێگەیشت، کە عەلی حەمە ڕەحیم پێی وتم فازیلی سەید عەلی خوێندکاری خوێندنگەکەمان شەهید کراوە، بەو هەواڵە زۆر بێزار بووم، بەڕاستی هەواڵێکی دڵتەزێن بوو.

فازیل لەگەڵ هاوڕێیەکی تریدا دەڕۆن بۆ لای خانەقا، تەقە لە ٣ قوات خاسە دەکەنو دەیانکوژن، چەند قوات خاسەیەکی تر دوایان دەکەونو ئەمانیش خۆیان دەکەن بە مزگەوتی خانەقادا، قوات خاسەکان تەقە لە فازیلی سەید عەلی دەکەنو شەهیدی دەکەن.

ڕۆژی ڕووداوەکە ١٦/ ٥/١٩٨٢ کە ئەم هەواڵەم بیست، قسەکانی فازیل وەکو کاسێتێک لە مێشکی خۆمدا لێمدەدایەوە، (دەبێ گورزێکی باش لە ڕژێمی بەعس بوەشێنم)، (بەرخی نێر بۆ سەربڕینە، گوناحە لەپێناوی کوردستاندا شەهید نەبیت).

فازیل گەنجێکی دڵگەرمی وریاو توندوتیژ بوو بەرانبەر بە ڕژێمی بەعس، سڵی لەهیچ نەدەکردەوە، (کەم ژیانو کەڵ ژیان) ی بۆ خۆی هەڵبژارد بوو، تەنها ئەوەندە ئەڵێم شەهادەکەی ئەو پلەی بەرزی شەهیدی بوو.



شەهید فازل سەید عەلی

## - ١٣ -

دوای تاقیکردنەوەکان لە پشووی هاوینەدا خۆم ئامادەکرد بۆ کاری ڕێکخستن.

پەیڕەوو هەیکەلی ڕێکخراوی سلێمانی بەمشێوەیە بوو:

- **ڕێکخراو.**
- **کەرت.**
- **پۆل.**
- **شانەی سەرەکی.**
- **شانەکان.**

ڕێکخراو لێپرسراوی یەکەم بوو، پاشان کەرتەکان، هەر کەرتێک ٢ بۆ ٤ پۆلی لەبەر دەستدا بوو.

هەموو کەرتێک ئیشوکاری جیا بوو، بەپێی پیشەی ئەندامەکان ناویان بۆ دادەنرا، بۆ نموونە کەرتی مامۆستایان، کەرتی خوێندکاران، کەرتی پیشەوەران، کەرتی فەرمانبەران ، کەرتی کرێکاران.

هەموو پۆلێکیش ناوی خۆی هەبوو، شانەی سەرەکیش ژمارەو پیتی خۆیان هەبوو ئەوانیش دابەش دەکران بەسەر شانەکانی خوارەوەدا کە هەموو ئەندامێک ناوی نهێنی خۆی هەبوو.

ئەگەر لێپرسراوی کەرتێک یان پۆلێک شەهید بکرایە، ئەو کەرتو پۆلەیان بە ناوی ئەو شەهیدەوە ناو دەنا کە لێپرسراوی بوو .

لێپرسراوی ڕێکخراو، ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە مەکتەبی ناوەندییەوە هەبوو، لێپرسراوی کەرتەکانیش کادری پێشکەوتووی ڕێکخراو بوون، لێپرسراوی پۆلەکانیش هەر کادر بوون.

ئەندام پۆلەکانیش پاڵێوراو بوون بۆ کادری، بەڵام کاری ئەمان زیاتر بوو، وەکو فێرکەر، شانەکانیش پێیان دەوتن حەلەقەی ڕۆشنبیریی.

* * *

ئەو وانانەی دەمانخوێند لە حەلەقەی ڕۆشنبیریی:

١- شیکردنەوەی چینایەتی لە کوردستاندا.

٢- شۆڕش لە کوردستاندا.

٣- قۆناغەکانی گۆڕانی کۆمەڵ.

٤- کۆمۆنەی پاریس.

٥- شەڕی پارتیزانیو چەند وانەیەکی تر...

ئەوەی شارەزای خوێندنەوە نەبوایە زۆر باش تێیان نەدەگەیشت، بەلایەوە گرانبوو، ئەگەر ئەو وانانەت بە سەرکەوتویی تەواو بکردایە پلەیەکی باشت دەبڕیو دەبوویتە پاڵێوراو، شانەت بۆ جیا دەکرایەوە بۆ ئەوەی تۆش کەسانیتر پەروەردە بکەیت، وانەکانی پاڵێوراویش ئەمانە بوون:

١- خەباتی گەلان.

٢- سەرکەوتنی جەنگی گەل.

٣- نووسینەکانی شەهید ئارام.

٤- ئافرەت و ژانی لەدایک بوونێکی نوێ.

٥- دەربارەی کادر.

٦- ماترلیالیزمی دیالەکتیکو چەند وانەیەکی تر...

ئەم وانانە ماوەیەکی زۆریان دەویست تا فێر دەبویتو خۆت پەروەردە دەکرد، لەوکاتەدا بۆت هەبوو کەسانی باش هەڵبژێریتو پەیوەندی ڕێکخستنیان بۆ دروست بکەیت، پاش ماوەیەکی زۆر، ئنجا لەسەر پشتگیری دوو ئەندامی ترو بڕیاری ڕێکخراو دەبویتە ئەندامی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان، ئنجا دەکەوتیتە خوێندنەوەی کتێبی گرنگو نوسینی بەسود بۆ ڕێکخراو، ئەگەر

نوسینەکەت سودی هەبوایە ڕێکخراو چاپی دەکردو بەسەر شانەکاندا دابەشی دەکردو دەبوویتە باوەڕپێکراو (معتمد)، زۆرجار کاری گرنگیان پێدەسپاردی و دەیانناردی بۆ مەڵبەندەکان یان بۆ سەرکردایەتی و بۆ ڕاوێژکردن لەگەڵ ئەندامانی ناوەندی.

* * *

لە پشووی هاوینەدا کاتی باشمان بە دەستەوە بوو بۆ کاری ڕێکخستن، جەزا لە پێشدا وانەی شیکردنەوەی چینایەتی بۆ هێنام وتی: دەبێت ٦ جار بینوسیتەوە، منیش تا دەمنوسینەوە نیوەی فێر دەبووم، پاشان بە ٢ - ٣ جار دەمانخوێند، دەبوایە وەکو خۆی بمانوتایەتەوە، ئەگەر نەمانزانیایە بۆ وانەی داهاتوو دەمانوتەوە تا تەواو فێر دەبووین، ئنجا ڕاپۆرتی ڕۆشنبیریی بنووسین.

### *شیکردنەوەی چینایەتی

چینەکانی کۆمەڵی پێدەناسانیت چینی بۆرجوازو چینی پرۆلیتاریا، چینی بۆرجوازی بچووک چەند لقێکی هەبوو کە هەموویان سەرمایەداری بوون، بەڵام چینی پرۆلیتاریا تەنها بریتی بوون لە چینی هەرە ژێرەوەی کۆمەڵ واتە چینی کرێکارو ڕەنجدەران، کە ئەمانە زیاتر شۆڕشیان پێدەکرێتو جێی باوەڕی گەلن.

### *شۆڕش لە کوردستاندا

باسی شۆڕشەکانی کوردو تاقیکردنەوەکانی پێشوو بۆ سەرنەکەوتن و هۆکارەکانیو چارەسەرەکانی شۆڕشی نوێو درێژەدان بە شۆڕشی پرۆلیتاریا.

### *قۆناغەکانی گۆڕانی کۆمەڵ

ئەم وانەیە کتێبێکە لە نوسینی چەند زانایەکی سۆڤیەتی، مامۆستا جەلال دەباغ کردوویەتی بە کوردی، ٢٠ جار ئەم وانەیەم نوسییەوە، باسی دروستبوونی

مرۆڤ لە سەرەتاوە تا دەگات بە سۆشیالیزم بەپێی قۆناغەکان، ئەم نامیلکەیە کتێبێکی زۆر بە نرخە.

نووسینەوەی ئەو وانانە هەر بە دەم ئاسانە، بڕوا بکەن پەنجەی سێیەمی دەستم چاڵ ببوو هی نووسینەوەی قەڵەم جاف، بە هەفتە نەدەهاتمە دەرەوە، هەر خەریکی نووسینەوە بووم ئنجا خوێندنەوەیی‌و لەبەرکردنی، دەبوایە وەکو شیعر بمانووتایەتەوە.

هەتا ئەو ٣ وانەیەمان خوێند ٣ مانگ زیاتری خایاند، بەڵام سودێکی زۆر باشی هەبوو بۆ ڕۆشنبیریی.

جەزا بە دیسپلین بوو لە مەوعیدەکانیا، وە لە کاتی دیاریکراودا بڵاوکراوەی دەهێنا، زۆربەی دانیشتنەکانمان لە گەراجەکەی خۆیاندا بوو، کە دەکەوتە پشتی کۆڵانەکەی سلێمانی پالاسەوە، گەراجەکەیان چۆڵبوو، تەنها بۆ دەستبەسەراگرتنی سەیارەی گیراوی مخالفـو ئەوانەی مرور دانرابوو، ئێمەش دەڕۆشتینە ژوورەوە بۆ کۆبوونەوە، زۆرجار کۆبوونەوەکانمان ٢ کاتژمێری دەخایاند، لە ماوەی ٣ مانگی پشووی هاوینەدا بەسەرکەوتویی ئەو ٣ وانەیەمان تەواو کرد.

ڕۆژێک ڕۆیشتم بۆ گەراجەکەیان، سەیرمکرد کاک عەتاو جەزا لەوێ سنوقی پلاسکۆی ترێیان هێناوە پڕیان کردووە لە کتێب سەری سندووقەکانیان بەپەڕۆو گوێنی دەگرت، منیش وتم ئەمانە چی لێدەکەن؟ وتیان دەینێرین بۆ کاک هەڵۆ لە دۆڵپەموو، پاشان کارەکانیان تەواوکردو سەیارەیەک هات، قسەیان لەگەڵ کرد کە چۆن بیانگەیەنێت، دوای ئەوە کەسێک هات کەوتنە چپە چپ، کاک عەتا دەنگی هەڵبڕیو وتی: بەو شتانە بڕوا ناکەین، باوکی ئێمە پێویستی بە واستە نیە ئەگەر تۆ ڕاستدەکەیت مستیلەکەی پەنجەیمان بۆ بهێنە ئنجا بڕوا دەکەین، ئەو کەسە ڕۆیشت و کاک عەتا هەر قسەی دەکرد لەبەرخۆیەوە، ئێمە باوکی خۆمان دەناسین گوێ نادات بە هیچ شتێک، بڕوا ناکەین باوکم کەسێکی جاسووس ڕاسپێرێ، ئەگەر لە بەندیخانەدا بشمرێ، ئەوکاتە ئێمە شانازی پێوە دەکەین، منیش پرسیارم لێکرد چی دەوێت؟

وتی: وا دەزانن ئێمە ئەوەندە هیچ نەزانین، دوعاو سەلامی باوکمی هێناوە، ئێمە پێویستمان بەکەسی خۆفرۆش نیە یارمەتیمان بدات، باوکم گیراوە، گیراوە وەکو ئەو خەڵکە، هەڵوێستی کاک عەتا ئەوەندە جوان بوو ئەو کەسە هەر بە پێی خۆی ڕایکرد.



عەتای ئەحمەد کوردە

١٩٨٢/٧/١٢ جەزا ٢ نامەی دامێ، وتی: بیانبە بۆ تیپی مۆسیقای مەولەوی، شوێنەکەمان دەستنیشانکرد، وتی: سبەینێ ١٣ ی مانگ کات ٢ ی پاش نیوەڕۆ لێرە بووەستە کێ ڕۆیشتە ژوورەوە تۆش بڕۆ بەدوایدا، نامەکانی بدەرێو بەتوندی هەڕەشەی لێبکە کەنامەکان بگەیەنێ، چونکە ئەو نامانە هەڕەشەن بۆ کەسانی ئەو تیپە کە بەشدارن بۆ ئاهەنگی ١٧ ی تەمووز.

((شۆڕشی ١٧ - ٣٠ تەمووزی ١٩٦٨ هاتنە سەر حوکمی بەعسییەکان بوو لە عیراق))، بۆیە هەموو ساڵێک حزبی بەعس لە عێراق یادی دەکەنەوە، ئەو ساڵەش بەنیاز بوون لە سەرتاسەری عێراقدا، ئاهەنگ بگێڕێت، شاری سلێمانیش بێبەش نەبوو لەویادە، تیپی مۆسیقای سلێمانی و تیپی مۆسیقای مەولەوی لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە ڕاسپێردرابوون بۆ ئەو ئاهەنگە، لەبەرئەوە ڕێکخراوی سلێمانی بە توندی نامەی هەڕەشەی بۆ ناردن.

منیش بۆ ڕۆژی دوایی سەعات ٢ ی پاشنیوەڕۆ ڕۆیشتم بۆ بەردەمی تیپی مەولەوی و بەرانبەری دەرگاکەی وەستام، کەسێک هاتو خۆی کرد بە ژووردا، بە دوایا ڕۆیشتمە ژوورەوە، ٤ کەسی تری لێبوو، یەکێکیان شەماڵ محەمەدی هونەرمەند بوو، دوای سڵاو، وتم: کاک دارا محەمەد عەلیم دەوێت، وتیان بۆ چیتە؟ وتم: زۆر زەروورم پێی.

وتیان: ئەم ٢ - ٣ ڕۆژە سەری قاڵە خەریکی سازکردنی ئاهەنگە بۆ ١٧ ی تەمووز ٢ نامەکەم دانێو وتم: ئەم نامەیەیان بۆ تیپەکەو ئەم نامەیەش بۆ کاک دارا، پێی بڵێن ١٧ ی مانگ ئامادە بێت بۆ ئاهەنگەکەی ماڵی ئێمە، وتیان: کاکە ئێمە ١٧ ی مانگ ئاهەنگمان بە دەستەوەیە.

- گوێ بگرن ئاهەنگی ئێمە گرنگترە لە ئاهەنگی سەدام تێکەیشتن، ئەگەر پێڕەوی ئەو نامانە نەکەن خۆتان بەرپرسیارن.

هەموو دەمو چاویان گۆڕاو کەس قسەی نەکرد، هاتمە دەرەوەو خۆمکرد بە

کۆڵانەکانی پشتەوەدا، ئەوانیش نامەکانیان برد بۆ پیاوانی ڕژێم، هەرچەندە ڕژێم زۆری لێکردبوون، بەڵام نامەکەی ڕێکخراو دەورێکی باشی هەبوو بۆ شکستپێهێنانی ئەو ئاهەنگە.

* * *

کۆتایی مانگی ۷ ڕۆیشتم بۆ لای جەزا، لە گەراجەکەیان نەبوو، وتیان: کاک ئەحمەدی باوکیان لە زیندان ئازاد کراوە، منیش لە وێوە تەلەفۆنم کرد بۆماڵیان، وتی: باوکم ئازاد کراوەو ماڵمان زۆر قەرەباڵغە، منیش هەر لە وێوە ڕۆیشتم بۆ ماڵیان کاتێ سەیر دەکەم ماڵیان جمەی دێ، زۆربەی پیاوانی عەشایەری ناوچەکان هاتبوون، کاک ئەحمەد هەر بەپێوە وەستا بوو، بەخێر هاتنی خەڵکی دەکرد کوڕەکانیشی هەموویان خزمەتیان دەکرد، منیش بەخێر هاتنەوەم کردو خۆشحاڵی خۆم دەربڕی.

یەکەم جار بوو کاک ئەحمەد ببینم، جەزا پێیناساندم بەڕاستی زۆر لە خۆی بووەوە.

ئەو ماوەیە من هەر لە ماڵی کاکم بووم لەوێش دەخەوتم ئیشو کارم زیاتر لە ماڵی ئەوان بوو .

ڕۆژێک بۆ ئێوارەکەی ڕۆیشتمەوە برازنم بانگی کردم، وتی: با منداڵەکان نەزانن، وێنەیەکی دامێ سەیرمکرد وێنەی شەهیدان (بەختیارو هوشیارو ڕەئووف)، وتم: ئەمە چییە؟ وتی: لە دەرگای ماڵەوە درا کوڕێک ئەمەی دامێ، بە ئسلوبێکی ناشیرین وتی: دەبێت ٢٥ دینار یارمەتی شۆڕش بدەن تاکو دێینەوە ئامادە بێت، یەک غەڵەتیش بکەن خۆمان دەزانین چیتان لێدەکەین، برازنم وتی: سەیرمکرد سەری کۆڵانەکەمان ٢ کەسی تری لێوەستاوە، برازنم لەویادا پێی وتبوو ناوت چییەو لە کوێوە هاتوی؟ ئەوەندە نەزان بوو وتبووی: ناوی نهێنیم هەڵگوردەو لە گەڕەکی مەجید بەگەوە هاتووم.

برازنم وتی: کە ڕۆیشتن ٢ - ٣ دراوسێمان هاتنە دەرەوە وتیان: بە ئێمەیان وتووە کەس لەمناوە نەوەستێت بڕۆنە ژورەوەو سەری کۆڵانەکەیان گرت، هاتن لە دەرگای ماڵی ئێوەیاندا، وامانزانی پیاوی حکومەتن، برازنم وتی:

- منیش وتوومە هەواڵی شێخ حسێنیان پرسی بۆ ئیشی بیناسازی.

منیش جەزام ئاگادار کردو ٢ ڕۆژ چاوەڕێمکردن هەر نەهاتنەوە .

ئنجا ٢٥ دیناری یارمەتیەکەی کاکم نارد بۆ ڕێکخراو و ڕاپۆرتێکم لەسەریان نووسی، ئیتر ئەوان هەر نەهاتنەوە، پاشان وەڵامم درایەوە کە ئەو کەسانە لەڕێکخراو دەرکراون داوای لێبووردنیشیان لە ماڵی کاکم کرد، هەتا ئێستاش ئەو وێنەیەم هەرماوە لەبەر پیرۆزی شەهیدەکان دەیخەمەڕوو.

له كۆبوونەوەیەكدا لەگەڵ جەزا باسی ئیشكردنی هاوڕێیانمان كرد بۆ ناو ڕێكخراو، وتم: عەلی ئامادەیە بێتە ناو ڕێكخراو ئیشبكات، هەردووكمان پەسەندمان كرد، بە عەلیم ووت: ڕاپۆرتێك بنووسە، وتی: من باش شارەزاییم نیە، دەبێت یارمەتیم بدەیت.

هەردووكمان ڕاپۆرتێكمان نووسیو ناردمان بۆ ڕێكخراو، پاشماوەیەك وەڵامەكەی هاتەوە عەلیش پەیوەندیكرد، بەڵام لای ئێمە نەبوو، پەیوەندی بە شانەیەكی ترەوە كرد، ئەویش كەوتە خوێندنی وانەكانی ڕۆشنبیری، منیش یارمەتیم دەداو خۆشی دراسەی دەكردن، باش خۆی بەڕێوەدەبرد، زۆر جار پرسیاری ڕێكخەرەكەیم لێدەكرد دەیوت كوڕێكی زۆر باشە.

ڕێكخەرەكەشی نزار مستەفا ئەفەندی، كادرێكی پێشكەوتووی ڕێكخراوی سلێمانی بوو، دوایی پەیوەندی كرد بەلیژنەی پێشمەرگەی ناوشارەوە، پاشان بەخیانەتی خۆفرۆشێك دەستنیشان كراو شەهیدیان كرد.

دوایی دێمەوە سەر باسی شەهید نزار.

## دەستپێکردنەوەی خوێندنی

## ساڵی ١٩٨٢ – ١٩٨٣ پۆلی دووەمی کشتووکاڵی

- ١٧ -

٩/١٥ خوێندن دەستپێکردەوە، خویندکارەکان هەموو بە یەک شاد بووینەوە، بەڵام کۆمەڵێک خوێندکاری باشو بە وەفا کە لە پۆلی سێیەم بوون، خوێندنیان تەواوکردو بەجێیان هێشتین هەرگیز ئەو هاوڕێیانەمان لەبیر نەدەچوونەوە، ئەوەش بڵێم خوێندکاران کەریم شەفیق و حەمەئەمین سوارەش خوێندنیان تەواو کردوو جێیان هێشتین.

ئنجا کۆمەڵێک خوێندکاری کوڕو کچی تر هاتن، ساڵی نوێمان دەستپێکرد واتە پۆلی دووەمی ئامادەیی.

مامۆستا کیومەرس نیک ڕەفتار کە ساڵی پێشوو باسمکرد مامۆستای کوردی بوو گواسترایەوە بۆ ئامادەیی بازرگانی سلێمانی، ٢ مامۆستای ترمان بۆ هات یەکێکیان مامۆستا شێرزاد حەسەنی چیرۆکنووس، کە وانەی ئینگلیزی پێدەوتین، مامۆستایەکی ئەوەندە زیرەک بوو، کە دەهاتە پۆلەکەمان بۆ وانە وتنەوە حەزمان نەدەکرد وانەکە تەواو بێت، هەمیشە لایەنگری چینی چەوساوە بوو، کە قسەی بۆ دەکردین دەتووت چیرۆک دەگێڕێتەوە دوایی مامۆستا شێرزاد کتێبێکی لە چیرۆکەکانی خۆی چاپکرد بەناوی تەنیایی، چیرۆکنووسێکی زۆر سەرکەوتوو دەرچوو، ئێستاش هاوڕێیەتیم لەگەڵ مامۆستا شێرزاد هەیەو زۆر ڕێزی دەگرم.

دووەمیشیان مامۆستا هیمەت کەریم فەتاح، کە دەرچووی چەند ساڵی لەوەپێشی خوێندنگەی خۆمان بوو، بەڵام بە حوکمی حیزبایەتی و برایەکیشی بەناوی عەقید حەمەڕەئوف لەجەنگی ئێران - عێراق کوژرا بەو هۆیەوە کرایەوە بە مامۆستای خوێندنگەی خۆمان، ناردبوویان بەمەرجێک جموجوڵی سیاسی

هەبێت و ئیتحاد دروستبکاتەوە لەناو خوێندنگەدا.

*

مانگی ١١ نامەیەکی ڕێکخراووم بۆ هات کە پلەم بەرز کرایەوە بۆ پاڵێوراو، لە نامەکەدا ئاگادار کرام کەخۆم ئامادە بکەم بۆ کاری باشتر کە جێگەی باوەڕی ڕێکخراو بم.

ئەویش جەزا ڕاپۆرتی خۆی لەسەر من بەرز کردبووەوە کە ئیلتیزامی باشم هەیە، بۆیە هەر لەو ڕاپۆرتەدا نوسرابوو ئێستا توانای ئەوەت هەیە شانەت بۆ جیا بکرێتەوە، چاوەڕوانی کاری باشترت لێدەکەین بەهیوای سەرکەوتن.

لە دوای ئەوە هاتینە سەر کۆمەڵێک وانـەی تر کە بیخوێنین، بەڵام لە نووسینەوەی ڕاپۆرتی وانەکان ڕزگارم بوو، پلەیەک هاتمە پێشەوە، بڕیاردرا تەنها ڕاپۆرتی ڕۆشنبیریی بنووسم.

*

ڕۆژێک لە خوێندنگە جەزا پێی وتم: ئەمڕۆ بتبینم، دوای نیوەڕۆ ڕۆیشتم بۆ لای لە گەراجەکەیان دەستمانکرد بە کۆبوونەوە، پاشان وتی: ناوی نهێنی ڕێکخراو هەمووی گۆڕاوە، ناوی تۆش بۆتە (نەریمان)، چونکە لە وەوپێش ناوم (ئاراس) بوو، وتی:

– دەبێت ئەمڕۆ هاوڕێیەک بناسیتو شانە بەڕێوە ببەی، لەمەودوا بوویتە سەرەک شانە، سەعات ٤ ی ئێوارە بڕۆ بۆ لای خانەی مامۆستایان، لە جێگای وەستانی پاسەکەدا هاوڕێیەک لەوێ دەوەستێت، دەیبینیت و خۆتی پێبناسێنە، چۆنیەتی ئیشوکاری ڕێکخستنو نهێنی پاراستنو وانەکانی بۆ ڕوون بکەرەوە، منیش سەعات ٤ ڕۆیشتمە شوێنەکەو ٢ جار هاتوچۆم کرد، پاشان کوڕێک هات وەستا، کورتە باڵایەکی سوور بوو، ئنجا ڕۆیشتم بۆ لای وتم: ماڵی کاک ئەحمەد لەمناوە دەزانی؟، وتی: بەڵێ، فەرموو بابڕۆین.

(ئەمە ناونیشانەکەمان بوو، پاشان خۆمان بەیەکتر ناساند).

من بەناوی نەریمانەوەو ئەویش بە ناوی بەهێزەوە، ئیتر پێویستی نەدەکرد ناوی ڕاستی خۆمان بڵێین، یاخود تا ماوەیەک ناونیشانی ماڵی یەکترمان نەدەووت، تا بەباشی شارەزای یەکتر دەبووین، پاشان لەگەڵ هاوڕێ بەهێز پەیوەندییەکانمان توند بوو، چی وانەیەک خۆم خوێندبووم بەویشم دەووت.

ماوەی ٢ مانگ بەیەکەوە بووین پێی وتم: کەسی باش دەناسم ئەگەر ئێوە وەریان دەگرن، وتم: ڕاپۆرتێک بنووسەو منیش بەرزی دەکەمەوە، ڕاپۆرتی نوسی ناوی ٤ کەسی تێدا بوو، پاشان قسەمان لەسەرکردن، هاوڕێ بەهێز زۆر سوور بوو لەسەریان کە کەسی باشو خۆڕاگرن. (دوایش هەروا دەرچوون).

ناوی ئەو هاوڕێیانە ئەمانە بوون کە هەمویانم کرد بە شانەیەک، لەلای خۆم ڕێکمخستن.

١- ڕزگاری حاجی ئەمین (هاوڕێ بەهێز) لە سویدە.

٢- ئازادەڕەش پورزای ڕزگار، لە ئەمریکایە.

٣- محەمەدی شێخ فاتح (حەمە بی، کەی، سی) شەهید.

٤- ڕزگاری شێخ بەکر ماوەتی (سلێمانی).

٥- عوسمانی شەهید عومەر میرزا (سلێمانی)، کوڕی شەهید عومەر میرزا لە بەندینخانەی موسڵ لەسێدارە درا، ئەندامی کۆمەڵە بوو.

ئەم هاوڕێیانە جگە لە ئازادەڕەش کە زانکۆی تەواو کردبوو، ئینگلیزی باش دەزانی، کەسیان خوێندنیان تەواو نەکردبوو، کەچی بۆ کاری ڕێکخستن زۆر باش بوون، باشترین ئیش ئەوکاتە محەمەدی شێخ فاتح دەیکرد کە پەیوەندی هەبوو بە ٢ کچەوە لە نەخۆشخانەی جامیعەکە کاریان دەکرد بە پیشەی پەرستار، ئەو کچانە ناوی نهێنیان (بێستان و کوێستان) بوو، بە کارتۆن دەرمانو حەب و سرنجو پێویستی نەشتەرگەرییو هەموو جۆرە دەرمانێکی پزیشکییان لە نەخۆشخانەوە دەگەیاندە محەمەد، ئەویش منی ئاگادار دەکرد.

محەمەد خۆی لە پاقلاوەخانەکەی حاجی عەباسی ماستاو بەرانبەر سەرای سلێمانی کاری دەکرد، کارتۆنی پاقلاوەی گەورە کە ٨ تا ١٠ کیلۆ پاقلاوەی دەگرت، لەگەڵ ڕزگار دەیانهێنا بۆ ماڵی ئێمە، ئنجا چوار دەوری پاکەتەکەمان دەکرد بە لۆکە بۆ ئەوەی نەشکێن. ئنجا بە تیپ دەمانپێچا، بە کاغەزی ڕەنگاو ڕەنگ دەمان ڕازاندەوە وەکو پاکەتە پاقلاوە ئامادەمان دەکردن، منیش جەزام ئاگادار دەکرد ئەویش بەسەیارەکەی دەیبردن، هەر بەو جۆرەش ڕێکخراو بەناو بازگەکانی ڕژێمدا ڕەوانەیان دەکرد بۆ شاخ.

بەڕاستی ئەوەی محەمەدی شێخ فاتح دەیکرد کەم وێنە بوو، من خۆم ئەو ٢ کچەم نەدەناسی، بەڵام هەتاکو ئێستاش دەستخۆشییان لێدەکەم، چونکە خزمەتێکی گەورەیان دەکرد بەهێزی پێشمەرگە بێ ئەوەی ناوی خۆیان ئاشکرا بکەنو بناسرێن.

لە ڕێکخراوەوە نووسراوێک هات کە دەستبکەین بە کۆکردنەوەی پیتاک لە ناو شارداو ڕەوانەی دەرەوەی بکەین، بۆیە ئێمەش هەستاین بە کۆکردنەوەی بەتانیو جلو بەرگ بۆ پێشمەرگە، هەر لە ماڵی خۆمانەوە هەتاکو کەسوکار، لەماوەیەکی کەمدا، هەر کەس لە ئاستی خۆیەوە جلی پیاوانەی تازەی دەهێناو هەمووشی دەشۆرا، ئنجا دەماننااردن بۆ بنکەکانی پێشمەرگە.

٢ مانگ دەبوو خوێندنگە کرابووەوە، مامۆستا هیمەت کەریم فەتاح، دەیویست جوڵانەوەی (اتحاد الطلبة) درووستبکاتەوە.

بەیانیەکی پێنجشەممە هەموو خوێندکارەکان ڕیز کرابوون بۆ هەڵکردنی ئاڵای عێراق، (تحیة علم) چەند کەسێکی تر لەگەڵ مامۆستا هیمەت هاتبوون، لەو کاتەدا منو عەلی حەمە ڕەحیم بە ماتۆڕەوە خۆمانکرد بە ناو خوێندنگەدا، من ماتۆڕەکەم لێدەخووڕی، سەیرمانکرد ئەو بەزمە هەیە، خۆمانکرد بەناو خوێندکارەکاندا، ئەوانیش بە گاڵتە ڕیزەکانیان تێکدەداو ڕایاندەکرد، بوو بە پێکەنینو گاڵتە، منیش بەناو گۆڕەپانەکەدا پێچمکردەوەو لەولاوە ماتۆڕەکەم وەستان، ئنجا لەگەڵ عەلی لەوسەری ڕیزی خوێندکارەکانەوە وەستاین، مامۆستا هیمەت هەر سەیری دەکردینو خێسەی دەکرد.

پاش کەمێک ئاڵا هەڵکراو ١٠ - ١٢ فیشەکیان بە کلاشینکۆف تەقاند، خوێندکارەکان کردیان بە هاوار، هاوار، مەسەلەکە کەمێک ورووژاو خێرا کۆتاییان پێهێنا، ئیتر هەر ئەو جارە بوو دووبارەیان نەکردەوە.

دوای ٢ وانە مامۆستا هیمەت بانگی کردم، ڕۆیشتین بۆ باریکە ڕێگایەک لای شەتڵگەکانەوە، دوو بەدوو قسەمان کرد، وتی:

- حەمە ڕەئووف پێم ناڵێیت بۆ وا دەکەیت؟ ئەوەی تۆ دەیکەیت دوا ڕۆژت باش نابێت؟

- بۆ ئێستا حاڵمان زۆر باشە تا دوا ڕۆژمان باش بێت؟ مامۆستا پێم بڵێ بە نیازی چیت؟

بۆ ڕێم لێدەگریت!

-ئەوەی تۆ بە نیازیت بیکەیت دەمێکە لای ئێمە کۆتایی پێهاتووە.

- وەکو چی؟ پێم بڵێ؟

- وەکو ئەوەی بۆ دروستکردنەوەی ئیتحادو جوڵانەوەی خوێندکاران هاتوویت.

- ئەوە چی پەیوەندی بە تۆوە هەیە؟!

- چۆن نیەتی!

(کەمێک هەڵگڕاین بەڕووی یەکدا).

- گوێ بگرە حەمە ڕەئووف، با یەک شتت پێبڵێم وەڵڵاهی من نەبوومایە، بەس خۆم دەمزانی چی ڕووی دەدا!

- چی ڕووی دەدا؟ ئەوپەڕەکەی دەیانبردم، دەمێکە خۆم داناوە بۆ ئەو مەسەلەیە.

- بۆ گیانی خۆت لێ زیادە؟!

- مامۆستا با پێت بڵێم تۆ کوردو من کورد، بەعس بە کەڵکی تۆ نایەت، من و تۆ گۆشتی یەکتریش بخۆین ئێسقانمان ناشکێنین، ئێمە لە ساڵی پارەوە سەرمان سووکە خوێندکاران ئازادین بە ئارەزووی خۆمان هەڵسو کەوت دەکەین، چاودێرو ئەوانەمان نیە وە ناشمانەوێت دەستی بەعس لەناو خوێندکاراندا هەبێت، خوێندکارانیش بەگشتی پێیان قبوڵ ناکرێت، جا لەبەرئەوە کێشەمان بۆ دروست مەکە، چونکە ئێمە زۆر باش دەزانین تۆ بۆ ئەو مەبەستە هاتوویت، دڵنیاش بە هەتا ئێمە لەم خوێندنگەیەدا بین ناهێڵین ئیتحادی تیا بێت.

مامۆستا سەیری دەووروبەرمان بکە خوێندکارەکان سەیرمان دەکەن با ئەمڕۆ بەس بێت جارێکی تر یەکتر دەبینینەوەو قسە دەکەینەوە، ئەگەر ئێمە لەسەر حەق نەبووین، ئەو حەقە بۆ تۆ، با یەکتر بناسین ئنجا بیروڕای ئێمەت بۆ دەردەکەوێت.

دوای چەند ڕۆژێک لە خوێندنگە مامۆستا هیمەت بەرەوڕووم هات، پاش هەواڵپرسینی گەرم، دەستمانکرد بە قسەکردن، دەمو گفتی زۆر باش بوو. وتی:

- نەمزانی تۆ کەسێکی ئاوای، مامۆستاکان باسیان کردویت، هەمویان قسەیان لەسەرت باشە.

- وتی: منیش دەنگم لەگەڵ دەنگی ئێوەیە، چۆنیش ئەڵێن هاوکاریتان دەکەم.

لەدوای ئەوە مامۆستا هیمەت زۆر گۆڕاو گلەییمان لێی نەبوو.

حەمە ئەمین سوارە ساڵی پێشوو خوێندنی تەواو کرد، ڕۆیشتەوە بۆ چوار قوڕنە، شەوێک پێشمەرگەی حیزبی شیوعی دەڕۆنە سەری دەیگرنو لەگەڵ خۆیاندا دەیبەن بۆ شاخ، بۆ ماوەی ٦ مانگ دەیگرن و ٥٠٠ دیناریشی لێدەسەنن بۆ حیزب، ئنجا بەکەفالەت ئازادی دەکەن، من ئەو دەنگو باسەم بیستبوو لە خوێندکارەکانی خەڵکی چوار قوڕنە، پاشان حەمە ئەمین هاتەوە بۆ خوێندنگە سەر لە مامۆستاو خوێندکارەکانی هاوڕێی بدات.

من لە پۆلدا بووم، سەبیحەخان وانەی عەرەبی پێدەوتین هات لە دەرگای پۆلی داو سلاوی لەخوێندکارەکان کرد، کەوتە قسەکردن لەگەڵ سەبیحەخان، پاشان داوای منی کرد منیش ڕۆیشتم بۆلای، لە دەرەوە یەکترمان ماچکردو هەواڵی گەرمی یەکتر پرسین، وتم:

- ڕزگارت بوو لەدەست حیزبی شیوعی؟

- وتی: چۆن دەزانی؟ هەواڵی ئەوەشت هەیە لەسەر من؟

- ئەی چۆن نازانم ؟ !

- ئەی کە دەتزانی بۆچی نەهاتی قسەم لەسەر بکەی؟

(ئەو کاتە شەڕی ناوخۆ هەبوو، یەکێتی لەگەڵ حیزبە سیاسییەکان بەتایبەتی شیوعی بەینیان تەواو نەبوو).

- وتم: ئەی کوڕی باش، خۆت باش دەزانی یەکێتی و شیوعی شەڕیانە، منیشیان دەستبکەوم هەر وەکو تۆ دیلم دەکەن، من چۆن دەتوانم بەرگریت لێبکەم ئەگەر لای یەکێتی بویتایە، ئەوە حەقی خۆت بوو قسەت بکردایە.

- وتی: گاڵتەت لەگەڵ دەکەم دەزانم وەزعەکە چۆنە، ئەگەر لای یەکێتی بوومایە گلەییم لێدەکردیت، ئێستاش هەر هاتم سەردانی خوێندنگە بکەم.

وتم: حەمە ئەمین ئیتر بەسە واز بێنە با توشی شتی خراپتر نەبیت.

- بڕوا بکە ئیتر بە ژیانم باسی حیزبایەتی ناکەم.

(لەدوای ئەوە من حەمە ئەمینم نەبینیەوە، بەڵام هەواڵی یەکترمان دەزانی لەم دواییەدا کەریم شەفیقم بینی وتی: حەمەئەمین لە شەڕی ناوخۆدا کوژرا).

بەڕاستی زۆرم پێناخۆشبوو ئەوکاتە ناوی کەوتبووە ناو ناوان، بەهۆی ئەو بەعسیەتییەوە کەس لە ناو خوێندنگەدا خۆشی نەدەویست، بەڵام ئەگەر یەکێک لێی نزیک بوایەتەوە زۆر کوڕێکی باشو بە وەفا بوو، حەمە ئەمین دەیتوانی ئەو بەیانیە هەموو شتێک لەگەڵ من بکات، بەڵام هیچی نەکرد، دەیوت: من خیانەت لە کەس ناکەم.

کەریم شەفیق باسی ئەوەم بۆ کرد کە بە نیازم بیرەوەرییەکانی ژیانی خوێندنگە بنووسمەوە، کۆمەڵێک وێنەی خۆی بۆ هێنام، وتی: گرنگ ئەوەیە من هیچ خراپەیەکم نەبوو، ئیستاش کاک کەریم دەبینمو ڕێزی یەکتر دەگرین و کوڕێکی زۆر باشە.

## - ٤٠ -

کۆتایی مانگی ١٢ ی ١٩٨٢ جەزا پێی وتم پەیوەندی بکەم بە ٢ هاوڕێی ترەوە.

ماڵی یەکێکیانی پیشاندام لە تەنیشت تیپی مۆسیقای مەولەوییەوە بوو، وتی: خۆی لە ماڵەوەیە چونکە پێی ڕاگەیەندراوە، منیش لە دەرگای ماڵیانم دا، کوڕێکی گەنج لێی کردمەوە خۆم پێناساند، ئەویش خۆی ناساند، ناوی نهێنی (هاوڕێ سەرتیپ) بوو.

وتم: ئێوە ٢ هاوڕێن دەمەوێ ئەوی تریش بناسم، بەیەکەوە ڕۆیشتین بەرەو کۆڵانەکانی پشتی مزگەوتی گەورە، دای لە دەرگای ماڵێک کە خانوویەکی نزمی گڵ بوو، برادەرێک هاتە دەرەوە خۆی ناساند بەهاوڕێ سەلام، ئەو ڕۆژە هەوا ئەوەندە سارد بوو کەس خۆی نەدەگرت لە دەرەوە بۆیە ڕۆیشتینە ماڵەوە، ژوورێکی هەبوو تایبەت بە خۆی، ژوورەکە هەرچەند بچووک بوو، بەڵام زۆر گەرمو خۆشبوو، فەرشی تیا داخرا بوو، دوو دۆشەک بەرانبەر بەیەک کتێبخانەیەکی بچووک، حەزم نەدەکرد هەستم لەلایان، ئێوارە هاتو من و هاوڕێ سەرتیپ ڕۆیشتین، مەوعیدمان دانا بۆ کۆبوونەوەی داهاتوو.

٢ - ٣ کۆبوونەوەمان کرد، ئەمان ئاستیان زۆر باش بوو خۆیان خوێندکاری ئامادەیی بوون، خەتیان خۆشبوو، خوێندنەوەی دەرەوەشیان هەبوو، کۆبوونەوە لەگەڵیان ئاسان بوو لە کارەکانی ڕێکخراو شارەزا بوون، پێویستی نەدەکرد لە سفرەوە دەستپێبکەین چونکە لە شانەکانی ترەوە گواسترابوونەوە بۆ لای من، هێشتا ناوی ڕاستی خۆمان ئاشکرا نەکردبوو، ڕۆژێک جەزا بڵاوکراوەی بۆ هێنام کە دابەشی بکەم بەسەر هاوڕێیاندا کە بۆ شەوەکەی بڵاوی بکەینەوە، منیش هەر ئەو سەعاتە بردم بیانگەیەنم ، ڕۆیشتم بۆ ماڵی هاوڕێ سەلام لە دەرگای ماڵەکەیانم دا کوڕێکی منداڵ هاتە دەرەوە، منیش ناوی ڕاستی هاوڕێ سەلامم نەدەزانی بە کوڕەکەم ووت: کەستان لە ماڵە؟

-بەڵێ؟

- دە باشە ئەو کوڕەی لەو ژوورە دادەنیشێت، بۆم بانگ بکە.

- تۆ کێت دەوێت ؟

- ئەو برادەرەم دەوێت ناوەکەیم بیر چۆتەوە.

- بۆ چیتە؟

کەمێک ئیشم پێیەتی، لە خوێندنگە بەیەکەوەین.

- بڵێم کێ هاتووە.

- نەریمان، ئەوەندەی پرسیار کرد بێزاری کردم.

منداڵەکە ڕۆیشتە ژوورەوەو هاوڕێ سەلام هات بۆ لام (کردمان بەپێکەنین وتم: ناوتم نەدەزانی بانگت بکەم نەشمدەزانی چی بڵێم، پاشان بەیانەکانم دایە لەوێوە ڕۆیشتم بۆ ماڵی هاوڕێ سەرتیپ، باشبوو ئەو لە ماڵ بوو بڵاوکراوەکان دایە، مەسەلەکەی ماڵی هاوڕێ سەلامم بۆ گێڕایەوە دەستیکرد بە پێکەنین (هەتا ئێستاش لەناو خۆماندا دەیگێڕینەوە).

دوایی یەکترمان ناسی و سەرتیپ ناوی ئەحمەد بوو، ئێستا بەڕێوەبەری خوێندنگەی پیرەمێردە، سەلامیش ناوی عومەر قادرو برای شەهید دکتۆر عەلی‌یە، هەتا ئێستاش هەر هاوڕێین.



مامۆستا ئەحمەد (سەرتیپ)    عومەر قادر (سەلام)    ڕەئووف شێخ جەمیل

*

کۆبوونەوەکان فراوان ببوون، هەفتەی جارێک کۆبوونەوە لەگەڵ جەزا، وە کۆبوونەوە لەگەڵ بەهێزو هاورێ ئازاد، پاشان لەگەڵ سەرتیپو سەلام، واتە هەفتەی ٣ کۆبوونەوەم دەکرد، تەعمیمێک دابەزی لە رێکخراوەوە بۆ کاری دیسپلین لەناو شانەکاندا، نوسرابوو لەبەرئەوەی ئێمە لەبەردەستی رژێمدا خەبات دەکەین دەبێت زۆر ئاگاداری خۆمان بین و پەیرەوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکەین.

١- کۆبوونەوەی شانەکان لە کاتی دیاریکراودا بێت .

٢- هەر کەسێک بگیرێت بەبێ هۆ، واتە بەبێ کاری رێکخراوەیی، ئەوە ماڵ نیە لەسەر رێکخراو.

٣- لە کاتی بڵاوکراوەو دیوار نوسیندا لە (سەعاتی سفر) دا نەبێت واتە لەسەر ئەمری رێکخراو، بە کاری بەرەڵڵایی دادەنرێت.

جەزا بە سەیارە بڵاوکراوەکانی دەهێنا بۆ ماڵی ئێمە، دەیدایە دەست دایکم، لەسەر کاغەزێک دەینوسی چی لێبکەم، دایکیشم دەیخستە ژێر کۆمەڵێک پیازی ناو قوڵێنەیەکەوە، ئەگەر من لەماڵ نەبوومایە، یا خود خۆی لەماڵ نەبوایە بەتایبەتی لای عەسرو ئێواران، کە دەهاتمەوە بۆ ماڵەوە ناو قوڵینە پیازەکە دەگەرام، حەتمەن شتی تیادا بوو نووسینی سەر کاغەزەکەم دەخوێندەوەو بەپێی نوسینەکە کارم لەسەر دەکرد.

ساڵی ١٩٨٣ ماتۆرەکەم نەمابوو، کەمێک کارم گران ببوو بە پێ، یان بە پاص، یان بەتەکسی دەرۆیشتم، هەموو ژیانم تەرخان کردبوو بۆ کاری رێکخراوەیی.

*

ژیانی رۆژانەی ناو خوێندنگە بەرەو پێشکەوتن دەرۆیشت، باوەرێکی تەواو لە ناو خوێندکارو مامۆستاکاندا هەبوو، وەکو هاورێمان لێهاتبوو بەتایبەتی مامۆستا ئەنوەر سادق و مامۆستا سەباحو مامۆستا هیمەت.

خوێندکاران بە ئاشکرا قسەیان دەکرد، چونکە دەستی خیانەتو جاسوسیو ئیتحادی تیا نەبوو تا چاودێریمان بکەن، کەس نەدەترسا، بەڕێوەبەریش هەڵوێستی بەرانبەرمان زۆر باش بوو، با ئەوەش بڵێم حکومەت ئەو ١٥ سەربازە پاسەوانانەشی گەڕاندەوەو لەناوخوێندنگەکەماندا نەمان، لەملاشەوە مامۆستا سەبیحەخان زۆر بەسود بوو بۆمان ئەگەر قسەی جۆرێک ببوایە لەناو ژووری مامۆستاکان، یا شتیکی ببیستایە ئاگاداری دەکردین.

* * *

ساڵی ١٩٨٣ کاک قادری حاجی عەلی هاوسەری مامۆستا سەبیحەخان بە مۆڵەتی سەرکردایەتی، دەهات بۆ گوندی وێڵەدەر هەتا چاوی بە سەبیحەخانی هاوسەری و لاوکی کوڕی بکەوێت، چونکە خۆی خەڵکی ئەو گوندە بوو، سەبیحەخانیش بە ئێمەی دەووت کە بیبەین بۆ لای کاک قادر، حەمە عەلیش کە خەڵکی گوندی وێڵەدەر بوو، ئەوکاتە ماتۆڕەکەی گۆڕیبوو بە تەکسییەکی لادا، سەبیحەخانی دەبرد بۆ وێڵەدەرو قسەمان بۆ دەکرد، ئەگەر پیاوانی ڕژێم هاتنە سەر ڕێگایان بڵێ مامۆستای گوندەکەم، سەبیحەخان خۆی خەڵکی بەغداد یان بڵێین لەوێ ژیبا بوو، زانکۆشی تەواوکردبوو، زمانی عەرەبی باش دەزانی لەبەرئەوە خەمی نەبوو.

سەبیحەخان ئافرەتێکی زۆر بە ڕێز بوو، زۆر یارمەتی خوێندکاری دەدا بە کچو کوڕەوە، وە ئێمەش زۆر ڕێزمان لێدەگرت زیاتر بەهۆی ئەوەی هاوسەری کاک قادرو وە براژنی حەمە جەزای هونەرمەند بوو، ئەوکاتە کەسوکاری پێشمەرگە زۆر ڕێزیان لێدەگیرا، بەتایبەت لای ڕێکخستن .

* * *

مانگی ٢ جەزا پێی وتم کە من لای ئەو گواستراومەتەوە، دەبێت پەیوەندی بکەم بە هاوڕێیەکی ترەوە، منیش زۆرم پێناخۆش بوو، چونکە منو جەزا ئیشەکانمان زۆر بەرێکوپێکی دەڕۆیشت، نزیک بووین لەیەکەوە چ لە خوێندنگەو چ لە دەرەوەی خوێندنگە.

پەیوەندیم بە هاوڕێی تازەوە کردماڵیان لە بەکرەجۆ ناوی خدر بوو، کرێکاری کارگەی شەکر بوو ، زۆریش سەری قاڵ نەبوو لە مەسەلەی ڕێکخستندا، ماوەی مانگێک بەیەکەوە بووین زۆر بێزار بووم هیچ سودێکم نەدەبینی لەو هاوڕێیە، چونکە دەبوایە من دوای نیوەڕوان بڕۆیشتمایە بۆ بەکرەجۆ بۆ کۆبوونەوە، خەڵکێکی زۆر لە گەنجەکان دەیانناسیم بەهۆی خوێندنگەوە، یان ئەو بهاتایە بۆ سلێمانی، کە بەیاناتمان بۆ دەهات دوای ٢ - ٣ ڕۆژ پێمدەگەیشت لە مەوعیدەکەی خۆی بەسەر دەچوو، ئەگەر بڵاویشمان بکردایەتەوە هیچ سوودی نەدەما، لەبەرئەوە بە هیچ شێوەیەک نەدەگونجاین بەیەکەوە، ئەگەر ماوەکە زۆری بخایاندایە لەکاری ڕێکخراو سارد دەبوومەوە، دەتوانم بڵێم هەر وازیشم دەهێنا، بۆیە منیش لە ڕاپۆرتێکدا نووسیم بۆ ڕێکخراو داوای پۆلەکەی خۆمم کردەوە، دوای مانگێک دابڕان ڕۆیشتمەوە شوێنی خۆم.

چەند ڕۆژێک دوای نەورۆز، جەزا نامەیەکی پێدام بۆماڵی شەهید فازیلی سەید عەلی، یەکەم شەهیدی خوێندنگەکەمان کە لەپێشەوە باسمکرد.

بە سەیارەکەی جەزا ڕۆیشتین بۆ گەڕەکی (دوور الامن) گەڕەکی ئاشتی ئێستا، لەسەر شەقامەکەی بەرانبەر کۆڵانەکەیان وەستاو وتی:

-ئەو ژنە دەبینی، ئەوە نەنکیەتی، بڵێ ئەو نامەیە بدەرە دەست کاک سەید عەلی، وتی: خۆشم ٢ - ٣ جار بۆم بردوون.

منیش ڕۆیشتم بۆ لای ژنەکە پێم وت: ماڵی کاک سەید عەلی یە؟

- بەڵێ، باوکەکەم.

- تۆ نەنکی شەهید فازیلیت؟

- بەڵێ ڕۆڵە گیان، ئیشت هەبوو؟!

- ئەو نامەیە بدە بەدەستی کاک سەید عەلی.

- باشە باوکی باوکم .

مانگی داهاتوو بەهەمان شێوە نامەم بۆ بردن وەکو شەهیدێکی لە بیرنەکراو، زەرفی نامەکە بڕێک پارەی تیا بوو ٥٠٠، ٢٦ دینار، لەگەڵ نووسراوێک.

بۆ ڕۆژی دوایی کاک سەید عەلی بەسەیارەیەکی کرۆنای ڕەساسی هات بۆ خوێندنگە، من و جەزا لە گۆڕەپانی ناو خوێندنگە وەستا بووین وتی: ئەوە باوکی شەهید فازیلە هات بۆ ئێرە، با منو تۆ خۆمان ونکەین نەک بمانناسێ.

ئەو بەسەیارەکەیەوە وەستاو کەمێک سەیری حەوشەو خوێندکارەکانی کردو ڕۆیشت.

لە دوای ساڵێک منو عەلی حەمە ڕەحیم لە سەرچنار دەستمان لە تەکسیەک ڕاگرت، ناسیمەوە کاک سەید عەلی بوو، وتم: باوکی شەهید فازیلیت.

- بەڵێ، چۆن دەزانی؟

- ئێمەش خوێندکاری کشتوکاڵین.

دەستیکرد بە گریان، وتی:

- بە قووربانتان بم هاوڕێی فازیلن، بڕوا بکەن هەتا ئێستاش سەر لەو

خوێندنگەیەی دەدەم و تێر سەیری خوێندکارەکان دەکەم ئنجا ئەڕۆم، ئێوە دەزانن لە دوای فازیل چیمان بەسەر هات؟! ماڵمان وێران بوو، شەڵڵا ئەوەندەی تر وێران بوایە، بەڵام فازیلم بۆ بمایە، وتی: من نائب زابت بووم لە تەجنید دوای شەهید کردنی ئەو دەریانکردم، ئێستا ئەم سەیارەیەی بە حەقی خۆم وەرمگرت، ناچار کردم بە تەکسی بۆ بژێوی ماڵو منداڵ.

منو عەلی لە گەڕەکی خەبات دابەزین هەرچیمانکرد پارەی وەرنەگرت، هەر ئەیوت وا دەزانم فازیلن، زۆر بە دڵێکی ناشادەوە جێمانهێشت.

(لەم دواییەدا لە گۆڤاری شەهید ژیاننامەو وێنەی شەهید فازیلم بڵاوکردەوە لە ڕێگەی جەباری برای جەلال سیرەمێرگییەوە کە برای کاک سەید عەلی دەکەن).

ژمارە تەلەفۆنم وەرگرت، وێنەی شەهید فازیلیان بۆ هێنام کاتێک گۆڤارەکە دەرچوو ٣ گۆڤارم بۆ ناردن زۆریان پێخۆشبوو، دوایی تەلەفۆنیان بۆ کردم وتیان دێین بۆ ماڵتان، بۆ شەوەکەی خۆیو خێزانیو کوڕێک و کچێکی هاتن بۆ ماڵمان، زۆرمان قسە کرد، پاشان نهێنی ئەوەم لا وتن کە منو جەزای ئەحمەد کوردە یارمەتی ڕێکخراومان دەهێنا بۆ ماڵتان لە گەڕەکی ئاشتی.

وتی: بڕوا بکە ئەوەندە بە دواتانا دەگەڕام، دەمگوت ئەگەر بزانم کێ دەیهێنێت، پارەی تریشم دەدانێ، چونکە ئێمە شەهیدمان بۆ ئەوە نەدا کە یارمەتیمان بۆ بهێنن.

کاک سەید عەلیو خانەوادەکەی زۆر بەڕێز بوون، وتیان تەنها دڵمان پێتدەکرێتەوە بۆیە هاتوین بۆ ماڵتان ئەوە وەفای خۆتە، کە تۆ ئەو شەهیدەی ئێمەت هەر لە یادە.

کاری ڕێکخستن وایلێهاتبوو ئیتر نەماندەتوانی لەناو خێزانەکانمانا بیشارینەوە، چونکە ڕۆژو دوان نەبوو، دەبوایە لە مانگێکدا ٤- ٥ جار بەشەو هەڵبساینایە بۆ بڵاوکردنەوەی بەیاناتو پۆستەری شەهید، بەتایبەتی لە کاتی بۆنەو ڕۆژەکانی ڕووبەڕوو بوونەوە بەرانبەر کردارەکانی ڕژێم.

ئەو کاتە قسەیەک هەبوو لەناو ڕێکخستندا، دەمانوت کاری ڕێکخستن دەبێت یەکەمجار لەخێزانەکەی خۆمانەوە دەستپێبکەین، دەبێت ئەوانیش هاوکارمان بن لە کارەکانمان، بۆ نموونە ئەگەر دایکم پشتو پەنای من نەبوایە، جەزا نەیدەتوانی بەیاناتو بڵاوکراوەو کتێبو ئەو شتانە بداتە دەستی، وە ئەگەر دایکیشم هەڵوێستی لەگەڵ مندا نەبوایە منیش ئەوەندە بە گەرمی خەباتی ناوشارم بۆ نەدەکرا، هەموو جارێک جەزا دەیوت: دایکت زۆر باشەو بەڕووی خۆشەوە پێشوازیم لێدەکات.

زۆربەی شەوان باوکم لە سەعاتی سفردا هەڵیدەستاندم، بە شەو بەیانم دەدایە دەستیان، بۆیان قەد دەکردمو بچوکیان دەکردەوە، منیش دەمخستنە ناو ماڵانەوە، خۆم دەمتوانی بە تەنها بەیانەکان قەد بکەم بەڵام بەوانم دەکرد بۆ ئەوەی ئیرادەیان بەهێز بێت، یان زۆرجار ڕزگارە سوور دەڕۆیشت بۆ دووکانەکەی باوکم، نامەو ڕاسپاردەکانی دەدایە دەستی باوکم ئەویش دەیهێنایەوە بۆ ماڵەوە دەیدا بەمن .

یاخود برا گەورەکەم کاک شێخ حسێن یان هیوای برام بە سەیارە هاوکارم بوون، کوێم بویستایە دەیانبردم و کار ئاسانییان بۆ دەکردم، لە دواییا باسیان دەکەم کە چییان بۆ کردووم.

یاخود ماڵی خوشکەکانم کە شەو لە ماڵیان دەخەوتم، بەتایبەتی لە کاتی

دەستگیرکردنی هاوڕێیاندا، یان مەترسی لەسەرمان، هەروەها هاوڕێیانی تریش بە هەمان شێوە کە دایک و باوکیان و خوشک و براو کەسیان چەند دەوریان هەبوو بۆ هاوکاریمان. وەکو پێشینان ئەڵێن: چەپڵە بەدەستێک لێنادرێت، ئێمەش بە تەنیا نەماندەتوانی کارەکانمان ئەنجام بدەین بەبێ هاوکاری ئەوان.

ئەوکاتە هاوڕێیەتیم ئەوەندە خۆشبوو لەگەڵ عەلی حەمەڕەحیم، زۆربەی شەوان لەماڵی ئەوان دەخەوتم، بەخێزانی ئەوەندە تێکەڵ ببوین وەکو کوڕی ئەو ماڵەم لێهاتبوو، ماڵەوەیان هەموو نهێنییەکی من و عەلیان دەزانی، زۆر یارمەتیدەرمان بوون بۆ کاری ڕێکخستن.

عەلی حەمە ڕەحیم بێزار ببوو، لە کاری ڕێکخستن ئەیوت:

- من ئارەزووم لە کاری پێشمەرگانەی ناوشارە، چەندجار پێشنیارم کردووە وەڵامم نادەنەوە، ڕوممانەیەکی پەیدا کردبوو لەبەردەم خانەقادا خستبویە ناو ئیڤایەکی سەربازییەوە تەقاندبوویەوە، هەر کە هات بۆ خوێندنگە بەمنی وت کارێکی وامکردووە، وتی: ئەگەر تۆش ڕاپۆرت نەنوسی بۆ ڕێکخراو توشی کێشەیەک دەبم و بەدەردی شەهید فازیلی سەید عەلی ئەڕۆم. وتم:

- تۆ پەیوەندیت بە منەوە نیە. بە ڕێکخەرەکەی خۆت بڵێ.

- تۆش ڕاپۆرتی خۆت بنووسە بۆ پشتگیریم.

منیش ڕاپۆرتێکم نوسی‌و ناردم بۆ سەروو خۆمان، گەیشتبووە دەست لێپرسراوی ڕێکخراو، پاشماوەیەک عەلی وتی: مژدە گواسترامەوە بۆ لیژنەی ئیغتیالات، وتی: دەبێت تۆش بێیت چونکە من و تۆ باوەڕمان بەیەک هەیە.

عەلی ڕۆیشتە ڕیزی پێشمەرگەی ناو شارەوەو ڕۆژێک هات وتی: چالاکییەکی باشمان ئەنجام داوە، بەڵام من وەکو حیمایە لەگەڵ ئەو هاوڕێیەدا بووم، دەمانچەیەک و ڕوممانەیەکیان دایە دەست من، ئەگەر لە کاتی ئەو ئیشەدا دەست لەو هاوڕێیە کرایەوە دەبێت من یان تەقە بکەم، یان ڕوممانەکە هەڵبدەم بۆ ڕزگارکردنی، ئەو ڕۆژە خۆفرۆشێکیان لەناو بردبوو کارەکەش سەرکەوتوو بوو.

عەلی پەیوەندی بە ڕێکخستنەوە نەما، هەرچییەکی بکردایە بە منی دەووت، چونکە منو عەلی شتی شاراوە لە نێوانماندا نەبوو.

لە وەرزی بەهاردا دەستووری هەموو خوێندنگەکان وایە خوێندکاران هەڵدەستن بە چالاکی و بە ئاهەنگگێڕانی جەژنی نەورۆزو و سەیرانی بەهارە.

ئەوسا ئەو ئیشانە (اتحاد الطلبة) سەرپەرشتی دەکرد، ئێمەش ئیتحادمان نەبوو، خوێندکاران قسەمانکرد کەخۆمان ئاهەنگو سەیران جێبەجێ بکەین.

منیش ڕۆیشتم بۆ لای بەڕێوەبەر دکتۆر عادل تۆفیق، وتم:

- خوێندکاران بە نیازین ئاهەنگ بگێڕین لەناو خوێندنگەدا.

بەڕێوەبەر دەستیکرد بەپێکەنین وتی:

- ڕەئووف وەڵڵاهی تۆ مشکلە!

- دکتۆر بۆچی مشکلەم ؟

- تۆ حەفلەت دەوێ، سەفرەت دەوێ، هەموو شت دەوێ بەڵام ئیتحاد ناتەوێ؟ ئەوە فعالیات ئیتحادو طلبەیە لەدەست من نیە، ئەوە پارەی دەوێت، مەسرەفی دەوێت، ئیشرافی دەوێت، مەسئولیاتی دەوێت کێ ئەوانە دەکات.

- ئێمە خۆمان دەیکەین، خۆشترین ئاهەنگیش دەگێڕین ئەوە چی پەیوەندی بەئیتحادەوە هەیە؟ هەمومان پارە کۆدەکەینەوەو ئەیکەین بە مەسرەف.

- وەڵڵا ڕەئووف من مەسئولیات هەڵناگرم، برۆ بۆ لای مامۆستا هیمەت.

ڕۆیشتم بۆ لای مامۆستا هیمەت مەسەلەکەم تێگەیاند.

ئەویش ڕەزامەندی بۆمان وەرگرت، بەمەرجێک نابێت باسی کوردایەتی‌و شیعری سیاسی و سروودی نیشتمانی بکەین، منیش وتم: ئەی هەڵپەرکێ ؟ پێکەنی، وتی: ئەوەیان زۆر باشە.

لەسەر ئەوە ڕێککەوتین کە زۆربەی بابەتەکان لەسەر فەلەستین بێت، وە شیعرەکانیش بەڕەمز بێت.

لەسەرەتای مانگی ٤ خۆمان ئامادەکرد بۆ پرۆڤە، ٢ شانۆگەری ئامادەکرا، یەکێکیان بەناوی جەنگاوەرانی فەلەستینەوە، ئەویتریان سەیرانێک لە ئەزمڕ،

که ئەویش زۆربەی ڕەمز بوو، مامۆستای قوتابخانەکەمان مامۆستا حەسەن مەحمودی چیرۆکنووس ئامادەی کردبوو، لەنوسینی موحەرەم محەمەد ئەمین، لەگەڵ چەند شیعرو گۆرانی و هەڵپەڕکێ، ماوەی ٤ ڕۆژ پرۆڤە کرا، بەشداربووان شاناز محەمەد وەکو سەرپەرشتیاری ئاهەنگەکە، خۆشم سەرپەرشتیاری هۆڵ، شانۆکانیش حەمید ئیسماعیل، مژدە ئاڵی، عەلی حەمەڕەحیم، وەهاب عوسمان و چەند کەسێکی تر، شانۆی فەلەستین لە نواندنی پەخشان و جەمیلە شێخ مەحمودو چەند کچێکی ترو چەند کوڕێک.



ڕۆژی ئاهەنگەکە لە هۆڵێکی گەورەی ناو خوێندنگە بوو، هەموو خوێندکارانو خەڵکێکی زۆر ئامادەبوون، مامۆستایان هەموویان لەپێشەوە جێگەیان بۆ دانرابوو، لەگەڵ چەند میوان و کەسایەتییەکی تر، گۆرانیبێژان: میدیا حسێن و عەتای برای حەمە جەزای هونەرمەند هاتبوون، سەرەتا چەند خوێندکارێک لە ناو ڕیزی خەڵکەکەوە بە جلی کوردیو جامانەوە هاتن و ڕەمزی ئاگری نەورۆزیان بەرز کردبووەوە بە سروودی جەژنە جەژنی کوردستانە جەژنی نەورۆزە هاتنە سەر شانۆکە، هەر لەویادا خەریکبوو ببێت بە خۆپیشاندان، ئنجا دەستکرا بە گۆرانی و شانۆکان پێشکەشکران، لەشانۆی جەنگاوەرانی فەلەستیندا کۆتاییەکەی تەرمی شەهیدێک بەسەر شانی چەند خوێندکارێکەوە بوو بە ئاڵای فەلەستینەوە، بەم شیعرەی هەژار کۆتاییان بە شانۆکە هێنا.

مـردن لـه رێـی نیشتمان بێت
هـەزار گیانی بە قووربان بێت
واش نـەبـوایـە هـەر دەمــردی
کەسیش یــادی نــەدەکــردی ·

کاتێک ڕۆیشتمە دەرەوەی هۆڵەکە سەیر دەکەم چواردەورمان بە قوات خاسە گیراوە، ڕۆیشتم بە مامۆستا هیمەتم وت: بەو قوات خاسانە بڵێ با بڕۆن چونکە خوێندکارەکان دڵیان گەرمە.

وتی: حەمە ڕەئووف منو تۆ دەبێت بەهیچ شێوەیەک نەهێڵین شت ببێت، خوێندکارەکان بە قسەی تۆ دەکەن، چونکە لەسەر باوەڕی من ئەم ئاهەنگە کراوە.

پاش شیعر خوێندنەوەو گۆرانی وتن، ئاهەنگەکە کۆتایی هات و هیچ ڕووی نەداو بەسەلامەتی دەرچووین، لە هاتنە دەرەوەدا هوما کێشان و چەپڵە دەستیپێکرد، ئەویش لە دژی قوات خاسەکان.



ئاهەنگی بەهارەی خوێندنگەی کشتوکاڵی بەکرەجۆ ساڵی ١٩٨٣



ئاهەنگی بەهارەی خوێندنگەی کشتوکاڵی بەکرەجۆ ساڵی ١٩٨٣

هەفتەیەک دوای ئاهەنگی خوێندنگە سەیرانی بەهارەمان دەستپێکرد، ڕۆژی پێنجشەممەمان دانا، چونکە هەموو خوێندنگەکان یەک ڕۆژ دادەنێن بۆ ئەوەی قەرەباڵغی لەگەڵ خەڵکی تردا دروست نەبێت، ئەویش لەگەڵ مامۆستا هیمەت قسەم کرد چەند خوێندکارێک بووین بە لیژنەی بەڕێوەبردن و پاسی کۆستەرمان ئامادەکرد بۆ ئەو ڕۆژە.

ڕۆژی پێنجشەممە خوێندکاران ئامادەبوون لەبەردەم خوێندنگە لە بەکرەجۆ، هەموو خواردنو پێویستیمان هێنابوو، کچانو کوڕان بەجلی فۆلکلۆری کوردیەو جامانەو کڵاشو پەستەک و پووزەوانەو کوڵەباڵ، لافیتەی خوێندنگەی خۆمان هەڵواسی بە پێشی پاسەکاندا .

ئەو ڕۆژە خوێندنگەی پیشەسازی و بازرگانیش هاتبوون، چونکە لە بەڕێوەبەرایەتی پەروەردە هەرسێ ئامادەییە پیشەییەکان بەیەکەوە دانرابوون بۆ سەیران، لە ڕێگا پاسەکان دەیانکرد بە پێشکەوتنو خوێندکارانیش بە چەپڵەو گۆرانی.

بەڵام ئێمە ئەو چەند خوێندکارەی خۆمان واتە منو عەلی حەمە ڕەحیم و وەهاب و حەمە عەلی شەریف بە سەیارەیەکی پیکابی سوور کە هاوڕێیەکی خۆمان جـەزای وەستا ڕەحیمی وێڵەدەری هێنابووی ڕۆیشتین دواکەیمان خۆشکردبوو بە بەڕەی کوردەواری و تەسجیلی گەورەشمان تیا دانابوو، بۆیە زۆربەی خوێندکارەکان بەسەرە دەهاتنە لامان سوار دەبوون.

هەتا دوا نیوەڕۆ لە هاوینەهەواری دوکانماینەوەو پاشان ڕۆیشتین بۆ سەر ئاوەکەی دووکـان، دەستمانکرد بەوێنەگرتن، بۆ ئێوارەکەی گەڕاینەوە بۆ قەشقۆڵی کردمان بە گۆرانی و هەڵپەڕکێ تا درەنگێک، پاشان بەرەو سلێمانی گەڕاینەوە.

بۆ ڕۆژی دوایی مامۆستا هیمەت هات بۆ گۆڕەپانی خوێندنگەو بانگی کردم، وتی: حەمە ڕەئووف چۆن سەیرانێک بوو.

- بەڕاستی خۆشبوو، ئیتر ئیتحادمان بۆ چییە؟ خۆمان دەیبەین بەڕێوە.

**مامۆستا هیمەت بەپێکەنینەوە وتی:**

**- ئێستا ئیتحادییەکەی ترین بە شێوە کوردییەکەی واتە: (یەکێتی نیشتمانی).**

**- باشە ئێستا خۆشتر و سەربەرز تر نین؟**

**- زۆریش خۆشەو خۆشتریشی دەکەین.**



لەڕاستەوە: ڕەئووف شێخ جەمیل- مامۆستا هیمەت کەریم فەتاح- عەلی حەمەڕەحیم
بەردەم خوێدنگەی ئامادەیی کشتوکاڵی بەکرەجۆ خۆئامادەکردن و ڕۆشتن بۆ سەیرانگای دوکان

ساڵی ١٩٨٢- ١٩٨٣ مامۆستا جەمال تایەر لەزیندان ئازاد کراو لەسەر بڕیاری سەرکردایەتی ڕۆیشت بۆ شاخ، دلێری ئەحمەد شوکری (هاوڕێ سەلیم) کرا بە لێپرسراوی ڕێکخراوی سلێمانی، لەو سەردەمەدا ڕێکخراو زۆر پەرەی سەندو گەشەی کرد، هاوڕێیانی ناوشار جیهازێکی ڕۆنیۆیان دەستگیرکردبوو، لەبەرئەوە بەیانات و پۆستەری شەهیدو ژمارەیەکی زۆریان چاپ دەکرد، هەر هاوڕێیەک ١٠٠ نوسخە زیاترمان بۆ دادەنرا بۆ بڵاوکردنەوەی بەناوشاردا، جگە لە نامیلکەو چاپکراوی تر.

گەنجێکی زۆر پەیوەندییان دەکرد بە ڕێکخراوەوە ئێمە زۆر هیلاک دەبووین لەگەڵیان تا لە بواری ڕۆشنبیریدا پەرەیان پێبدەین.

کۆتایی مانگی ٥ لە کۆبوونەوەیەکدا جەزا وتی ٤ هاوڕێی تر هەیە ئەبێ پەیوەندییان پێوەبکەیت و شانەیان بۆ دروستبکەیتو لای خۆت ڕێکیانبخەیت.

بۆ ڕۆژی دوایی٤ هاوڕێیان پێناساندم بەم ناوانە:

١- ئاکۆ محەمەد عەبدوڵڵا (ئاکۆی حەمە شوکر - شەهید).

٢- هاوڕێ عەبدوڵڵا سەید شەریف (شەهید).

٣- لایەق نامق وێڵەدەری .

٤- نەوڕۆزی قالە بەراز (برای سەرداری قالە بەراز —لەهوڵەندایە).

ئەم هاوڕێیانە ئاستی خوێندەوارییان کەمبوو، ماوەیەک لەگەڵ خۆم بوون، وانەکانی ڕێکخراوم پێدەوتن، ئەیانووت: ئێمە هاتوین کار بکەین وەکو پێشمەرگەی ناوشار، منیش پێمدەوتن با جارێ چاوتان بکرێتەوەو فێری کاری ڕێکخراوەیی بین، چی بڵێن بۆتان دەکەین.

بەڵام هەتا بڵێیت ئیشکەرو دڵسۆز بوون، تا ماوەیەک پەیوەندییان بە خۆمەوە هەبوو پاشان لای ئازادەڕەش ڕێکمخستن و شانەم بۆ دروستکردن.

ئەم کۆمەڵە هاوڕێیە خەڵکی گەڕەکی سابوونکەران بوون.



مانگی ٥ بەرەو تاقیکردنەوەی کۆتایی ساڵ دەڕۆیشتین بۆ ماوەی هەفتەیەک مۆڵەتیانَ داینێ، پاشان تاقیکردنەوە دەستیپێکرد بۆ ماوەی ١٢ ڕۆژ تەواو بووین، دوای چەند ڕۆژێک نمرەمان وەرگرتو زۆربەمان دەرچووین، ئەو ساڵەشمان بەڕێکردو بۆ پۆلی سێیەم هەنگاوماننا.



بۆ هاوینەکەی لەگەڵ جەزا چەند وانەیەکی ترمان تەواوکرد وەکو ژیانی لینینو ژیان و تێکۆشانی دیمترۆف و خەباتی گەلانو ماتریالیزمی دیالەکتیکو فەرهەنگی زاراوەی سیاسی، کە کتێبێکی زۆر گرنگە، جگە لە کۆبوونەوەی هەفتانەی خۆمانو تاووتوێ کردنی ڕاپۆرتی مانگانەو ڕاپۆرتەکانی ڕێکخراوو شانەکانی خوارەوە.

بەڕاستی ئەوەندە سەرقاڵ ببوین، تەنها فریای ئیشو کارەکانی ڕێکخراو دەکەوتین بێ لە ژیانی ڕۆژانەی خۆشمان، من وەکو خۆم لە پشووی هاوینەدا کرێکاریشم دەکرد.

له کۆتایی مانگی ٤ محەمەدی شێخ فاتح داوای تەزکیەی کرد کە بڕوات بۆ خەباتی چەکداری شاخ، چونکە محەمەد لە حاڵەتی فیراریدا بوو ئەیوت: من لەوە زیاتر ناتوانم دابنیشم لەناو شاردا، وا پێویست دەکات بڕۆم بۆ شاخ، منیش تەزکیەی ڕێکخراوم بۆ وەرگرت.

ئێوارەیەک مەوعیدمان دانا لەسەر پردەکەی ناوبازاڕ کە ڕۆیشتم لەگەڵ ڕزگارە سوور وەستابوون تەزکیەکەم دایە، چاوی پڕ بوو لە ئاو، وتی: تەنها ئەوەم پێناخۆشە کە ئەو هاوڕێ بەوەفایانە جێدەهێڵم، بەڵام ئەوەتان پێبڵێم من خۆم بۆ شەهید بوون داناوە لەڕێگەی کوردستانا، ئەگەر شەهید کرام کەس بۆم نەگری ئەگەر کوردستانیش ڕزگار کرا بە سروود وتن و ئاهەنگگێڕان وەرنە سەر گۆڕم.

محەمەد ڕۆیشت بۆ شاخ پێشمەرگەیەکی زۆر بە تواناو ئازای لێدەرچوو.

لە دانووستانی ١٩٨٤ دا چاومان بەیەک کەوتەوە، ئیتر من نەمبینیەوە، بەڵام خەبەرم لێی هەبوو، دوای ئەوە ڕۆیشت بۆ تیپی ٥٧ ی سەگرمەو چەکی (بی، کەی، سی) هەڵگرت. (بە حەمە بی، کەی، سی) ناوی دەرکرد.

پاشان لەگەڵ کاک ئازادی سەگرمەو کاک ئازاد هەورامی ڕۆیشتن بۆ بادینان، بەداخەوە لە شەڕەکانی سەرکردایەتی و سەرگەڵوو لە ڕێکەوتی ٢٧ / ٢ / ١٩٨٨ لە شەڕێکی قارەمانانەی بێ وێنەدا شەهید کرا، هەزار درود بۆ گیانی پاکی.



شەهید محەمەد شێخ فاتح (ناسراو بە حەمە بی کەی سی)

ڕۆژێ عەلی حەمە ڕەحیم وتی: هاوڕێیەکی ئازاو باشیان پێناساندوم بە نیازین لەمەولا ئیشی پێشمەرگانە دەستپێبکەین، ٢ دەمانچەشمان وەرگرتووە، منیش باسی تۆم بۆ ئەو هاوڕێیە کردووەو پێمخۆشە لە چالاکییەکدا لەگەڵمان بەشدار بیت.

وتم: من هیچ پەیوەندییەکم بەم مەسەلەیەوە نییە، ئەگەر تووشی کارەساتێک ببم بەرپرسیارێتی لە دووایە، وتی: تۆ هیچ ناکەیت تەنها سەیر بکەو بزانە چۆن ئیشەکە دەکەین، چونکە ئەم ئیشە تەنها بۆسەی پێشمەرگانەیە.

بۆ ڕۆژی دوایی سەعات ٤ ڕۆیشتم بۆ لای خانەقا، چونکە مەوعیدمان ئەوێ بوو، پاش کەمێک عەلیو هاوڕێیەکی تر هاتن، عەلی پێی ناساندم، هاوڕێ حاجی (جەلالی مەلا عەبدوڵلا)، ٢ دەمانچەیان پێبوو، بەڵام پێیان نەدەبینرا، چونکە هەردووکیان پانتۆڵیان لە پێدا بوو، ڕۆیشتن بۆ لای نەخۆشخانەی ئەهلی چوارباخی ئێستا، منیش بە دوایاندا، ئەوان بەرانبەری ٢ کۆڵانیان گرتو وەستان، منیش لەولاوە وەستام، پاش کەمێک سەیارەیەکی لاندگرۆزەر هات تابلۆکەی شین، نوسرابوو (اتحاد شباب)، عەلیو حاجی ڕۆیشتنە سەر شەقامەکە، لەملاولاوە دەستیانکرد بە تەقەکردن، سەیارەکە نەوەستاو بە خێرایی بۆی دەرچوو، حاجی لای خوارووی گرتبوو، بەرەو ماڵەکانی جوولەکان ڕایکردو عەلیش بۆ سەرەوە بەرەو مەیدانی سەعە تەها کۆیی، دوای عەلی کەوتم بزانم بۆ کوێ دەڕوا، عەلیم لێ ونبوو، زۆر خەمم بوو بگیرێت.

هاتمەوە سەر جادەکەو تەکسییەکم گرت ڕۆیشتم بۆ ماڵیان، لە سەری کۆڵانەکەیان وەستام و چاوەڕێم کرد، پاش کاتژمێرێک عەلی و حاجی هاتنەوە.

بە عەلیم وت بەدواتا هاتم بەڵام لێم ونبویت.

- وتی: من خۆمکرد بە سەیارەی خۆڵەکەدا لە پێشەوە لێی دانیشتم بە سایەقەکەم وت: قسە نەکەیت، وتی: ئەو تەقانە ئێوە بوون، وتم: بەڵێ، تا

سەرەوە لەگەڵیدا ڕۆیشتم، دوایی دابەزیم و بە تەکسییەک هاتمەوە، وتی: تۆ ئەوانەت نەناسی؟

- نەخێر.

حاجی وتی: من سایەقەکەم ناسی فوئاد چاوشین و ئەوەی تریشیان عادلی شەباب بوو.

- عەلی وتی: ئەوەی تریشیان مامۆستا هیمەت لە دواوە دانیشتبوو.

منیش بە مامۆستا هیمەتم وت کە تەقەتان لێکراوە، بەڵام ئەو حاشای لێکرد، وتی من لای سلێمانی پاڵاس وەستا بووم، عادلی شەباب و فوئاد هاتن بەسەیارەوە، وتیان: فریامانکەوە تەقەمان لێکراوە، منیش لەگەڵیان ڕۆیشتم بۆ نەخۆشخانە.

ئەم چالاکییە لەگۆڤاری شەرارەو ڕێبازی نوێ دا بڵاوکرایەوە، بە ناوی ٢ پێشمەرگەی تیپی ٣١ ی سلێمانی.

مانگی ٦ جەزا لەکۆبوونەوەیەکدا تەعمیمێکی دایە دەستم.

منیش خوێندمەوەو خۆشحاڵی خۆم دەربڕی، نووسراوەکە لە ناوەندی کۆمەڵەوە هاتبوو بۆ ئەو کەسانەی ئارەزووی چالاکی پێشمەرگانەی ناوشاریان هەیە بەپێی بڕیاری ئەو نووسراوە دەتوانن بەشداری بکەن، (ئێستاش نوسخەی دووەمی ئەو نووسراوە لەلام پارێزراوەو لە دۆکۆمێنتەکان دا دەیخەمەڕوو).

منیش هاوڕێیانی لای خۆمم ئاگادار کرد، خۆمم نووسی و زۆربەی هاوڕێیانیش خۆیان نووسی و ڕاپۆرتیان نارد بۆ ڕێکخراو.

دوای ٢- ٣ ڕۆژ لای سەراوە ڕۆیشتمە خوارەوە، نەورۆزی قالە بەراز ئەوکاتە دوکانیان هەبوو بەڕیزی سابونکەران، سەیرمکرد ئاکۆ لای نەورۆز وەستاوە، داوای یارمەتی لێکردم و ڕۆیشتینە ئەو لاوە، وتی:

- ئەو نووسراوەی هات بۆمان من ناوی خۆم نوسیووە بۆ پێشمەرگەی ناوشار، دەبێت تۆش پشتگیریم بکەی وەعدیشتان دەدەمێ،چی بڵێن دەیکەم.

- وتم: هاوڕێ، ئەم کارە هەروا ئاسان نیەو بە دەستی منیش نیە! کێ دەڵێت خۆشم وەردەگرن.

- وتی: ئیتر من لەگەڵ تۆدام.

(ئاکۆ لە دایکبوویساڵی ١٩٧٠، ئەوکاتە تەمەنی ١٤ ساڵ بوو، لەو هاوڕێیانەی لای من لەهەمویان بەتەمەن منداڵتر، بەڵام زۆر وریاو ئازابوو.

منیش بۆ وەڵامی تەعمیمەکە ڕاپۆرتی خۆمو چەند هاوڕێیەکم بەرز کردەوە.

* * *

کە نوسخەی تەعمیمەکەم پیشانی عەلی حەمە ڕەحیمدا، لەخۆشیا نەیدەزانی چی بکات، وتی: پێیان ئەڵێم لە مەفرەزەی خۆمانابیت.

پاش چەند ڕۆژێک عەلی نامەیەکی بۆ هێنام وتی: بیخوێنەرەوە، منیش نامەکەم خوێندەوە، وەڵامی نامەکەی خۆم بوو وەرگیرابووم، بەمەرجێک دەبێت واز لە کاری ڕێکخراو بهێنم و شانەکان تەسلیم بکەمەوە.

بەڕاستی لەبەر شانەکان زۆرم پێناخۆش بوو، منیش نامەیەکم بۆ نوسینەوە کە نامەوێ دەستبەرداری ڕێکخراو ببم، چونکە من خۆم بە پەروەردەکەری ڕێکخراو دەزانم، بەڵام هاوکار دەبم لەگەڵتانا، ئەوەی بتوانم درێغی ناکەم.

وەڵامی نامەکەم بۆ هاتەوە کە پەیوەندیم هەبێت بە هەردوو لاوە ، بەمەرجێک نابێت نهێنی هیچ لایەک ببەم بۆ لایەکەی تر.

* * *

ئازادەڕەش هات بۆ لام زۆر شپرزە بوو، وتی: ئاکۆ گیراوە؟!

ئازاد وتی: من ئەڕۆم بۆ شاخ، زۆر لەو کوڕە دەترسم ناومان بڵێت!

زۆرم وت لەگەڵ ئازاد، سوودی نەبوو.

دوای چەند ڕۆژێک ئازاد ڕۆیشت بۆ شاخ، بۆ ڕێکخراوی ۲ ی هەڵەدن چاوەڕێی تەزکییەکەی نەکرد.

بە عەلیم وت: هاوڕێیەکمان گیراوە، تا ماوەیەک نارۆمەوە بۆ ماڵەوە مەترسیم لەسەر هەیە، ئەو ماوەیە لە ماڵی عەلی و خوشک و براکانم دەخەوتم، زۆر خۆم دەرنەدەخست.

ڕۆژێک کاک لەتیفی برای ئاکۆم بینی هەواڵی ئاکۆم پرسی ؟ وتی:

- ئاکۆی برام چۆن دەناسی؟!

- من ڕێکخەری ئاکۆم لە ڕێکخراودا، دەمەوێت بزانم چۆن گیراوەو هۆکەی چییە؟

- ئەڵێن کەسێک بە گرتی داوە ناوی بەرزانە.

- زۆر باشە منیش هەر ئەوەندەم دەویست، بەڵام هاوڕێیان کەمێک ترسییان هەیە.

- وتی: ئەگەر برای من بێت، ئیعتراف ناکات، کەسیش نەترسێت.

ئاکۆی تەمەن ۱٤ ساڵ هیچ ئیعترافی نەکردوو خۆی ڕاگرت لەژێر ئازارو ئەشکەنجەدا، دواییش کەسێکی زۆر ئازای لێدەرچوو.

پەیوەندیمکرد بەلیژنەی چالاکی ناوشارەوە، لەسەر بڕیاری لیژنەی ئیغتیالاتی ناوشار، بەمەرجێک تەنها چالاکی پێشمەرگانە، هیچ کارێکی شەخسی نەکرێت لە پێناوی خۆمان و کەسانی تردا.

من و عەلی و حاجی بووین بە مەفرەزەیەک، حاجی وتی: دەمانەوێت چالاکییەک بکەین کە دەنگ بداتەوە، دوای ٢ ڕۆژ ، ٣ دەمانچەیان هێنا، ٢ چواردە خۆر، یەکێکیان دەسکزەرد ئەویتریان دەسکرەش لەگەڵ میکارۆفێکدا، وتیان: دەبێت زۆر ئاگادار بین کە ئەم چالاکییە بۆسەیە، ئەمە بەسەرپەرشتی لێپرسراوەکەمانە دەبێت ئیشێکی باش بکەین، حاجی دەمانچە چواردە خۆرەکەی دانا بۆ خۆیی و دەمانچە دەسکزەردەکەی دا بە عەلی و میکارۆفەکەشی دا بە من لەگەڵ دوو شانەی زیادەدا.

حاجی وتی: ئەگەر زۆر تەنگاو و شپرزە بوون و نەتانتوانی دەربچن، دەمانچەکە فڕێ بدەن بۆ سەربانێک یان شوێنێ کە نەدۆزرێتەوە خۆتان ڕزگار بکەن، چونکە دەمانچە لەجێی دەبێتەوە بەڵام لەجێی خۆمان نابینەوە.

هەرسێکمان لەکۆڵانەکەی ئەو دیوی گەراجی قەرەداغەوە فیشەکمان خستەبەر دەمانچەکان.

کات ١١ ی سەر لە بەیانی ڕۆیشتینە سەر شەقامی خوار فولکەی خانەقا وەستاین حاجی وتی: ئەگەر ئیشەکەمان کرد هەرسێکمان دوورو نزیک بە دوای یەکترا ڕادەکەین بۆ کۆڵانەکانی ئەوبەر، دەوری ٢٠ دەقیقە وەستاین، حاجی هەر سەیری سەرەوەی دەکرد، وتی هات وریا بن، سەیرمانکرد سەیارەیەکی لاندگرۆزەر هات تابلۆکەی (جيش شعبي)، ٤ کەسی تیا بوو بە جلی سەوزەوە، حاجی وتی: بڕۆنە پێشەوە، عەلی و حاجی ڕۆیشتنە نزیکەوە دەستیانکرد بە تەقەکردن، سەیارەکە خۆی کێشا بە شۆستەکەداو وەستا منیش لە تەنیشتەوە دەستمکرد بە تەقە، حاجی لە دواشەوە تەقەی لێکردنەوە، وتی:

ڕاکەن، هەرسێکمان دوورو نزیک بەرەو گەراجی قەرەداغ ڕامانکرد خۆمانکرد بە کۆڵانەکاندا تەواو هیلاک بووین، حاجی وتی: دەمانچەکانم بەنێو ئێوە بڕۆن، دەمانچەکانی خستە کیسەیەکی ڕەشەوە، ڕۆیشتە سەر جادەکەی خوارەوە تەکسییەکی گرت، ئێمە تا چاومان لێبوو تەکسییەکە ڕۆیشت بەرەو گەڕەکی خەبات، منو عەلیش تەکسییەکمان گرت و ڕۆیشتین.

لە ماڵی عەلی دەم و چاومان شت و پشویەکماندا، کاتی نیوەڕۆ هات، تەلەفۆنێک کرا، عەلی وتی: ئەوە حاجییە.

((ئێستاش لە دوای ٣٢ ساڵ ئەو ژمارە تەلەفۆنەم هەر لەبیر ماوە ٢٦٨٦٣ وەک یادگارییەک هەمیشە لە دڵی خۆمدا دەیلێمەوە)).

لە تەلەفۆنەکە هەر ئەوەندەی وت: بەڵێ لە ماڵم.

پاش کەمێک حاجیش هات، دەستمانکرد بە نانخواردن، عەلی بە حاجی وت:

- ئەی دەمانچەکانت چی لێکرد؟
- لە ماڵەوە شاردمنەوە!

دوای نانخواردن من لێیان جیا بوومەوە ڕۆیشتمەوە بۆ ماڵەوە.

بۆ بەیانی عەلی بە ماتۆڕ هات بەدواما بۆ ماڵەوە بەیەکەوە ڕۆیشتین، پرسیارمکرد ئەنجامتان دەستکەوت، وتی: بەپێی زانیاری تەواوی ئەو کەسەی ڕۆیشتبووە سەریان سیانیان کوژرابوون.

مانگی ٧ی ١٩٨٣ مانگی ڕەمەزان بوو، ئێوارەکەی جەزا وتی: دەبێت ئەمشەو بێیت بۆ ماڵی ئێمە، لەسەر بڕیاری ڕێکخراو دیوار بنووسین، منیش ڕۆیشتمەوە بۆ ماڵەوە، بە دایک و باوکمم وت ئەم شەو نایەمەوە.

تەکسیەکم گرتو ڕۆیشتم بۆ ماڵی جەزا، هەتا درەنگانێک لە دەوروبەری ماڵیان دانیشتین، بۆ شەوێ ڕۆیشتینە ژورەوە، بەخێرهاتنێکی گەرمیان لێکردم، من و جەزا لە سەربان لەسەر ٢ قەرەوێڵە خەوتین، بۆ سەعات ٣ ی بەیانی کاک ئەحمەد کوردە هەڵیساندین، خێزانی ماڵی کاک ئەحمەد هەمویان هەڵسا بوون بۆ پارشێو، ئنجا منو جەزا خۆمان کۆکردەوە ویستمان بڕۆین، کاک ئەحمەد جەزای بردە ئەو لاوەو ٢ چپەیان کرد، هیچ حاڵی نەبووم، بەڵام گومانم کرد کە قسەیەکیان دەربارەی من کرد، کە ڕۆیشتینە دەرەوە وتم:

- جەزا باوکت چی پێوتیت؟
- هیچی نەووت.
- ئەگەر پێم نەڵێیت، لەگەڵت نایەم.
- وتی: ئەو کوڕە ئەمانەتە لە ماڵی ئێمە، خۆت دیوارەکان بنووسە، ئەگەر شتێکیش ببێت با ئەو هیچی لێنەیەت، وتم:
- منو تۆ فەرقمان نییە، نەخێر من دەینووسم.
- ئەگەر باوکیشم نەڵێت، هەر خۆم دەینووسم.

(لەپێشەوە باسمکرد ماڵیان لەسەر شەقامی سالم، لەسەر گۆشەکەی بەرانبەر شارەوانی ئێستا بوو).

هاتینە سەر شەقامە سەرەکییەکە، جەزا وتی: تۆ لێرە بووەستە، من ئەڕۆم بۆ ئەو سەر، ئەم دیوارە سپییە گەورەیە دەنووسم، ئەگەر تەقەم لێکراو بریندار کرام فریام بکەوە ئەگەر کوژراشم یان گیرام تۆ بڕۆو خۆت ونکە.

جەزا لای ماڵی خۆیانەوە ڕۆیشت بۆ ئەو سەر، واتە دیواری بەرانبەر گەراجی

پاسەکانی مەسلەحەی کۆن، یان بلێین بەرانبەر مەلبەندی یەکی سلێمانی ئێستا.

لەسەر دەرگای گەراجی پاسەکان شوێنی حەرەس هەبو، گوێنیە خۆلیان وەکو رەبایە دانابوو، سەر جادەکەش دەتووت رۆژی لێهەلهاتووە ئەوەندە رووناک بوو، چونکە شەقامی سەرەکی شار بوو، ئەوساش وەکو ئێستا گلۆپەکانی هەمووی بلاجیکتۆر بوو، جەزا کاغەزەکەی دەرهێناو لەو سەرەوە درووشمەکانی بە گەورەیی لەسەر دیوارەکە نووسی، دیوارەکە ئەوەندە ماوەی هەبوو جێگای چەند درووشمێکی تیا بووەوە، ئێستاش ئەو دیوارە هەر ماوە لەبەرانبەر مەلبەندەوە دەستپێدەکات هەتا پێچ دەکەیتەوە بۆ شارەوانی، پاشان رۆیشتین بۆ دیوارەکانی ئەو بەر ئنجا من دەستمکرد بە نووسین، جەزاش حەرەس بوو لەسەر جادەکە، پیکابێک هات ۲ بلاجیکتۆر بەسەریەوە بوو، لەویادا خانوویەک دروستدەکرا لەو چەویان بۆ دانابوو، هەردووکمان خۆمان دا بەسەر لمەکەدا، کاتێک هاتە پێشەوە سەیرمانکرد پیکابێکی شین بوو پڕ لە سلق، ئنجا رۆیشتین بۆ مالەکانی پشتەوە بۆ مالە موهەندیسەکانی گردەکە، بەرانبەر رعایە شەباب، ئەو ناوەشمان هەمووی نووسی تا پەمپەکان تەواو بوون، خەریک بوو دنیا رووناک دەبۆوە هاتینەوە بۆ مالی جەزا، سەیرمانکرد کاک ئەحمەد لەسەر گۆشەی مالەکەیان وەستاوە چاودێریمان دەکات، وتمان: بۆ هاتویتە دەرەوە؟، وتی: ئێوە لە دەرەوە دیوار بنووسن بەلام من بێخەم بخەوم؟ ، رۆیشتینە ژوورەوەو پاش کەمێک، من بەو بەیانیە بەتەکسییەک رۆیشتمەوە بۆ مالی خۆمان.

لە شەقامی ئیبراهیم پاشا لە تەکسییەکە دابەزیم و بەرەو مالەوە رۆیشتمەوە، دایکم و هیوای برام بەو بەیانی زووە لە کۆلانەکەی خۆماندا وەستابون، کە من دەرکەوتم رۆیشتنە ژورەوە، وتیان:

- ئەوە تۆ ماوی؟
- بەلێ، هیچ بووە؟
- نەوەللا هیچ نەبووە! جا لای تۆ چی بووە؟

- دایكم وتی: ئەمشەو ئەم شارە بووە بە ئاگر باران، هێشتا هیچ ڕووینەداوە، تومەس ئەو شەوە پێشمەرگەش هاتبوونە ناوشار لە چەند مۆڵگەیەكی دوژمنیان دابوو، ماڵی ئێمەش كە گوێیان لەتەقەكان دەبێ لەترسا تا بەیانی نەخەوتبوون، خەمی منیان بوو.

بۆ ڕۆژی دوایی ڕۆیشتم بۆ گەراجەكەیان، كاك ئەحمەد خۆی دانیشتبوو، ڕێزیكی زۆری لێگرتم، دەستخۆشی شەوی پێشووی لێكردین، وتی: بەڕاستی نیشێكی باشتان كرد، ئەو جادە سەرەكییەتان نوسی، ئەوانە حكومەت بێزارو تووڕە دەكەن.

كاك ئەحمەد، پیاوێكی بە هەڵوێست بوو، نەمبینی ڕۆژێك بەربەست بێت لەبەردەم كوڕەكانیدا بۆ كاری ڕێكخستن، هەمیشە خۆی هانی دەدان بۆ نیشكردن، ئەوەی من دەمبینی و ڕۆژانە دەڕۆیشتم بۆ ئەو شوێنەیان دەتووت بارەگایە، خۆشی هەمیشە لە حەوشەی گەراجەكەدا دادەنیشت و ٤- ٥ كورسی دادەناو زۆربەی پیاوی بەڕێزو كەسایەتی شار سەردانیان دەكردو باسی ژیانی ڕابردووی سلێمانی و كوردایەتیان دەكرد، هەمیشە لای كاك ئەحمەدم بە تەنیا نەدەبینی، زیاتر مامۆستا خالد دلێری شاعیر دەهات بۆ لایو كۆڕی قسەیان گەرم دەكرد، من وەكو خۆم قەت لێی بێزار نەدەبووم، چونكە ئەوەندە بەڕێز بوو ئەوەی نەدەزانی ئەمە گەورەیە یا گەنجە، قەت وەكو باوك لەگەڵ كوڕەكانی نەبوو، هەر وەكو هاوڕێ لە گەڵیاندا دادەنیشت، یەكێك بڕۆیشتایە بۆ لای ئەوەندە ڕێزی لێدەگرت ئەو كەسە شەرم دایدەگرت، نازانم چۆن باسی ئەو پیاوە بەڕێزە بكەم.

ئێستاش ئەوەندە هەڵسوكەوتی لەبەر چاومە تا مردنی خۆم بیرم ناچێتەوە.

له کۆبوونەوەیەکدا جەزا وتی: دەبێت پەیوەندی بکەیت بە ٢ هاوڕێی ترەوەو شانەکان پڕ بکەیتەوە، ئنجا ناونیشانی ٢ هاوڕێی دامێ.

یەکێکیان لە دوکانێک بوو تەنیشت چێشتخانەی عەلی سوور، ڕۆیشتم بۆ لای پەیوەندیم پێوە کرد، ناوی خۆی پێوتم: هەڵکەوتی عوسمان مەجید، برای ڕێکەوتی عوسمان مەجید، ئەم هاوڕێیە زۆر خۆشبوو، لەگەڵ باسی وانە خوێندنم لەلا دەکرد دەیوت: لایبە براکەم باسی ٢ قسەی خۆش بکە، خوێندەواریشی کەمبوو، کەسێکی زۆر قسەخۆش بە خێزانیش شۆڕشگێڕ بوون، برای شەهید شادمانە کە لەزیندانی موسڵ لەسێدارە درا، دوایش بوو بە پێشمەرگە، پاشان بە ماڵو منداڵەوە ڕۆیشت بۆ لەندەن.

هاوڕێکەی تریشیان بەهرۆزی دەروێش غەفور، ئەمیش کەسێکی باشو دڵسۆز، حەزی بە کاری ڕێکخستن دەکرد، هەرچەندە لەوەو پێشیش پێشمەرگایەتی کردبوو، ماوەی ٤ مانگ مایەوە، ئەم هاوڕێیانە حەزیان لە ئیشوکار بوو، بەڵام ئەمانیش وەکو ئەوانی تر بێزار بوون لە ڕاپۆرتو وانەخوێندن، ئەیانووت: ئێمە حەزمان لە چالاکی و بەیانات بڵاوکردنەوەیە، بەهرۆز دوایی ڕۆیشت بۆ شاخ و پێشمەرگەیەکی خۆڕاگرو ئازا بوو، لەدوای ئەنفالەکان ڕۆیشت بۆ پاکستان لەگەڵ عەلی بچکۆل و ئەوان، لەوێوە ڕۆیشت بۆ (نیوزلاند)، پاشان گەڕایەوە بۆ کوردستان و ڕۆیشتە بەرنامەی کەشکۆڵ، چونکە لەوەو پێشیش حەزی لە شانۆ بوو.

* * *

پاش ماوەیەکی تر هەمدیسان چەند هاوڕێیەکی تریان پێناساندم، بەم ناوانە

١- یاسین عەبدوڵڵا.
٢- نەریمان سەلام (دکتۆر نەریمان).
٣- حسێن موراد.
٤- دلاوەر عەبدوڵڵا، دوای ئەوان پەیوەندی کرد.

یاسین و دلاوەر برا بوون، ئەمانە کوڕانی عەبدوڵڵای پێڵاو فرۆش بوون ماڵیان لە ئازادی بوو لە خوار ماڵە شەهیدەکانەوە، بە منداڵی ماڵیان لە گەڕەکی خۆمان بوو پاشان ماڵیان ڕۆیشتە ئازادی، لەبەرئەوە ئەم ٢ برایە بە خێزانی دەمناسین، دکتۆر نەریمانیش لە قۆناغی خوێندنی ناوەندی گۆیژە بەیەکەوە بووین، ئەویشم دەناسی، ئەمانەشم کرد بە شانەیەک، کۆبوونەوەمان لە ماڵی یاسین دەکرد.



یاسین عەبدوڵڵا



دلاوەر عەبدوڵڵا



حسێن موراد



نەریمان سەلام

ڕۆژێک عەلی هات بۆ لام ، وتی: حاجی دەڵێت با چالاکییەک بکەین، منیش وتم: کاکە ئێمە وا زوو ، زوو دەمانچە هەڵدەگرین ڕۆژێک توشی کێشەیەک دەبین، وتی: تۆ دەمانچە هەڵمەگرە من و حاجی پانتۆڵمان لە پێدایە ، دەمانچەکان قایم هەڵدەگرین.

بۆ ڕۆژی دوایی لای خانەقا یەکمانگرت و ڕۆیشتین بۆ بازاڕ، زۆر گەڕاین هیچمان دەست نەکەوت، بۆ ڕۆژی دواتر ڕۆیشتینەوە بۆ لای مەیدانی ماستەکەو ئنجا لە مەزادخانەکەوە ڕۆیشتینەوە بۆ گوزەری دارتاشەکان، سەربازێکمان بینی کلاشینکۆفێکی مزەلی پێبوو ئێمەش دوای کەوتین، خۆیکرد بە کەبابخانەکەی عەباس ئەبو شواربدا، هاتینە ئەملاوە حاجی وتی: چەکەکەی لێدەسەنین، ئێمەش ڕۆیشتینە ناو کەبابخانەکە، سەربازەکە زۆر سڵی دەکردەوە چەکەکەی لەسەر مێزەکە دانابوو، ڕووەو خەڵکەکە لە گۆشەیەکی ئەو سەرەوە دانیشتبوو، ڕۆیشتینە دەرەوەو هاتینەوە سەیرمانکرد نانەخوات، ڕۆیشتینو لەولاوە وەستاین حاجی بە عەلی وت: چەکەکەی لێدەسەنم ئەگەر دەستی کردەوە تۆ بیکوژە، دوای نانخواردن سەربازەکە هاتە دەرەوەو ڕۆیشتە چایخانەکەی ئەو بەرەوە دانیشت و داوای چای کرد، عەلی و حاجی ڕۆیشتنە ژوورەوە، سەربازەکە هێشتا دەستی بە چاکەوە بوو چەکەکەشی لەبەردەمیا دانابوو حاجی دەمانچەی لێڕاکێشا، عەلی پەلاماری چەکەکەی داو ڕایکرد بەرەو گوزەری ئاسنگەرەکان، حاجی بە دوای عەلی دا ڕایکرد، منیش بە دوایانا، حاجی ئیشارەتی بۆ من کرد نەڕۆم بە دوایانا، لای حەمامی سوورەت پەڕینەوە بۆ کۆڵانەکانی ئەو بەرەوە لەوێوە دەرچوون، خەمم لێهات دەمووت ئێستا تووشی ڕووداوێک دەبن. منیش ڕۆیشتمەوە بۆ ماڵی خۆمان.

شەو عەلی هات بۆ لام، وتی: بە سەلامەتی دەرچووین، چەکەکەش لای حاجی یە.



کۆتایی مانگی ٨ لە ماڵی خۆمان هاتمە دەرەوە، کاتژمێر ٥ ی ئێوارە لای مزگەوتی حاجی مەلا شەریفی سەعاتچی وەستا بووم، عەلی هات بۆ لام شپرزە دیار بوو.

وتی: ئەمڕۆ لەگەڵ حاجی هاتینە دەرەوە بێین بۆ لای تۆ، لە فولکەکەی خوار خانەقاوە (فولکەی دەستارەکە) ویستمان بپەڕینەوە کەوتینە ناو بۆسەی قوات خاسەو جەیشی شەعبییەوە، حاجی ڕۆیشتە بەردەمیان، تەفتیشیان کردو دەمانچەکەی پێگیرا، ئەو کەسەشی گرتی قاسمە ڕەشی قادسیە بوو، منیش خێرا گەڕامەوە، ڕامکردو خۆم دەرکرد، هاتووم ئاگادارت بکەم.

ئەو شەوە عەلی نەڕۆیشتەوە بۆ ماڵی خۆیان لە ماڵی ئێمە خەوت، خەمی ئاکۆ لەولاوە ئنجا خەمی حاجیشی هاتە سەر.



بۆ بەیانی عەلی ڕۆیشت بۆ بازاڕ، وتی: هاوڕێیانی سەروو خۆمان ئاگادار دەکەمەوە، عەسرەکەی هاتەوە بۆ لام زۆر بێزار بوو، وتی:

- ئەوەندەم قسە خواردووە نەبێتەوە.
- کێ قسەی پێوتیت.
- سەروو خۆم.
- ئەی ئەگەر سەرکەوتوو بوینایە ماچیان دەکردین و دەستخۆشییان لێدەکردین.

- وتی: ئەوان لەبەر بەرژەوەندی ئێمە قسە دەکەن، ئەگەر ئەو کەسە دەناسی کێیە؟ بڕوا ناکەم هەموو شۆڕش دڵسۆزێکی تری وەکو ئەوی تیا بێت، وەپێشیان وتم جارێ تا ماوەیەک چالاکی نەکەن، چاوەڕوانبن بزانین حاجی چی بەسەر دێت، زۆر ئاگاداری خۆتان بن، چ لە ماڵەوە چ لە ڕێگاوباندا، نابێت بە هیچ بیانوویەک دەمانچە هەڵگرن.

## ٣٠ / ٨ / ١٩٨٣ پەردە لادان لەسەر پەیکەری کاوەی ئاسنگەرو شەهیدکردنی هاوڕێ عەبدوللا

- ٣٣ -



ئەوکاتە زۆربەی هاوڕێیان دوای نیوەڕوان لە چایخانەیەکی سەرو سەراوە کۆ دەبووینەوە بۆ یەکتر بینین و قسەکردن، ئێمەش ئەو ڕۆژە کۆمەڵێک هاوڕێی خوێندکار لەوێ بووین، دەنگ و باس هەبوو پەردە لادەدرێت لەسەر پەیکەری کاوەی ئاسنگەر، وە نیاز وایە ڕۆشنبیران و ئەدیبان و مامۆستایان و خوێندکارانی هونەرەجوانەکان ئامادە بن، بە ئامادەبوونی پیاوانی ڕژێمو چەندەها کەسایەتی تر، ئەو پەیکەرە لەسەر ئەرکی عەلی بۆسکانی دروستکرا، ئێمەش خۆمان ئامادەکرد بڕۆین بۆ ئەوێ بەشدار بین لەو مەراسیمە.

قوات خاسەی زۆر ئەو دەوروبەرەیان گرتبوو، ویستمان بەرەو فولکەی کاوە

برۆین، دەستكرا بە تەقەكردن، دەنگ بڵاوبووەوە لە فلكەی كاوە شەڕو پێكدادان دروستبووەو خۆپیشاندانە، ئێمەش كۆمەڵێك خوێندكار بەرەو ڕووی تەقەكان بەشەقامی پیرەمێردا سەركەوتین، چواردەوری فلكەی سجن و تا ئیبراهیم پاشا گیرا بوو، قوات خاسەیەكی زۆر بڵاوبوبونەوە، ئەوەندەمانزانی بوو بەفرِكان فرِكان، كوڕێكی گەنج  بە شپرزەیی هاتە خوارەوە، پرسیارمان لێكرد وتی: خەڵكێكی زۆر كۆ بوبووەوە لە چواردەوری پەیكەرەكەی كاوە هەر ئەوەندە پەردەیان لەسەر لابرد، بوو بە هووتاف كێشانو سروود وتن، جەیشی شەعبی و جاشەكانیش لە منەزەمەكەوە دەستیانكرد بە تەقەكردن بە ناو خەڵكەكەدا، ئنجا بوو بە خۆپیشاندان و چەند پیكابێكی قوات خاسە شوێن خەڵكەكە كەوتن بەرەو شەقامی ئیبراهیم پاشا.

ئێمەش هەر وەستا بووین لای فولكەی سجن چاوەڕوانی قوات خاسەكانمان دەكرد برِۆن، بەڵام ئەوان هەر زیاتر دەبوون، گەنجێكی تر هات، وتی:

- لە كۆڵانە پانەكەی سەرو شەقامی ئیبراهیم پاشا قوات خاسەكان شوێن گەنجێك كەوتن و كوشتیان، ئێستا تەرمەكەی لەویادا كەوتووە كەس ناوێرێت بەلایدا برِوات .

ئێمە بەرەو سەرا ڕۆیشتینەوە، پاشان بڵاوەمان لێكرد، ئەو ئێوارەیە سلێمانی بۆنی خوێنی لێدەهات.

بۆ ڕۆژی دوایی بەرەو بازاڕ ڕۆیشتم، بەلای دووكانەكەی نەورۆزی قالە بەرازدا، نەورۆز بانگی كردم، وتی: دوێنێ لە خۆپیشاندانەكەی فولكەی كاوەی ئاسنگەر هاورِێ عەبدوڵڵای ئەندام شانەی خۆمان شەهید كراوە، وتی: زۆر بە دڵگەرمی ڕۆیشتووەتە پێشەوەو دەوری باشی بووە لەناو خەڵكەكەداو، قوات خاسەكانیش دەستنیشانیان كردووەو لەكۆڵانە فراوانەكەی شەقامی ئیبراهیم پاشا شەهیدیان كردووە، بە بیستنی ئەو هەواڵە زۆر بێزار بووم، گەنجێكی ئاوا جوان بووە قوربانی ڕژێمێكی بۆگەن و دەستی خۆیان پێ سوور كرد، لەویاشدا شەهیدێكی قارەمانمان بەخشی، دوای چەند ڕۆژێك سەر لە بەیانی بە شەقامی ئیبراهیم

پاشادا ڕۆیشتم بەرەو تووی مەلیک سەیرمکرد پەیکەرەکەی کاوەی ئاسنگەر بە شۆفڵ تێکیان شکاندووەو خستوویانە، ئنجا بۆم دەرکەوت کە ڕژێم چەند داخ لە دڵ بووە بەرانبەر دروستکردنی ئەو پەیکەرەو خەڵکی سلێمانی، بۆیە ئەو ڕۆژەش ئەو کارەساتەی دروستکردووە، بە نیاز بوو نەهێڵێت ئەو پەیکەرە لەویادا بمێنێت، چونکە سنبولی میللەتی کوردە.



پەیکەری کاوەی ئاسنگەر بەڕوخاوی

٩/١٥ له ڕێکخراوەوە پێمڕاگەیەنرا نامەیەک بەرم بۆ ڕێکخراوی ٣ له دۆڵپەموو، جەزا وتی: سبەینێ کاتژمێر ٦ ی بەیانی ئامادەبیت.

منیش شەو دایکم ئاگادار کرد کە سبەینێ کاتژمێر ٥ ی بەیانی ئەڕۆم بۆ لای جەزا کاری گرنگم هەیە ئاگادار بە، ئەگەر شەو نەهاتمەوە خەمت نەبێت.

بۆ سبەینێ بەیانی زوو ڕۆیشتم بۆ لای جەزا، بەیەکەوە ڕۆیشتین لەڕێگا نامەیەکی بچووکی دامێ، وتی: ئێستا دەڕۆین بۆ ژێر پردەکە پیکابەکانی شاربازێڕ لەوێ دەوەستن سوار پیکابێک ببەو بڕۆ بۆ چنگیان، لەوێوە بە پێ ئەڕۆیت بۆ گوندی باراو، پاشان لەوێوە دەڕۆی بۆ گوندی دۆڵپەموو بۆ ڕێکخراوی ٣ کاک هەڵۆی برام لەوێیە، ئەم نامەیەی تەسلیم دەکەیتو وەڵامەکەی دەهێنیتەوە.

له گەراجەکە پیکابێکی شۆفرلێتی شین وەستابوو دەڕۆیشت بۆ چنگیان منیش لەپێشەوە سوار بووم دواکەشی هەمووی سندووقە ترێ و تەماتە بوو.

کە گەیشتمە چنگیان له کەسێکی گوندەکە پرسیاری گوندی باراوم کرد، ڕێگاکەی پیشاندام، منیش ملی ڕێگام گرت و پاش نیو سەعات گەیشتمە ناو گوندی باراو، یەکەم ماڵ لەژنێک پرسیاری ماڵی کاک شێخ عەبدولی خزمم کرد، ژنی شێخ عەبدول خۆی بوو، وتی: فەرموو ئێرەیە، منیش زۆرم برسی بوو خۆم پێناساند (چونکە نەیدەناسیمەوە)، بەڕاستی خولکێکی زۆری کردم ڕۆیشتمە سەرەوە بۆ ماڵیان، ٢ ئافرەتیش دانیشتبوون، وتیان:

- ئێمە دایکی پێشمەرگەین، هاتوین بۆ لای کوڕەکانمان، ماڵیان ئاوا بێت ئەم ماڵە دالْدەیان داوین .

پاشان میناخان سینیەک خواردنی هێنا برنجو شلەی بامێ وتی: نابێت ئێوارە بڕۆیت دەبێت لای ئێمە بیت شێخ عەبدولیش لەولای ئاواییەوە خەریکی ترێ ڕنینە ئێوارە دێتەوە، وتم: دەبێت بڕۆم بۆ دۆڵپەموو بۆ سەردانی ئەو خزمانە.

دوای نانخواردن ڕۆیشتمە ناو گوندەکە، حەمە جەزای هونەرمەند لەگەڵ ٢

پێشمەرگەدا بەرەو ڕووم هات، سڵاویان لێکردم وتی: ئەم گەنجە خەڵکی ئەم ناوە نیە؟! بابڕۆینەوە چا ئامادەیە، منیش ڕۆیشتم چایەکم خواردەوە، وتم: ئەڕۆم بۆ دۆڵپەموو، وتی: ئێستاو دۆڵپەموو؟! زۆر درەنگەو ڕێگاش شارەزا نیت؟! ئنجا ئیشارەتی کرد بۆ ٢ پێشمەرگە لە خوار گوندەکەوە دەڕۆیشتن، وتی: ئەوانە دەڕۆن بۆ چنارەی لای حاجی مامەند، فریایان بکەوەو لەگەڵ ئەوان بڕۆ شارەزان و ڕێگاکەت پیشاندەدەن.

بە ٢ پێشمەرگەکە گەیشتمەوە، بووین بەهاوڕێی ڕێگا، وتیان: ئەم شاخە ناوی سییەرە ئەمە ببڕین باقییەکەی ئاسانە، شاخی سییەرمان بڕی، ئەو ٢ پێشمەرگەیەی لەگەڵیان ڕۆیشتم، یەکێکیان ئەدهەمی برای دلێری سەید مەجیدو ئەوی تریان کاک عوسمان پێشمەرگەی لای مەلا بەختیار بوون، لە ڕێگا لەیەک جیابووینەوە ئەوان ڕۆیشتن بۆ گوندی چنارەو ڕێگاکەیان بۆمن دەستنیشانکرد.

لە ڕێگا زۆر بە خێرایی دەڕۆیشتم تا گەیشتمە گوندەکە تاریکی کرد، پرسیاری ماڵی هەڵۆی ئەحمەد کوردەم کرد، نیشانیاندام و ڕۆیشتم بۆ ماڵیان، خۆم پێناساندو نامەکەم دایە، کاتی نانخواردنی ئێوارە چەند پێشمەرگەیەک لە ماڵیان بوون، شەو تا درەنگانێک دانیشتین و مناقەشەمان کرد.

ڕۆیشتم بۆ مزگەوت کۆمەڵێک پێشمەرگە وەستابوون، یەکێکیان ئارپیجییەکی پێبوو منیش سڵاوم لێکردن، سەیرمکرد کاوەی خزمی خۆمە کاوەی شێخ عەلی دۆڵپەموو باوەشمان بەیەکدا کرد، وتی: دەبێت ئەم شەو لای من بیت، بۆ خۆمان کات دەبەینەسەر، وتم: لە ماڵی کاک هەڵۆم.

دوایی ئیزنم لە کاک هەڵۆ وەرگـرت، لەگەڵ کاوە ڕۆیشتم بۆ مقەڕەکەی ڕێکخراوی ٣ کۆمەڵێک پێشمەرگەی تری لێبوو، لەگەڵ کاوە هەتا درەنگێک بەیەکەوە قسەمان کرد.

بۆ بەیانیەکەی وەڵامـی نامەکەی ڕێکخراوم وەرگـرتـەوەو بە سەیارەیەک گەڕامەوە.



هەلۆی ئەحمەد کوردە          ڕەئووف شێخ جەمیل

هۆڵەندا- ئەنشخدەی ساڵی ١٩٩٩

٢ ڕۆژ دوای ڕۆیشتنم بۆ ڕێکخراوی ٣، جەزا عەسرێکی درەنگ هات بۆ ماڵمان، کۆمەڵێک بەیاناتی زۆری بۆ هێنام، منیش وتم: جا بەم ئێوارەیە چۆن دابەشی بکەم، هاوڕێیان هەر یەکەیان ماڵیان لە شوێنێکە، دنیا هەور بوو ڕۆیشتم بۆ ماڵێکی دراوسێمان تەلەفۆنم کرد بۆ عەلی وتم: وەرە بۆ لام زۆر زەروورم پێت، پاش چارەکێک عەلی بە ماتۆڕەکەی هات، پێموت: بەیانێکی زۆرم بۆ هاتووە، دەبێت هەر ئێستا دابەشیان بکەم، بەیانەکانم خستە ناو کارتۆنێکی سابوونەوە بە دوای ماتۆڕەکەدا بەستم، بۆ ئەوەی پیاوانی ڕژێم هەستنەکەن بە بیجامەو جوتێ نەعلەوە ماتۆڕەکەم لێخووڕی، عەلی لە دواوە سوار بوو کە نزیک دەبوومەوە لە ماڵی هاوڕێکان عەلی لە شوێنێکی تر دادەبەزی بۆ ئەوەی یەکتر نەناسن، یەکەم شوێن بردم بۆ شەهیدانی ئازادی، پاشان بردم بۆ ماڵی هاوڕێ سەرتیپ، لەوێوە ڕۆیشتین بۆ فولکەی کانێسکان، بەبێ وەستان بە فولکەکەیا ڕۆیشتم، ئاگام لە مرۆورەکە نیە دەستی ڕاگرتووە، هەمووی ٤٠ مەتر دوور نەکەوتینەوە بۆ سەرەوە ماتۆڕێکی مروور گەیشتە سەرمان، هەر لە ناوەڕاستی جادەکەدا وەستاندمی، بەتوڕەیی ماتۆڕەکەی کوژاندەوەو کلیلەکەی لێکردەوەو وتی: دابەزن، دەستیکرد بە قسەکردن، ئێمەش خەیاڵی ئەوەمان نەبوو سەرپێچیمان کردووە، بە توندی بەرپەرچم دایەوەو وتم: چییە بۆ وادەکەی؟

- هێشتا تۆش قسە دەکەیت؟! دابەزەو ماتۆڕەکە دابنێ.
- کاکە بڕوا بکە هیچ نازانم کە سەرپێچیم کردبێت!!
- ئەو مروورە دەستی ڕاگرتبوو بۆ نەوەستای؟
- بڕوا بکە نەمبینیووە.
- بۆ کوێریت؟
- ئەڵێم بڕوا بکە نەمبینیووەو داوای لێبووردن دەکەم .
- ئەڵێم ماتۆڕەکە دابنێ و بڕۆ.

دەستیکرد بە قسەی ناشیرین پێمان، ئێمەش لەبەر بەیانەکان خەممان لێهات قوات خاسەو پۆلیس بێت بەسەردا، زۆر تەکلیفمان لێکرد سوودی نەبوو، ماتۆڕەکەش بەمخالفی لەسەر جادەکە بوو، ئەوەی باشبوو ئەوکاتە ئەوەندە

سەیارە نەبوو تا ڕێگا بگرێت، زۆرمان پێوت سوودی نەبوو، وتی: ئێستا جیهاز دەکەم بێن ماتۆڕەکە ببەن، عەلی زۆر قسەی کرد کە ئیشمان هەیەو داوای لێبووردن دەکەین، کاکی مرور وازی نەهێنا، عەلی کەوتە هەڕەشەکردن، ئەڵێم ئیشمان هەیەو داوای لێبووردن دەکەین، تێگەیشتی؟! با پێت بڵێم یەک شت ببێت هەروا بە ئاسانی لە دەستمان دەرناچی.

مروورەکە ئەوەندەی تر شێت بوو لێمان خەریک بوو جیهاز بکات.

- عەلی وتی: یەک شتمان لێبێت تۆ بەرپرسیاریت ڕێگەمان بدە با بڕۆین، بەیانێکی لەکارتۆنەکە دەرهێناو دایە دەستی مروورەکە.

وتی: ئێمە دەڕۆین با کەشف ببین، ئنجا خۆت دەبینیتەوە، کە مروورەکە بەیانی بینی، ڕەنگی زەرد بوو، کەوتە پاڕانەوە، بە قوربانتان بم، بە ساقەتان بم، زۆر داوای لێبووردنتان لێدەکەم، وەڵڵاهی وامزانی کارتۆنە سابوونە، بڕۆن بە قووربانتان بم با شتێک نەبێت، بۆ زووتر قسەتان نەکرد ئیزنم بدانایە.

کلیلەکەی داینەوە، عەلیش وەرینەنەگرت.

مروورەکە وتی: وەڵڵاهی ڕووی دەمم لە ئێوە نەبێت وامزانی شەلاتی و شتی وان، بۆیە منیش وامکرد.

ئنجا ئێمە لە کۆڵی نەدەبووینەوە، وتی: بە قووربانتان بم نەک جارێک سەد جار بەس بڕۆن.

وتمان: یەک غەڵەت بکەیت یان شتێک ببێت پاشی ١٠ساڵی تریش بێت دەتناسینەوە، وتی: بەخوا منیش وەکو ئێوە کوردم، بە قوربانتان بم بەخوا هەر نازانم ژمارەی ماتۆڕەکەتان چەندە، بڕوا بکەن من لە ئێوە دڵسۆزترم.

وتمان: بگەڕێرەوە تا ئێمە دەڕۆین.

کە ڕۆیشتین عەلی هەر ئاوڕی دەدایـەوە ئەیوت نەک شتێک ببێت، ئنجا بەیاناتەکانمان برد بۆ زەرگەتە بۆ ماڵی هاوڕێ بەهێزو ئەوان دابەشمانکردن.

* * *

هەر ئەو شەوە ئەو کۆمەڵە بەیانەی کە دامنابو بۆ خۆم، بە باوکمم ووت: لە سەعات ٣ دا هەڵمسێنێت دەبێت بڵاویان بکەمەوە، خۆشم خووم بەوەوە گرتبوو ئەو شەوەی ئیشم ببوایە یان بەیانم بۆ بهاتایە، خەوم لێنەدەکەوت لە سەعات

٣ هەستام، دایکیشم هەستاو وتی: ڕۆڵە ئاگات لە خۆت بێت، ڕۆیشتم بە کۆڵانو شەقامەکاندا دەستمکرد بە هەڵواسینیان نیوەیانم خستە ماڵانەوە، (ئەوە پیشەی یەکەم و دووەم شەوم نەبوو بەڵام ئەمانەی دەیانگێرمەوە گوڵبژێری ئەو کارەساتانەن کە ڕوویان دەدا)، لای خوارووەوە بەرەو ناوەندی ژین ڕۆیشتم بە دەرگاکەی لای خوارووی خوێندنگەکە کۆمەڵێکم هەڵواسی، خوێندنگەکە تازە کرابووەوە بۆ خوێندنی ساڵی١٩٨٣ -١٩٨٤ منیش لەبەر خوێندکارەکان هەڵمواسین کە بیخوێننەوە، چونکە خۆمان سەر بە کەرتی خوێندکاران بوین، وا پێویستی دەکرد بۆ خوێندکاران تێبکۆشاینایە، پاشان ڕۆیشتم بۆ لای دەرگای سەروو لەبن دیوارەکانەوە سەیری شەقامی ئیبراهیم پاشام کرد هیچ دیار نەبوو، سەیری ئەملاو ئەولام کرد هیچم نەبینی، دەستمکرد بە هەڵواسینی بەیانەکان بە دەرگای خوێندنگەکەدا، کاتێکمزانی لەسەربانی خوێندنگەکەوە دەستکرا بە تەقەکردن لێم، هەر ئەوەندەم پێکرا بەیانەکانم فرێداو ڕامکرد بۆ خوارەوە ڕووەو گەڕەکی مەڵکەندی، لەوێوە ڕامکرد بۆ گەڕەکی حاجیحان، لەو دیوەوە سەر کەوتمەوە سەیرمکرد یەکێک بەرەو ڕووم ڕا دەکات، منیش گەڕامەوە بۆ دواوە، هاواری کرد: ڕەئووف دایکتم.

سەیرمکرد دایکمە باڵی گرتووە بە دوامدا.

- وتم: بۆ هاتیت بگەڕێرەوە.

وتی: با بڕۆین بۆ کۆڵانەکانی خوارەوە، وا بزانم دابەزین بۆت.

- وتی: لە دەشتەکەی لای ماڵی خۆمان وەستابووم کە تەقەکانت لێکرا چاوم لێبوو، کە تۆ ڕاتکرد بۆ خوارەوە، منیش لە تاوی تۆ ڕامکرد زانیم لێرەوە دێیتەوە، با بڕۆین بۆ خوارەوە نەک بەدواتەوە بن.

بە خێرایی بۆ کۆڵانەکانی پشتی مزگەوتی حاجیحانەوە ڕۆیشتین، لەولاوە گەڕاینەوە بۆ ماڵی خۆمان .

- کاتێک ڕۆیشتینەوە بۆ ماڵەوە باوکم لەسەر بەرماڵ دەپاڕێتەوە.

دایکم هەموو گیانی دەلەرزی، دەرگامان داخست، دەستیکرد بەگریان، وتی:

- بە خوا بەهۆی تۆوە ژیانمان نیە، بۆ ئەو خوایەت بکردایە نەتدەکرد، بۆ

باوکتت بکردایه نەتدەکرد، بەخوا تۆ هەموومان بە کوشتن دەدەیت.

منیش هەر هێواشم دەکردنەوە هیچ نیە بە قوربانتان بم، هیچ نەبوو تەقە لە من نەکرا.

بۆ بەیانی دایکم نانو چای ئامادە کردبوو، وتم: هەستاوی؟

- جا تۆ دەهێڵیت کەس لەمماڵەدا بخەوێت، وەڵڵاهی توشی هەزار نەخۆشیت کردووین، توشی سیل و سەرەتانت کردووین، تووخوا ڕەئووف ئەمە ئیشە تۆ دەیکەیت؟ شەوێک نیە دوان نیە؟! ئیسراحەتمان لەبەر هەڵگیراوە بەهۆی تۆوە، وتم:

- دایە گیان ئەوەش دەبێت ! ئەمە شۆڕشە، شۆڕش.

- ناوجەرگی ئێمەتان خستۆتە خوارەوە، ئەمە شۆڕش دەکەن، تۆ منداڵ بوویت لە زەمانی زەعیم سدیقەوە ئەم بەزمە هەیە، وتم خوایە شکور ئەمەیانم منداڵە، هەتا ئەمە پێدەگات هیچ نامێنێت، ئەوا تۆش گەورە بوویت، بەیەکجاری تۆ بۆمان بوویت بە سەرەتان، هەتا کاکت بوو کاکت ئنجا نۆرەی تۆیە.

- باوەشم کرد بە دایکما وتم: باشە تۆ واز لەوە بهێنە، بەس پێم بڵێ چۆنت زانی؟، وتی:

- بەخوا هەموو شەوێک دوورو نزیک دوات دەکەوم، کە ئەڕۆی ئەڵێم نەک شتێکی بەسەربێت با ئاگام لێی بێت.

کردم بە پێکەنین وتم: جا دایکم نەبویتایە.

- ئەی قووڕ بەسەری من ئنجا دایکی عەلی و جەزا، بە دەست ئێوەوە تووخوا ئەوە ژیانە ئێوەی تێدان، هەر شەوەی لە ماڵێک دەخەون، وەڵڵاهی نازانم تۆم هەی یان نا، وا دەستم لێشتووی، خوا بیکا لەسەری باوکتو براکانتی لایا، بە گەورەیی خوا کە جەزا دێت بۆ ماڵمان تا ناوقەدم وشک دەبێت، ناشوێرم قسە بکەم، کە وڕەی ماتۆڕ دێت هێزم تیا نامێنێت، ئەڵێم عەلی هات خوایە هیچ نەبووبێت.

(ئێستاش ئەو بیرەوەرییانەی ئەینووسمەوە هەمووی قسەی دایکمەو لە دڵو دەروونو مێشکما چەسپ بوون و دەرناچن).

ڕۆژێک لە خوێندنگە عەلی پێی وتم: دەبێت ئەم دوانیوەڕۆیە لە بازاڕ یەکتر ببینین، بۆ کارێکی گرنگ، لەم ڕۆژانەدا ئەو هاوڕێیەی خۆمانم بینی قسەمان زۆر کرد دەربارەی ئیشو کارو چالاکی، وتی: پەلەتان نەبێت منیش وتم: ئەگەر حاجی ئیعترافی بکردایە هەتا ئێستا شتێک دەبوو، بەڵام تازە هیچ نابێت، ئێمە بە نیازی ئیشینو دەمانەوێت چەند چالاکیەک بکەین، ئەویش بڕیاریدا کە هەردووکمان بەیەکەوە ببینێ، وتیشی لەوێوە دەڕۆین بۆ ماڵی حاجی بۆ لای دایکو باوکی تا کەمێک دڵنەواییان بدەینەوە.

کاتمان ڕێکخست دوانیوەڕۆ سەعات ٤ منو عەلی لای سەرا یەکمان بینیو ڕۆیشتین بۆ لای هاوڕێکەمان، لە جادەی کاوە خۆمان کرد بە چایخانەیەکدا، عەلی وتی: ئەمە چایخانەی ماردینە کە باسمکرد بۆت.

برادەرێک دانیشتبوو، سوورو سپییەکی موو زەرد زۆر ڕووی خۆشبوو، عەلی بە منی ناساند کاک کەمال، ئەمیش هاوڕێ نەریمان دانیشتین و من هەر سەیرمدەکرد، سەرو چامان خواردەوە، وتی: ئەڵێی نامۆ نیم لەبەر چاوتا.

ڕووم کردە عەلی وتم جار ناجارێک لە خوێندنگە ون دەبیتو دەڕۆی بەرەو خوار، ئەمە بۆ لای ئەم دەڕۆی، (دەستیانکرد بە پێکەنین).

- وتیان: بۆ چاودێری ئەمەشت کردووە.

- ئەی بەڕێزت موهەندسی بینای خوێندنگە تازەکەی خۆمانیت؟!

پاشان ڕۆیشتین بۆ ئەسحابەسپیو سانەوی کوردستان، کاک کەمال قسەکانی هەمووی لە بەرژەوەندی ئێمە دەکرد، باسی مانەوەمان لەناو شارداو درێژەدان بە خەبات، لێدان لە پیاوانی ڕژێمو مانەوەی خۆمان زۆر گرنگترە لەوەی بکەوینە بەردەستیان، پاشان بە منی وت: هاوڕێ نەمر (واتە عەلی) زۆر باسی تۆی کردووە خۆشم دەزانم کەسێکی دڵسۆزیت بۆیە منیش پێم خۆشبوو لە نزیکەوە بتناسم و قسەبکەین.

پاشان هاتینە سەر باسی ماتۆڕ وتی:

- هاوڕێ ئەمر دەڵێت: تۆ باش لە ماتۆڕ دەزانیت؟ وتم:

- بەڵێ، خۆشم لەراپۆرتەکەما ماتۆڕم نووسیبوو.

- زۆر باشە، ئێستا ئەمانەوێ چەند ئیشێک بە ماتۆڕ بکەین، بەڵام بەمەرجێک کاری بەرەڵلایی تیا نەبێت، کارێک بکەین ١٠٠ ٪ قازانجی خۆمانو ١٠٠ ٪ ش زیان لە ڕژێم بدەین، ئێستا دەمانەوێت چەند ڕوممانەیەک بە ناو سەیارەکانی پیاوانی ڕژێمدا بتەقێنینەوە، ئەویش دەبێت لەسەر ڕاهێنان کە چالاکیەکان چۆن بکەین، خۆشم هاوکارتان دەبم، ئێمە چەندەها ئیشمان کردووەو سەرکەوتووش بووین، پاشان وتی: با سەردانی ماڵی حاجی بکەین بۆ دڵنەوایی دایکو باوکی، چونکە نابێت بێوەفا بین بەرانبەر بەیەکتری.

بەرەو گەڕەکی خەبات ڕۆیشتین، خۆمان کرد بە کۆڵانێکی فراواندا لە پشتی فولکەی خەباتەوە عەلی لەسەری کۆڵانێک ئێمەی وەستانو خۆی ڕۆیشت دای لە دەرگای ماڵێک، ژنێکی ئەسمەری کورتە باڵا هاتە دەرەوە، عەلی ئیشارەتی بۆ ئێمە کرد، ئێمەش ڕۆیشتین بۆ ماڵیان، بەخێرهاتنێکی گەرم کراین، دوو ئافرەت دانیشتبوون عەلی پێمانی ناساندن، ئەمە ڕەعناخان دایکی حاجی، ئەمیش نەسرین خان خوشکی حاجی.

کاک کەمال قسەی بۆ دەکردین، هەمومان گوێمان ڕاگرتبوو بۆ قسەکانی.

دایکی حاجی وتی: کاک کەمال، خۆت دەزانی حاجی کوڕم چەند دڵسۆزەو چی کردووە، بەخوا بە عەلیشم وتووە کەس نەترسێتو ئیشی خۆتان بکەن، ئەگەر کوڕی من بێت قەت ئیعتراف ناکات .

دوای سەعاتێک دانیشتن و قسەکردن لای ئەوانمان جێهێشت، مەوعیدمان دانا بۆ ڕۆژی دوایی.

ڕۆژی دوایی لەگەڵ کاک کەمال و عەلی سەعات ٤ یەکترمان بینیەوەو ڕۆیشتین بەرەو هەمان شوێنی دوێنێ بۆ فولکەی گۆزەکان، لەوێوە گەڕاینەوە بۆ سانەوی سلێمانی، بڕیارماندا چەند چالاکییەک ئەنجام بدەین، کاک کەمال وتی:

- ئەم مەفرەزەیە ناوی «مەفرەزەی تۆڵە» یە هەرچی چالاکییەکیش بکەین بەناوی تۆڵەوە دەیکەین، چونکە ناوی ئەو مەفرەزەیە تازە نیەو لەوەوپێش هەبووە، لەبەر ئەوە ئێمەش بەناوی مەفرەزەی تۆڵەوە چالاکی دەکەین، بەڵام دەبێت ئاگاداری خۆمان بینو کاری لاوەکی نەکەین.

دوای ٢ ڕۆژ لەگەڵ عەلی ڕۆیشتین بۆ شەقامی کاوە، وتی: لێرە بوەستە، پاش کەمێک هاتەوە عەلاگەیەک بامێی پێبوو، وتی: تۆ بڕۆ بۆ سەرەوە، ئەگەر سەیارەی پیاوانی ڕژێم هاتن ! ئیشارەتم بۆ بکە، وتم:

- ئەی کاک کەمال ئاگادارە؟ وتی:

- لە دوێنێوە بەرنامە دادەنێت.

زۆر وەستام هیچ دیار نەبوو، پاشان لاند کرۆزەرێکی سپی هات، تابلۆکەی (داخلیە) ٤ کەسی تێدا بوو دوانیان جلی سەوزو دوانەکەی دواوە مەدەنی، هەمویان عەرەب بوون، منیش ئیشارەتم بۆ عەلی کرد، عەلی لە بەینی سەیارەکانی سەر شەقامەکەوە وەستابوو، ڕۆیشتە دواوە هەتا سەیارەکە گەیشتە لای، ٢ مەتر تێپەڕی عەلی لە دواوە بە خێرایی ڕوممانەکەی لە جامی ناوەڕاستەوە خستە ناو سەیارەکەوەو خۆی کرد بە قەیسەرییەکەی ئەو بەردا، ناڵە لە سەیارە بەرز بووەوە، منیش بۆ سەرەوە ڕۆیشتم، پاش کەمێک گەڕامەوە لە ئەسحابەسپییەوە سەیرمکرد خەڵک ئەو ناوەیان چۆڵکرد، شەقامەکە کەسی تیا نەما، ٢ پیکابی قوات خاسە گەیشتن، ئەو ناوەیان گرت، هەمدیسان ڕۆیشتم بۆ لای سەراوە لە دوور وەستام، ئنجا ٢ سەیارەی ئیسعاف هاتن، بوو بە هەرایەک نەبێتەوە، ئیتر من عەلیم نەبینیەوە.

بۆ ڕۆژی دوایی عەلی وتی:

- کاک کەمالم بینیوە دەستخۆشی لێکردینو دەنگو باسی وەرگرتبوو زیانێکی باشی دابوو سیانیان کوژرا بوون.

لە خوێندنگە جەزا پێی وتم بۆ سبەینێ دەبێت ئامادەبم.

١٩٨٣/١٠/١ بەیانی سەعات ٦ هەستام، کە ڕۆیشتم جەزا ئامادەبوو وتی:

- ئەم ٢ نامەیە جوان بیانشارەوە لە جلەکانتا، بە هەمان شێوەی جاری پێشوو ئەڕۆیت، لە ڕێگای چنگیانەوە بۆ حاجی مامەند خۆت برۆ بۆ سەیارەکانی گەراج پێویست ناکات من بێم لەگەڵتا.

ڕۆیشتم بۆ ژێر پردەکە، پیکابێکی سپی وەستا بوو سوار بووم و پاش کەمێک بەڕێکەوت، کە گەیشتینە چنگیان دابەزیم سەیارەیەکو چەند پێشمەرگەیەک وەستا بوون.

(مام ئەدهەم و کاک عوسمان، ئەو دوو پێشمەرگەیەی جاری پێشوو لەگەڵیان ڕۆیشتم بۆ دۆڵپەموو)، ئەوانیش وەستاون، وتم: دەڕۆن بۆ کوێ ؟، وتیان: لەگەڵ مەلا بەختیارین دەگەڕێینەوە بۆ حاجی مامەند بە هەندێک کاری پێویست هاتوین.

ڕۆیشتم بۆ لای مەلا بەختیار سەیرمکرد لەگەڵ عەلی هاوڕێم وەستاوە، کە بینیم سەرم سوڕما، (لە دڵی خۆما وتم عەلی چی دەکات لێرە؟!)، ویستم برۆم بۆ لایان عەلی بەسەر ئیشارەتی کرد کە نەڕۆم، منیش وەستام هەتا ئەو ڕۆیشت، پاشان ڕۆیشتم بۆ لای مەلا بەختیار خۆم پێناساندو نامەکەم دایە، وتی: با برۆینە ئەولاوە، نامەکەی خوێندەوە، وتم:

- ئەڕۆیت بۆ کوێ؟
- دەگەڕێمەوە بۆ حاجی مامەند.
- منیش دێم لەگەڵتا، نامەیەکی ترم پێیە بۆ مەڵبەند.
- بیدە بە من دەیگەیەنم.
- دەبێت خۆم بیگەیەنم و وەڵامەکەی وەربگرمەوە.
- باشە بەیەکەوە دەڕۆین، بەسەیارە کەوتینە ڕێ، مەلا بەختیار زۆر تیژڕەو

بوو ئێمەش لەدواکەیدا ئەوەندەمان تۆز لێنیشتبوو نەدەناسراینەوە، گەیشتینە گوندەکانی پشتەوە بەرەو گۆڕەدێم و کانی خێران، ئەوکاتە ترسی پارتی هەبوو لەوناوە، مەلا بەختیار دابەزی بەپێشمەرگەکانی وت:

- لێرەوە ئاگاتان لەخۆتان بێت، پێشمەرگەکان هەموو چەکەکانیان ئامادەکرد، مەلا بەختیار ٢ پێشمەرگەی لەگەڵدا بوو لە پێشەوەی سەیارەکە دانیشتبوون پێی ناساندمن، سەردار یەخی ماڵیو ئەوی تریشیان مستەفا دەمرکانی.

ئەم ٢ پێشمەرگەیە حسک بوون گەڕابوونەوە بۆ ناو یەکێتی، لەگەڵ مەلا بەختیار ڕۆشتینە ئەولاوە وتی: تۆ خۆت ئاشکرا مەکە چونکە پرسیاری تۆیان کرد وتم، هەر سوار بووە لەگەڵمانا، ئەو شوێنە چەمو ئاو بوو پێشمەرگەکان هەر یەکە بەلایەکدا بە دەستو دەم و چاو شۆرین خەریک بوون، منو مەلا بەختیاریش دەستمانکرد بە قسەکردن، وتم: ئەم سەیارە کۆنە چییە پێت؟

- هی مەڵبەندە بە ئەمانەت هێناومە.

- بە پێکەنینەوە وتم: ئەمە سووڕیشە هێناوتە.

- جا سەیارەیەکمان بۆ بێنن، ئێوە لە ناوشارن.

- بابڕۆمەوە، هەتا بتوانم بۆت دەهێنم، وتی:

- خۆم حەز ناکەم کەس توشی کێشە بێت، بە برادەرانی ناوشار بڵێم بۆم دەهێنن، ئێستا پێش تۆ یەکێکیان لەلام بوو لە چنگیان.

- ئەوەی لات وەستا بوو؟

- ئا، ئەوە.

زەردەخەنەیەکی پێکەنیناویم گرت.

- بۆ پێدەکەنی؟ ئەوە ئازاترین کەسی ناوشارە!

- عەلی!!

- عەلی ناوە یان ناوێکی تری هەیە؟!

- هاوڕێ نەمر!

- ئا، ئا، نەمر، تۆش دەیناسی؟

- من به نیازم لەگەڵ ئەو بۆت بهێنم ؟.

- ئەگەر بۆم بهێنن، چیتان پێویست بێت، لەچەکو پێویستی بۆتان جێبەجێ دەکەم.

- بابڕۆمەوە، قسەیەکی لێدەکەین.

پاشان سوار بووینەوە، بۆ شەوەکەی گەیشتینە گوندی پارەزان، خانوویەکی کۆنکرێتی تیادا بوو بۆ خەستەخانەی گوندەکە دروستکرابوو بەڵام چۆڵ کرابوو، ناو گوندەکە جمەی دەهات لە پێشمەرگە (چونکە ئەوکاتە مەلا بەختیار و سالار عەزیز و پشکۆ نەجمەدین و شێخ عەلی جیابووبوونەوە لەوێ هەواریان هەڵدابوو بۆ دامەزراندنی ئاڵای شۆڕش)، ئێمەش ڕۆیشتینە خانووەکە لە ژوورەوە مەلا بەختیار کاک سالاری پێناساندم، سفرە و خوان دانرا، دوای نانخواردن. وەکو سووکە کۆبوونەوەیەک دەستکرا بە قسەکردن، تا درەنگانێک دانیشتین.

بۆ خەوتن لەگەڵ ٣ پێشمەرگەی تر ڕۆیشتین بۆ ماڵێک، بەیانی هەستاین ڕۆیشتینەوە بۆ لای مەلا بەختیار و ئەوان بۆ نانخواردنی بەیانی، ئەو خانووەی کە ئێمەی لێبووین ٢ هۆدە بوو، یەک دیواریان بەینبوو، منیش سەیرمکرد ئەو عوسمانەی لەگەڵ ئەدهەم بوو، خەریک بوو خۆی دەگۆڕی سەیری هۆدەکەی ئەمدیووم کرد عوسمان نانو ماست دەخوات، ئاوا دەکەم عوسمان خۆی دەگۆڕێت، سەیری ئەمدیو دەکەم عوسمان ناندەخوات، من و کاک سالار وەستابووین کردم بە پێکەنین، وتم:

- ئەرێ کاک سالار، ئەوە کاک عوسمان خۆی دەگۆڕێت ئەوەش هەر ئەوە ناندەخوات لەمدیو.

ئەویش پێکەنی وتی: هەر تۆ مابوویت لێتبگۆڕێت، ئەمانە ٢ بران لەیەکتر دەچن ئەمەیان عوسمانەو ئەوەشیان عومەرە، (عوسمان و عومەرو بەکر ٣ برا بوون تا ڕاپەڕینیش پێشمەرگە بوون، بەداخەوە بەکریان لە ڕاپەڕینەکەدا لە چیمەن شەهیدکرا).

بەیانی زوو ڕۆیشتین بەرەو حاجی مامەند، لەناو گوندەکە من لە مەلا بەختیار

جیابوومەوە.

ڕۆیشتم بۆ لای کاک بەکری حاجی سەفەر نامەکەم دایە، تا وەڵامی نامەکانی نوسییەوە کاتی نانخواردن هات، لەگەڵ کاک بەکر بەیەکەوە نانمان خوارد، وەڵامی نامەکان یەکێکیان بۆ مام جەلال و ئەوی تریان بۆ کاک نەوشیروان بوون، ئەو کاتە کاوەی حاجی عەبدوڵڵا پێنجوێنی لای کاک بەکر بوو، هاوڕێی خوێندنم بوو لە خوێندنگەی ناوەندی ڕۆژی نوێ، زۆرمان قسەکرد باسی یادگاری ڕابردووی ژیانی خوێندنگە، (بەداخەوە ساڵی ١٩٨٤ بەبێ هۆ لە حاجی مامەند شەهید کرا)، بۆ دوا نیوەڕۆکەی سەیارە هەبوو بۆ سلێمانی، پیکابێکی شۆفرلێت ئەوەندەی سندووقە تەماتەو ترێ و میوە بار کردبوو، ڕێگا نەبوو دانیشم بە پێوە خۆم پیا هەڵواسیبوو.

هەتا گەیشتمە سەیدسادق، خەریک بوو گیان بسپێرم، ئەوەندە خێرا دەڕۆی بەو ڕێگا خۆڵەدا ئەمووت: ئێستا نا ئێستا وەردەگەڕێت، شەو گەیشتینە سەیدسادق دابەزیمو بەسەیارەیەکی تر هاتمەوە، بۆ بەیانی وەڵامی نامەکانم هێنایەوە بۆ ڕێکخراو.

سەرەتای مانگی ١٠ / ١٩٨٣ عەلی وتی با چالاکییەک بکەین، منیش مەسەلەکەی مەلا بەختیارم تێگەیاند کە بەڵێنم داوە دەبێت سەیارەیەک ببەین بۆی، عەلی تووڕە بوو، وتی: کێ بیبات کوا منو تۆ سایەقی دەزانین؟! وتم:

- خەمی سایەقیت نەبێت، من ئەم چەند ڕۆژە خۆم فێر دەکەم، تەنها سایەقی ئاسانە.

- باشە با چەند چالاکییەک بکەین، بۆ ڕۆژی دوایی عەلی دەمانچەیەکی میکارۆفی هێنا وتی: بزانین دەمانچەیەک ناگرین، سەعات ١٠ ی بەیانی بەبازاڕدا دەسوڕاینەوە دوای نائب زابتێکی گەنج کەوتین دەمانویست بڕواتە تەنکاییەوە ئنجا دەمانچەکەی لێبسەنین، لە ژێر پردەکە بەرەو خوار بووەوە خۆیکرد بە چایخانەیەکدا، ئێمەش لە دەرەوە چاودێریمان دەکرد، داوای نانو ماستی کرد، منو عەلی خۆمان کرد بە چایخانەکەدا، من ڕۆیشتمە تەنیشتیو عەلی بەرانبەری دانیشت، داوای ٢ چامان کرد، عەلی چاوێکی لە من داگرتو هەستایە سەرپێ، وتی: نەجووڵێی، دەمانچەکەی لەسەر سەری دانا، منیش دەمانچەکەم لێکردەوەو خستمە بەر پشتێنەکەمو هاتینە دەرەوە، بەرەو خوار ڕامانکردو خۆمان کرد بە گوزەری ئاسنگەرەکانداو لەوێوە تەکسییەکمان گرت بۆ ماڵەوە.

٢ ڕۆژ دوای ئەوە، ڕۆیشتینەوە بۆ بازاڕ، بۆ سەرو پردەکە، ئەوکاتە ئیڤا سەربازییەکان لە کۆڵانە فراوانەکەی لای مزگەوتی شێخ مستەفای نەقیب دەوەستان، دەوری سەعاتێک ئەو ناوەمان گرت، ئیڤایەک هات نائب زابتێکی قەڵەو لەپێشەکەیدا بوو ویستی بە پشتا دابەزێتە خوارەوە، دەمانچەیەکی میکارۆفی پێبوو، عەلی وتی: با بێتە خوارەوە تەسلیمی دەکەین، هێشتا نەهاتبووە خوارەوە من پەلاماری دەمانچەکەم داو لێمکردەوەو ڕامکرد، عەلی دەمانچەکەی خۆی گرتبوو بە دەستەوە بەدواما هات، خۆمان کرد بە مزگەوتەکەدا، لەوێوە ڕۆیشتین بەرەو شەقامی کانێسکان. تەکسییەکمان گرت و ڕۆیشتینەوە بۆ ماڵی عەلی.

بڕیارماندا هەردوو دەمانچەکە هەڵبگرین بۆ خۆمان.

ساڵی ١٩٨٢ کاکم سەیارەیەکی قەمەرەی ڕینۆی پێبوو زۆرجار منو محەمەدی کوڕی دەبرد بۆ جادەی شەستییەکە بۆ فێرکردنمان، من باش فێر ببووم، بەڵام جوان دەستم ڕانەهاتبوو .

لەدوای ساڵو نیوێک، پێموت: کە بێت لەگەڵما بەتەواوی فێری سایەقیم بکات تا دەستم ڕابێت، هەرچەندە کاکم سەرقاڵی ئیشی خۆی بوو، بەڵام دڵی نەشکاندم و هات لەگەڵما، پیکابێکی سپی پێبوو، ئەوکاتە شەستییەکە قیرتاو نەکرابوو، سەیارەکەی دایە دەستمو لێمخووڕی تا ٢ سەعات زیاتر پێمبوو، دوایی پێموت ئەم ماوەیە لەگەڵما بێت تەواو دەستم ڕابهێنێت، ئەویش ئەیوت: مەبەستت چییە؟ لەم فێربوونە، منیش مەسەلەکەم تێگەیاند، ئەوەندەی تر ئامادەیی خۆی دەربڕی، تەنانەت وتی: ئەگەر نەتانتوانی خۆم ئیشەکەتان لەگەڵ دەکەم، منیش ڕازی نەبووم، وتم: ئەوەی تۆ بۆمان دەکەیت نیوەشی زیادە.

دوای یەک هەفتە بە بەردەوامی کاکم فێری سەیارەی کردم و دەستم ڕاهات، ئیتر خەمی سایەقیم نەما.

کاکم زۆر هاوکارمان بوو، زۆر کات بەیاناتو شتی بۆ دەگواستمەوە، لەکاتی خۆشاردنەوەو کاری پێویستدا ماڵی کاکم بنکەی سەرەکیم بوو، بەتایبەت بۆ تەلەفۆن کردن، ئەوکاتە ماڵیان لە تووی مەلیک بوو بەڕووی هەواری تازەدا، ئێستاش ژمارەی تەلەفۆنەکەیانم لەبیر ماوە ٢٩٤٤٩ لە وێوە تەلەفۆنم دەکرد بۆ ماڵی عەلی و جەزا، کاکم زوو زوو دەهات بۆ ماڵی خۆمان، زیاتر لەبەر دایکو باوکم سەری لێدەدان، ئەگەر منیش کاری پێویستم بوایە بۆی جێبەجێ دەکردم

کاکم پێشمەرگەی شۆڕشی ١٩٧٤ بوو پاش ئاشبەتاڵ دوور خرایەوە بۆ سەماوە، چونکە لەوەپێش پۆلیس بوو ئنجا وازی لە ئیشەکەی هێناو ساڵی ١٩٧٦ هاتەوە بۆ سلێمانی.

هەتا من پەیوەندیم کرد بە شۆڕشی نوێوە ئنجا بەهۆی منەوە زۆر هاوکار بوو لەگەڵمان.

* * *

بە عەلیم ووت: با سەیارەکە ببەین بۆ مەلا بەختیار، چەند ڕۆژە من خەریکم لەگەڵ کاکم خۆم فێری سەیارە دەکەم، ئێستا زۆر باشم بۆ سایەقی.

بەساردییەکەوە وتی: باشە منیش با پرسێک بکەم بە سەروو خۆمان بزانین چۆن دەبێت؟



شێخ حسێن شێخ جەمیل رەئووف شێخ جەمیل
ئەڵمانیا- میونشن ساڵی ٢٠٠٢

دوای ٢ ڕۆژ، بە گەرمی هات بۆ لام، وتی:

- کاکە تۆ هیچت بنیاتناوە، وا ئەوەندە سووریت لەسەر ئەم ئیشە من پرسی کاک کەمالو ئەوانم کردووە، ئەوانیش پێیان باشە بەمەرجێک دەبێت ١٠٠ ٪ سەرکەوتوبین.

- وتم: ئەجنەبییەکان لای ماڵی وەهابی هاوڕێمان ئیش ئەکەنو خەتی تەلەفۆنی ئەو ناوە دەبەستن، ئاگام لێیانە پۆلیسیان لەگەڵدایە بۆ پاسەوانی، تۆ ماتۆڕەکە بهێنە بەیەکەوە چاودێرییەکی باشیان دەکەین بزانین چۆن دێنو دەڕۆن.

خۆم ٢- ٣ ڕۆژ بە عەسران دوای تەواو بوونی ئیشەکەیان دوایاندەکەوتم، لە کارێزەوشکەوە دەهاتنە خوارەوە بۆ جادەی سەهۆڵەکە، لەوێوە دەپەڕینەوە بۆ وێستگەی کارەباکەو لەوێشەوە بۆ شەستییەکەی خوارەوە، چونکە شەریکەکەیان لە شەستییەکە بوو، چوار دەوریان هەمووی پاسەوان بوو.

ئەوەنەی من چاودێریم کردبوون باشترین شوێن خوار وێستگەی کارەباکە بوو، تەنها یەک پۆلیس لەسەر گۆشەی خوارووی وێستگەی کارەباکەوە لە قووللەیەکدا دادەنیشت بۆ حەرەسیاتی وێستگەکە، منیش هەموو بەرنامەکەم بە عەلی وت کە چۆن ئیشەکە بکەین.

بۆ ڕۆژی دوایی عەلی لە خوێندنگە وتی: دێم بە دواتا دەڕۆین بۆ ئەو شوێنە کاک کەمال دەڵێت خۆم دێم، قسەی لەسەر دەکەین.

ڕۆژی دوایی عەسرەکەی لەگەڵ عەلی بە ماتۆڕ ڕۆیشتین بۆ خوار وێستگەی کارەباکەوە وتی: ئێستا کاک کەمال و ئەوان دێن، برادەرێکی لەگەڵدایە با زیاتر ئەوان قسەی لەسەربکەن.

پاش کەمێک سەیارەیەکی بەڕازیلی شین هات، کاک کەمالو برادەرێکی تری لێدابەزینو سەیارەکە ڕۆیشت، کاک کەمال برادەرەکەی تری پێناساندم.

- هاوڕێ باییز (هاوڕێ باییز گۆرانە ڕەش) بوو.

کاک کەمال وتی: بەنیازی چین؟

عەلی وتی: منو هاوڕێ نەریمان زۆر چاودێری ئیشەکەمان کردووە، ئەڵێین لێرە ئەنجامی بدەین، وتم:

- یەک هەفتە زیاترە بە دوای ئەم ئیشەوەم، باشترین شوێن هەر ئێرەیە، چونکە لە شەستییەکەوە نزیکە، لێرەوە سەیارەکە هێواشی دەکاتەوە، دەتوانین ئیشەکە ئەنجام بدەین.

هاوڕێ بابیز هەر سەیری منی دەکرد، وتی:

- سایەقییەکەت باشە؟

- باشم.

- دەتوانی مجازەفەی پێبکەیت؟

- هەتا بتوانین ئیشەکە ئەنجام دەدەین.

- دەبێت ١٠٠ ٪ بکرێت.

پاشان هەر چوارمان بڕیارماندا، ئیشەکە لەویادا بکەین .

هاوڕێ بابیز وتی: پەلە مەکەن با تەواو مسۆگەری بکەن، با چەند ڕۆژی تر بێت، گرنگ ئەوەیە سەرکەوتوو بن .

با پێشتان بڵێمماڵی مەلا بەختیار ئێستا هاتۆتە گوندی چنگیان، ئەگەر بردتان لە جادەی دوکانیانەوە دەریبکەن، بیبەن بۆ چنگیان.

له ماڵی خۆمان من کوڕه بچووکی ماڵ بووم، خوشکو براکانم هەمویان خێزانیان پێکهێنابوو ڕۆیشتبونه ماڵی خۆیانەوه، تەنها من مابووم لای دایکو باوکم.

سەر لەبەیانی ١٢ / ١٠ دایکم وتی: نەخۆشم سکم زۆر دێشێت، هەر دەستی بە کەللەکەیەوه دەگرت، منیش بردم بۆ نەخۆشخانه، دکتۆرەکان وتیان: با لێره بێت ڕیخۆڵه کوێرەیەتی، پاشان ڕۆیشتم بە باوکم وت : باوکم وتی: ئاگات لێی بێت زوو زوو سەری بده، خوشکەکانت ئاگادار بکه لەسەیدسادقەوه جوابیان ناردووه پووریشت زۆر هیلاکه لەوانەیه بمرێت، دەبێت من لەگەڵ کاکت بڕۆین بۆ ئەوێ، (پوورم واته خوشکی باوکم ئەو کاته له سەیدسادق دەژیا لای ئامۆزاکانم)، منیش ڕۆیشتم بە خوشکه گەورەکەم وت، لەگەڵ خۆم بردم بۆ نەخۆشخانەو خۆم ڕۆیشتم.

دوا نیوەڕۆکەی کاتژمێر ٣ ڕۆیشتم بۆ ماڵی عەلی، عەلی دەمانچەکانی هێنا که ڕۆیشتین بە ماڵەوەیانی وت: ئەگەر نەهاتینەوه خەمتان نەبێت.

له خەباتەوه تەکسییەکمان گرت ڕۆیشتین بەرەو لای وێستگەی کارەباکه، زۆر دانیشتین ئەو سەیارانەی شەریکەکه هیچیان نەهاتن، به نائومێدی گەڕاینەوه. وتم: ئەڕۆمەوه بۆ ماڵەوه، وتی: باوکت له ماڵ نیه، دایکیشت له نەخۆشخانەیە. ئیتر بۆ کوێ دەڕۆی؟ منیش نەڕۆیشتم و شەو له ماڵی عەلی مامەوه.

بۆ ڕۆژی دوایی ١٣/ ١٠ ڕۆیشتین بۆ خوێندنگه، بۆ نیوەڕۆکەی هاتینەوه له ماڵی عەلی نانمان خوارد. هەمان دەستوور دەمانچەکانمان بردەوەو ڕۆیشتینەوه بۆ وێستگەی کارەباکه نیو سەعات دانیشتین، سەیارەیەکی ڕەنگی خاکی تابلۆکەی (ادخال کمرکی مؤقت) هات بەرەو خوار وتم: ئاگادار به خۆیەتی. تۆ بڕۆ لەولاوه بوەستەو ئاگات له پۆلیسی ناو قووڵەکه بێت منیش پێشیان لێدەگرمو تەسلیمیان دەکەم.

سەیارەکه هاته خـوارەوەو گەیشته ئاستی ئێمەو من ڕۆیشتمه بەردەمی و

وەستانم ٢ فلیپینی تیادا بوو بە پێکەنینەوە ئیشارەتیان کرد لاچم، دەمانچەکەم دەرهێناو بە ئیشارەت وتم دابەزن.

سەیارە لەملاو لاوە پەیدابوون، کەئێمەیان بینی دەمانچەمان گرتووە بە دەستمانەوە ئەوانیش وەستان، عەلی هەر ڕووی لە پۆلیسەکە بوو، پۆلیسەکە هەستاو چەکەکەی گرت بەدەستییەوە، عەلی هاواری کرد پێشمەرگەین، دەست نەکەیتەوە.

منیش دەرگای سەیارەکەم کردەوە فلیپینیەکان هەر دانەدەبەزین، دەمانچەکەم کێشا بەسەر ئەوەی لای سەکندا سەری پڕ بوو لەخوێن، هاتە خوارەوەو ڕایکرد، ئەوەی تریشیان هەر لای سەکنەوە هاتە خوارەوە کاتێک سەیردەکەم عەلی هەموو سەیارەکانی وەستاندووە، دەڵێت: پێشمەرگەین کەس نەڕوات.

منیش ڕۆیشتم سەیارەکەم لێخووڕیو بەخێرایی پێچمکردەوەو عەلی خۆی هەڵواسی بە دەرگای لای سەکندا، ڕۆیشتین بەرەوماڵەکانی ئابلاخ، لەڕێگا عەلی هاتە ناو سەیارەکەو بە کۆڵانەکانی ئابلاخا پەڕینەوە بەرەو جادەی سەرووی مەلعەبەکە، لەوێشەوە پەڕینەوە بەرەو چوارباخ، ئنجا ڕۆیشتینەوە سەر شەقامی فولکەی مامەڕیشە، لە وێوە ڕۆیشتین بەرەو گەڕەکی خەبات، لەجادەی شەستییەکە پەڕانمانەوە بۆ ئەوبەر بە تەنیشت خانووەکەی عەبەی شا محەمەددا سەرمانخست، بەبەردەمی ڕەبایەی گردەکەی سەلیم بەگدا ڕۆیشتینە خوارەوە بۆ کانی با و جادە کۆنەکەی عەربەت سەیری ڕەبایەکەی سەرەوەمان کرد هەموویان هاتبوونە دەرەوە، خەممان بوو تەقەمان لێبکەن، ئنجا بەرەو قرگە ڕۆیشتین خۆمان کرد بە گوندەکەدا خەڵکەکەی هاتنە دەرەوەو بەخێرهاتنیان کردین، ئێمەش هەندێک پاچو خاکەنازی ناو سەیارەکەمان دانێ.

دنیا تاریکی کرد، ڕۆیشتین بۆ گوندی وێڵەدەر، خەڵکەکەی هاتن بۆ لامان، وتمان یەکێک بێت لەگەڵمانا کە ڕێگاکەمان پیشانبدات، کەسیان ئامادەییان تیادا نەبوو، تەنها ناونیشانیان داینێو وتیان: لایت هەڵمەکەن بۆ خۆتان باش نیە، بە بەرد بەگلایتەکانی سەیارەکەمان شکاند، پاشان بەبێ لایت گەڕاینەوە

به شوێنی خۆماناو به ناونیشانەکەی ئەوانا ڕۆیشتین هەتا گەیشتینە ناو گوندی کۆڵەبی، حاجی مێوژو تەهای برای لەو گوندە فیرار بوون، لەوێش ناونیشانی گوندی داربەڕوولەمان وەرگرت.

ڕۆیشتینە ناو گوندەکەو وتمان پێشمەرگەین، سەیارەمان هێناوە لەناوشارەوە بەڵکو یارمەتیمان بدەن، هەموو وتیان بیکەن بە خاتری خوا زوو بڕۆن، ئەم گوندە نزیکە لە جادەی عەربەتەوە، با حکومەتمان بۆ نەیەت، وتمان دەڕۆین بۆ گوندی خەراجیان، ناونیشانی ڕێگاکەیان داینێ بۆ جادە کۆنەکەو لەوێوە هەڵگەڕێینەوە بۆ خەراجیان، وتم ڕێگای تری تیادا نیە لەوە زیاتر، وتیان ترستان نەبێت، ئێمەش ڕۆیشتین بە عەلیم وت: ئەم ڕێگایە باش نیە، من هەر چۆنێک بێت شارەزاییەکم لەم گوندانە هەیە.

دەنگی تەقە دەهات لەسەر جادەکە، قەدەرێک دوور کەوتینەوە بەرەو دەواجنەکانی خەراجیان ڕۆیشتین، لە جادە کۆنەکەوە کاتێکمانزانی بەردەسترێژی (b.k.c) دراین منیش بە خێرایی گەڕامەوە بۆ گوندی دار بەڕوولە، بە عەلیم وت:

- بڕۆ یەکێک بهێنە لەگەڵ خۆت، چونکە من دەزانم ڕێگای تر هەیە بەڵام شەوەو ڕێگاکە نازانم.

عەلی دابەزیو ڕۆیشت بۆ ناو گوندەکە، پیاوێک هات وتی:

ئەم ناوچەیە پیاو خراپی زۆر تیایە ئەو تەقانەش هەمووی کەمینی جاشن، وەرن بۆ ماڵی ئێمە نانێک بخۆن، پاشان قسەیەکی لێدەکەین، منیش سەیارەکەم برد لە پشتی گوندەکەوە ڕامگرت، ڕۆیشتین بۆ ماڵەکە، نانمان خواردو کەوتینە قسە، پیاوەکە ناوی حاجی عەبدوڵڵا پیاوێکی باڵا بەرزی بە قەڵافەت بوو کوڕەکەشی ناوی محەمەد ئەو باوک و کوڕە زۆر بەڕێز بوون.

حاجی وتی: ئەی بۆ ئیسراحەتێک ناکەن و بخەون، منیش مەلا بانگدان لەگەڵتان دێم کار ئاسانیتان بۆ دەکەم بۆ ڕێگاکە .

بە عەلیم وت: ئێمە هەمووی ١٠٠٠ مەتر لە جادەوە دوورین با بڕۆین، چونکە

شەو بوو دەنگی جیهازی جاشەکان بەئاسانی گوێمان لێبوو ئەیوت: بۆ سەرەوە، بۆ سەرەوە، ئیشارەتی گڵۆپی سووریش لە خوارەوە پەیدا بوو، حاجی وتی: خێرا برۆن، بەخوا جاشەکان هاتن بۆ ناو گوند، ئەو گڵۆپە سوورەش هەلیکۆپتەرە لە تانجەرۆوە هەڵدەستێت، ئەوە ئینزالی عەسکەر دەکا بۆ جادەکە.

وتمان ئێمە ئەڕۆین حاجیش هات، وتی: وەڵڵاهی سەرم دانابێت لەگەڵتان دێم، بەو شەوە بەبێ لایت بە خێرایی ڕۆیشتین، (بەڵام مانگە شەو بوو)، حاجی وتی: هەتا خێرا برۆن درەنگە جاشەکان زۆر بێناموسن خوانەخواستە بتانگرن حسابتان دەڕوات، خۆمان گەیاندە دارو شەخسەکەی پشتی دار بەرووله، وتمان: کاک حاجی تۆ بگەڕێرەوە ئێمە هەر ئەوەندەمان لەجەنابت ویست ماڵت ئاوا بێت، حاجی وتی: ئەم ڕێگایە ڕێک دەڕواتە ناو گوندی خەراجیان، بەڵام دەبێت ئاگاتان لە خۆتان بێت لەوانەیە ئەو جاشانە ئێستا برۆن بۆ گوندەکە لەوێ کەمین دابنێن.

وتمان: خەمت نەبێت، حاجی ئەملاولای ماچ کردین، هەندێک دوعای خێری بۆ کردین و گەڕایەوە بۆ داربەڕووله.

وتم: عەلی من دەزانم ئێستا ئەم ڕێگایە هەمووی بووە بە کەمینی جاش، یان لەو گوندانەوە ئیخباری کراوین، یان جاشەکان لە دەواجنەکانەوە بینیوویانین، دەبێت زۆر ئاگامان لە خۆمان بێت.

سەیارەکەم برد دوور لە ڕێگاکە لە شوێنێک ڕامگرت، وتم:

- ئەگەر تۆ دەخەویت بخەوە من ناخەووم، عەلی هەر لە سەیارەکەدا خەوت، منیش دانیشتم سەیری دەوروبەری خۆمانم دەکرد، هەتا سەعات ٤ ی بەیانی، ئنجا عەلیم هەستان وتم: من ئەڕۆم بۆ ناو گوندەکە بزانم دەنگو باس چییە؟ ورده ورده ڕۆیشتم، سەیرمکرد ناو گوند خامۆشە، سەیارەکەمان بردە ناو گوندەکە وەستانمان، وتم:

- عەلی برۆ ڕێگاکە بدۆزەرەوە بەڵام وریای سەگ بە کەشفت نەکەن، چونکە

سەگی خەراجیان بەناوبانگن بۆ دڕی.

- وتی: ئەی خوایە سەگ بتخوات، تۆ ئەوەندە لە سەگ دەترسیت.

- وتم: ناترسم، ئیشەکەمان لێتێکدەدەن.

عەلی ڕۆیشت بۆ ناو گوندەکە، هەر چاوەڕێم کرد دەنگی نەبوو، لە سەیارەکە دابەزیم بڕۆم هەواڵی بزانم؟ عەلی بەڕاکردن هاتەوە بەرەو ڕووی من کە سەیرمکرد ٣ سەگی گەورەی بەدواوەیە خۆی خستە ناو سەیارەکە، منیش فریا نەکەوتم سەگەکان کەوتنە شوێن من، ڕامکرد بۆ سەربانێک هەر مەترێک بەرز بوو، سەگەکان هاتن بۆم بەسەربانەکەدا ڕامکرد بۆ ئەو سەر، کەسەیری خوارەوەم کرد زۆر بەرز بوو، لەسەر سیلەی بانەکە وەستامو دەمانچەکەم دەرهێناو بەرەو ڕووی سەگەکان گرتم، ئەوانیش هەر دەیانمڕان دەیانویست پەلامارم بدەن، وتم: پەلامارم بدەن تەقەیان لێدەکەم، چونکە هیچ مەجالێک نەبوو لەوە زیاتر، بەس بڕۆیشتمایە دەکەوتمە خوارەوە.

پیاوێک لەماڵی خۆیان هاتەدەرەوە دەرپێیەکی سپی لە پێدا بوو دەنگیدام، کاکە کێیی برا؟

- وتم: تۆ ئەو سەگانە دوور بخەرەوە

کابرا سەگەکانی دەنگداو ٢ بەردی تێگرتن، سەگەکان دوور کەوتنەوەو ڕۆیشتن.

- وتی: فەرموو چیت دەوێت برا؟

-پێشمەرگەم دەمەوێت ڕێگای ناو گوندم پیشانبدەیت، بۆ کلکەی خەراجیان دەڕۆین.

- هەر لەبەر ماڵی خۆمانەوە برۆ بپەڕێرەوە ئەوبەر.

- ڕێگای سەیارەم دەوێت!

- دەبڕۆ لای خوارەوەو بپەڕێرەوە ئەوبەر، ئەها سەر سەلوێنکەکان دیارن، ئیتر لەوێوە برۆ خەمت نەبێت، بەڵام وریای کلکەی خەراجیان بن بەخوا برا

جاشەکانی حەمەخان هەمیشە لەوێ کەمینن.

ڕۆیشتمەوە بۆ لای سەیارەکە، کە سەیردەکەم عەلی هەر پێئەکەنێت، منیش دەستمکرد بە قسەکردن.

سەیارەکەمان لێخوڕی‌و پەڕینەوە بۆ ئەوبەری گوندەکەو ڕۆیشتین.

گەیشتینە کلکەی خەراجیان، دنیا خەریک بوو ڕووناک دەبووەوە، سەیری دەوروبەرمان کرد هیچی لێنەبوو ڕۆیشتنینە سەر جادەی قیر بۆ ڕێگای دوکانیان، لەوێوە لایتمان هەڵکردو ڕۆیشتین هەتا گەیشتینە گورگەیەر ڕۆژ بووەوە، لەوێوە ڕۆیشتین بۆ چنگیان لەناو گوندەکە سەیارەکەمان وەستان و ڕۆیشتین بۆماڵی مەلا بەختیار، هێشتا کەسیان لەخەو هەڵنەستابوون ٤ پێشمەرگە لە هەیوانەکە خەوتبوون هەڵمانساندن، ئەوانیش مەلا بەختیاریان ئاگادار کرد، هات بۆ لامان، وتمان: سەیارەکەمان هێناوە، باوەشی پێدا کردین، وتی:

- چۆن هێناتان ! خۆ توشی هیچ نەبوون.

مەلا بەختیار زۆری پێخۆشبوو کە لێی خووڕی وتی:

- جا ئەمە ئاسکە یان سەیارەیە؟، کە سەیریکرد بەگلایتەکانی شکاوە دەستیکرد بە بۆڵە بۆڵ دەبوایە نەتانشکاندایە حەیفە.

وتمان: ئەگەر دەزانی چۆن هێناومانە واتنەدەوت، مەلا بەختیار لەخۆشیانا نەیدەزانی چیبکات، ڕۆیشتین بۆ لای سالار عەزیز، مەلا وتی: ئەمانە کوڕن، ئێمە شتی وەکو ئەمانەمان هەیە لەناوشار دەستتان خۆشبێت.

ڕۆیشتینە ئەو لاوە عەلی وتی:

- کاک بەختیار، ئەم ٢ دەمانچەیەشمان هەفتەیەک پێش ئێستا لەناوشار گرتووە، هەر بەو ٢ دەمانچەیەش سەیارەکەمان گرت و هێنامان.

- وتی: دەستتان خۆش هاوڕێ گیان، ئەو دەمانچانەش پێشکەش بە خۆتان بێت، ئێمەش دەستمانکرد بەپێکەنین، عەلی وتی: جا بۆ ئەوەش دانەنێین بە خوێنی خۆمان گرتوومانە.

- وتم: حەز دەکەیت ئەوانەش دادەنێین، چییە دوانی تر دەگرین.

- وتی: ڕاست دەکەیت، هاوڕێ، هەموو شتێکتان لە دەستدێت.

پاشان هەستاین بڕۆین مەلا بەختیار وتی:

- ئەی دەمانچەکان، چۆن دەیان بەنەوە؟

عەلی وتی: چۆن هێناومانە ئاواش دەیانبەینەوە.

- پێشمەرگەیەک هات لەگەڵمان، سوار سەیارەکە بووینو هەتا گوندی گورگەیەر.

لەڕێگادا بە عەلیم وت: ئەو هەموو هیلاکیو برسێتیە، مەلا بەختیار نەیتوانی بڵێت با لەماڵەوە نانێک بخۆین، ماشاڵڵا بەوەفان، عەلی وتی: ئەو لە خۆشیاندا نەیدەزانی چی بکات، ئێستا بیری نان خواردنی هەیە، با کورد ڕزگاری ببێت حوکمیان بکەوێتە دەست ئنجا وەفای ئەمانە دەبینینەوە، (قسەکەی زۆر ڕاست دەرچوو).

لە گورگەیەرەوە بەپێ هاتینەوە سەرجادەی دوکانیان، جێبێکی لاندرۆڤەر هات، تەنها لە دواوە جێگا هەبوو سوار بووین بەرەو سلێمانی، لە سەیتەرەکە سەربازێک دەرگای دواوەی کردەوە سەیرێکی کردینو دەرگاکەی داخستەوە، ئەو جارەش بە سەلامەتی دەرچوین، سەعات ٩ ی بەیانی لەشەستییەکە دابەزین تەکسییەکمان گرتو ڕۆیشتینەوە بۆ ماڵی عەلی، بە پەلە نانێکمان خواردو هەندێک کتێبمان هەڵگرتو بە ماتۆڕەکەی عەلی ڕۆیشتین بۆ خوێندنگە، کاتێک گەیشتین ٢ وانەیان خوێند بوو.

* * *

ئێوارە ڕۆیشتمەوە بۆ ماڵەوە، سەیرمکرد دایکم نەشتەرگەری بۆ کراوەو لە ماڵەوە کەوتووە کەسی بەلاوە نیە.

- وتم: ئەی خوشکەکانم نەهاتن؟

دایکم وتی: ئێستا چێشتو نانیان دروستکردو ڕۆیشتنەوە، ئەوانیش ماڵو

منداڵیان هەیە، باوکم ئەوەندە تووڕە بوو نەمدەوێرا سەیری بکەم.

دوای نانخواردن چەند پیاوێکی گەڕەک هاتن بۆ ماڵمان، فاتیحایان خوێندوو سەرەخۆشییان لە باوکم کردو هەواڵی تەندروستی دایکمیان پرسی.

میوانەکان ڕۆیشتن و منیش وتم:

- باشە باوکە نەخۆش فاتیحای بۆ چییە؟

لەگەڵ واموت باوکم هات بەڕووما، وتی: تۆ هەر قسە مەکە، تۆ کەی کوڕی ئەم ماڵەی لەکوێ بوویت بڕۆرەوە بۆ ئەوێ، کەس نازانێت چی دەکەیتو لەکوێ ڕۆژ دەکەیتەوە؟!

- ئێ باشە باوکە چیبووە؟ هیچی خراپ بووە؟

- نەوەڵڵا هێشتا ماوتە، باشە نەمووت دایکت جێنەهێڵێت لە نەخۆشخانە.

- ئەی بە خوشکمو ئەوانم وت؟

- ئەی خۆت ئیشت چیبوو؟ ها؟!

- من بەتۆم وت: نەخۆش فاتیحای دەوێت؟ کەچی تۆ نەتهێشت قسەکە تەواو بکەم ئابڕووی منت برد.

دایکیشم بۆ ئەوەی ئاژاوەکە ببڕێتەوە وتی: پوورت مرد، پیاوانی گەڕەک بۆ ئەوە هاتبوون، بەسە ئیتر بیبڕنەوە دڵم بەبەریەوە نەماوە، هاکا مردم.

بەو ئێوارەیە جێگەم ڕاخست، هەر ڕۆیشتمە سەر جێگاکە خەوم لێکەوت.

بۆ بەیانی هەستام، باوکم دەستیپێکردەوە :

- توو ئەو خوایە پێم ناڵێیت ٢ شەوە لە کوێیت، دەتوت لە شاخی سوورێنت داوە ئەوەندە هیلاک بووی، پرخە پرخی تۆ نەیهێشتووە بخەوین.

بەو بەیانیە کاکیشم هات بۆ سەردانی دایکم، نانو چای لە ماڵی خۆیانەوە هێنابوو، کە سەیریکرد هەرایە لە ماڵەوە، کاکیشم هات بە گژما، باشە کاکە ٢ شەوە لە کوێیت؟ ئێ تەلەفۆنێک، وەسیەتێک، قسەیەک، دڵمان هەزار شتی کردووە، ئێستا وەختی ئەوەیە، دایک خەریکە دەمرێت، لە وێوە پوورمان

مردووه، هەمووی مەشغوڵ، هێشتا خەمی تۆش لەولاوە بوەستێت.

کاکمم بە ئیشارەت بانگکرد بۆ ژوورەوە، وتی:

- ئێ چیبووە؟

- لەگەڵ عەلی سەیارەکەمان برد.

- ماڵتان بە قووڕ گیرێت بۆ خۆتان و بۆ ئیشتان، توخوا ئێستا کاتی ئەوەیە.

ئنجا کاکم وەزعەکەی هێواش کردەوەو، وتی: هیچ نیە دەڵێت لە ماڵی عەلی بووم، وامزانیووە کەس لە ماڵ نیە.

*

دوای ٢ ڕۆژ لە خوێندنگە عەلی وتی: دوا نیوەڕۆ بەیەکەوە دەڕۆین بۆ لای هاوڕێ بابیزو کەمالی موهەندیس مەوعیدمان هەیە.

بۆ دوا نیوەڕۆکەی ڕۆیشتین بۆ لای خانەقا، کەمێک وەستاینو هاوڕێ بابیزو کەمالی موهەندیس هاتنو ئەملاو ئەولای یەکمان ماچکرد، هاوڕێ بابیز وتی: دەستخۆشیتان لێدەکەین، بۆ ئەو ئیشە کە کردتان بەڕاستی لە جێگەی خۆیدا بوو، هیوام وایە هەموو کارێکتان ئاوا سەرکەوتوو بێت، خۆشم چاوم بە مەلا بەختیار دەکەوێتو هەڵوێستی ئێوەی بۆ باسدەکەم، ئێمە کە دەڵێین ئاگاتان لە خۆتان بێت با نەکەونە داوی ڕژێمەوە.

کاک کەمال پێی وتین کەدەبێت چەند ڕوممانەیەک بتەقێنینەوە لەناو شاردا وەکو چالاکی پێشمەرگانە، نەخشەی ئەوەمان دانا کە من ماتۆڕەکە بوەستێنم لە پشتی جادەی کاوەوە، ئەو ڕێگایەی دەڕواتەوە بۆ فولکەی نالی ئەوکاتە ئەو ناوە هەمووی کۆڵانی تەنگەبەر بوون.

بەرنامەمان دانا کاک کەمال سەرپەرشتی بکات و عەلیش ڕوممانە بخاتە ناو سەیارەکانی پیاوانی ڕژێم و منیش بە ماتۆڕەکە دەریبکەم.

ڕۆژێ عەلی وتی: کاک کەمال چاوەڕێم دەکات لە چایخانەی ماردین، من لەو لاوە وەستامو عەلی ڕۆیشت، ئەوەندەی پێنەچوو هاتەوەو ٥ ڕوممانەی لە عەلاگەیەکی پڕ لە ساوەردا هێنا، وتی: تۆ شوێنت هەیە ئەم ڕوممانانەی تیادا هەڵبگریت؟ وتم:خەمت نەبێت، بردمان بۆ ماڵی خۆمان (لە ماڵی خۆمانا شوێنێکی تایبەتمان هەبوو لەناو چینی دیوارەکەمانا جێگای زۆر شتی تێدا دەبووەوە کەس هەستی پێنەدەکرد).

دوای ٢ ڕۆژ عەلی بە ماتۆڕ هات بۆ ماڵمان وتی: با ڕوممانەیەک بەرینو تەقینەوەیەک بکەین، وەکو بەرنامەمان دانابوو، ماتۆڕەکەمان برد بۆ کۆڵانەکانی پشتی جادەی کاوە، عەلی ڕۆیشت تاکو سەعاتێک وەستام دەنگ نەبوو، ئەوەندەمزانی دەنگی تەقینەوە هات، منیش ماتۆڕەکەم ئێشپێکرد، عەلی بە ڕاکردن هات سوار بوو، بەخێرایی عەلیم دەرکرد بۆ لای فولکەی نالییەوە لەوێوە بەرەو گەڕەکی قەزازەکان ڕۆیشتین، وتی: دەزانی ئەم بەرنامەیە زۆر باشە، زۆر هیلاک نابیتو ترست نیە، وتم:

- چیتان کرد ؟
- خستمانە ناو سەیارەیەکی لاندگرۆزەری قوات خاسەوە.
- دەستت خۆشبێت.
- دەستی چیم خۆشبێت، بڵێ دەستی کاک کەمال خۆشبێت.

- بۆ ئەو کردی.

- بەسەری تۆ ئەو کردی، بە منی وت: کە من ڕوممانەکەم فڕێدا، تۆ ڕابکەو حەقت نەبێت خەڵک وا دەزانن تۆیت، ئنجا من هەوییەی موهەندیسیم پێیە ئەگەر بشگیرێم زۆر جێی شکنیم.

*

دوای هەفتەیەک ڕوممانەیەکی ترمان بردەوە بۆ لای خانەقا بەکاک کەمالم وت: ئەم جارەیان من دەیکەم، وتی: تۆ تەنها ماتۆڕەکە لێبخووڕە عەلی بەسەلامەتی دەربکە ئێمە ئەوەمان ئەوێت، من ماتۆڕەکەم لەگەڵ عەلی برد بۆ خوار خانەقاوە وەستانم، عەلی گەڕایەوەو هەمووی ١٠ دەقە وەستام ناڵە هەستا، سواری ماتۆڕەکە بوومو خۆم ئامادەکرد، عەلی بەڕاکردن هات خۆی خستە سەر ماتۆڕەکە منیش بە خێرایی دەرمکرد هەتا ماڵی خۆیان نەوەستام، وتی: خستمە ناو ئیڤایەکی سەربازییەوە پڕ بوو لە سەربازو لەوە دەچێت زیانێکی زۆری دابێت.

کۆتایی مانگی ١٠ی ١٩٨٣ لەڕێکخراوەوە پێمراگەیەنرا کە دەبێت بڕۆم بۆ ڕێکخراوی ٢ لە هەڵەدن، چەند نامەیەک و ٢ تەزکییەی هاوڕێیانی خۆمان (ئازادەڕەش‌و بەهرۆزی دەروێش غەفوور) بەرم، منیش بەیانیەکەی ڕۆیشتم بۆ ژێر پردەکە، لەوێ سواری پیکابێک بووم لەگەڵ چەند نەفەرێکی تر، سایەقەکەی کابرایەکی باڵابەرزی بەخۆی چوار شانە بوو، پاشان بەڕێکەوتین بۆ قەڵاچوالان‌و کارێزە، لەوێوە بۆ مالوومە، پاشان ڕۆیشتینە گوندی یاخسەمەرو سەیارەکە لەوێ وەستا، دنیا خەریک بوو تاریکی دەکرد، سایەقەکە وتی: دەبێت تۆ زۆر بە خێرایی بڕۆیت بۆ هەڵەدن، چونکە شەوت لێبکات ڕێگاکە ونده‌کەیت.

بەخێرایی ڕۆیشتم هەتا گەیشتمە گوندی هەڵەدن تەواو تاریکی کرد، ڕۆیشتم بۆ بارەگای ڕێکخراو هەواڵی جەبار فەرمانم پرسی چونکە ئەو لێپرسراوی ڕێکخراو بوو، چەند کەسێکی لێبوو یەکێکیان ناوی مەلا وریا بوو، وتی چ ئیشێکت هەیە بەمنی بڵێ، کاک جەبار بەمزوانە نایەتەوە، منیش نامەکانم تەسلیمی ئەوکرد.

کاتی نانخواردن نانیان دانا، مەنجەڵێک کوبە بوو لە سلێمانیەوە بۆیان هێنابوون.

دوای نانخواردن هەواڵی ٢ هاوڕێکەی خۆمانم پرسی؟ ئازادە ڕەش‌و بەهرۆزی دەروێش غەفوور، ڕۆیشتم بۆ لایان لە ژوورێکدا قسەمان کرد، تەزکێکانم دانێ، (دوایی ئەو دوو پێشمەرگەیە هەردووکیان زۆر خۆڕاگر بوون، دوو کەسی زۆر باشیان لێدەرچوو، (دێمەوە سەر باسی ئازادەڕەش).

پاشان هەواڵی مەجید ئیسماعیلم پرسی برای حەمید ئیسماعیل کە لە پۆلی خۆمان بوو لە خوێندنگە، (حەمید هەموو جارێک دەیوت برایەکم پێشمەرگەیە لە ڕێکخراوی ٢ ی هەڵەدن).

مەجید هات و زۆر ڕێزی لێگرتم وتی:

- مەلا وریا پورزامەو هەرچی ئیشێکت هەیە با جێبەجێی بکەین (ئێستا

مەجید  لە سلێمانیە، هاوڕێیەتیمان زۆر خۆشە).

بۆ بەیانی زوو سەیارە ئامادەبوو لە هەڵەدن، ئەوەندە سارد بوو سەر زەویەکە هەمووی ببوو بە شەونم، منیش ڕۆیشتمە خوار گوندەکەوە سەیرمکرد تەرمی شەهیدێک دانراوە، دایکی بەلایەوە بەخۆکوشتن وەستاوە منداڵێکی بەبەرەوە بوو، تەمەنی کوڕەکەی ١٧ ساڵ بوو شەهید کرا بوو، بەو بەیانیە ئەوەندەم خەفەت خوارد، چاوم پڕ ببوو لە فرمێسک، پاشان هەر لەناو سەیارەکەدا شیعرێکم بۆ نووسی بەناوی دایکی شەهیدەوە.



پێشمەرگەی دێرین بەهرۆزی دەروێش غەفوور

ئەو کاتە لای سەرا دائیرەیەکی لێبوو پێیاندەوت بەریدە کۆنەکە، ڕۆژێک ەگەڵ عەلی سەیرمانکرد ماتۆڕێکی شینی (M·Z) وەستاوە تابلۆی شینی حکومی ژمارە ٢٨ بەدالە.

وتم: عەلی ئەم ماتۆڕە بۆ نەبەین، بۆ ئیشوکاری مەڵبەند باشە.

وتی: شوێنەکەی بەکەڵک نایەت، خەڵکی ئەم ناوە دەماننناسن.

مانگی ١١ ڕۆژێک ڕۆیشتم بۆ نەخۆشخانەی جامعەکە بۆ چارەسەری گوێچکەم ئیلتهابی هەبوو، سەیرمکرد ئەو ماتۆڕە لەبەر دەرگای نەخۆشخانەدا دانراوەو سەیارەی قوات خاسەکانیش لە تەنیشتیدا وەستاون، بەخێرایی ڕۆیشتمە نەخۆشخانەو سەردانی دکتۆرم کرد، هەندێک عیلاجم وەرگرتو هاتمە دەرەوە، ڕۆیشتم بۆ خوار نەخۆشخانەوە ڕیزێک دووکان کە ئێستا هەر ماوون پێداویستی سەردانی نەخۆش دەفرۆشن، بە خاوەنی دوکانێکم وت: تەلەفۆنت هەیە زۆر زەروورم، وتی: بەڵێ فەرموو، تەلەفۆنم کرد عەلی خۆی هەڵیگرت.

وتم: بەخێرایی ڤیدیۆکە بهێنە و وەرە بۆ بەردەمی نەخۆشخانەی جامعەکە (لە تەلەفۆندا بە ماتۆڕمان دەووت ڤیدیۆ).

پاش ٢٠ دەقیقیە عەلی هات.

وتم: ئەوە ماتۆڕەکەیە لە پشتی قوات خاسەکانەوە لەسەر شۆستەکە وەستاوە.

وتی: جا ئەوە شوێنە، لای سەرا باشتر نیە؟

– وتم: نەخێر، من نەخشەم بۆ داناوە ئەگەر سەر بگرێ، من مەبەستم فڕاندنی ماتۆڕەکە نیە، مەبەستم زیاتر گۆڵکردنە لە قوات خاسەکان، شەرمەزار دەبن لەبەردەمی ئەوانا ئەو ئیشە بکرێت، ئێستا لە نەخۆشخانە بووم عیلاجم پێیە، ماتۆڕەکەی خۆمان دەبەم لای ماتۆڕەکەی تر دەیوەستێنم، ئەڕۆمە ژوورەوەو دەگەڕێمەوە، دەست دەگرم بە گوێچکەمەوەو ماتۆڕەکەی تر دەبەم، ئەگەر کەشف بووم ئەوە نەمزانی، ئەگەر کەشفیش نەبووم ئەوە دەیبەم، مەسەلەکە بە کوردی یا گاڵ دەهێنێت یا پەموو، (ماتۆڕەکەی ئێمەو ماتۆڕەکەی تر تەنها

تابلۆکانیان جیاوازی هەبوو هەردووکیان یەک مارکەو یەک ڕەنگ بوون).
عەلی وتی: ئەی ئەگەر گاڵی هێنا.
- ئەگەر گاڵی هێنا، خۆم و ماتۆڕەکە بۆ ئەمنە بۆر، یا ئازادم دەکەن یا باش دەمکوتن، ئەگەر سەریگرت من دەیبەم بۆ ماڵی کاکم تۆش ماتۆڕەکەی خۆت بهێنە بۆ ئەوێ.
ئەو بەرنامەیەمان دانا، ماتۆڕەکەم لێخوڕی لەدوای ماتۆڕەکەی ترەوە دامنا، ڕۆیشتمەوە نەخۆشخانەو پاش کەمێک هاتمە دەرەوەو دەستمگرت بە گوێچکەمەوەو دەرمانەکانم گرت بە دەستمەوە، ماتۆڕە حکومییەکەم ئیش پێکردو لەبەرچاوی قوات خاسەکاندا لێمخوڕی و بردم، ڕۆیشتم بە جادەی قەناتدا لە پشتی جامعەکەوە بردم بۆ جادەی مەجید بەگ، خۆمکرد بە کۆڵانەکانی مەجید بەگداو لەوێوە بۆ پشتی ماڵەکانی جامعەو ڕۆیشتمەوە بۆ تووی مەلیک بۆ ماڵی کاکم، لە دەرگامدا براژنم کردییەوەو منیش ماتۆڕەکەم کرد بە ژوورا.
دەرگاکەم داخستو تابلۆکەیم لێکردەوە و خستمە ناو توونی حەمامەکەیانەوە.
بە براژنم وت دەرگاکە مەکەرەوە، ئەم ماتۆڕە حکومییە، فڕاندوومە،
دوای نیو سەعات عەلی هات بۆ ماڵی کاکم.
وتی: قوات خاسەکان هەر نەشیانزانی، منیش ماتۆڕی خۆمم لێخوڕی و ڕۆیشتم.
ئنجا تابلۆی ماتۆڕەکەی خۆمان بەست لەماتۆڕە حکومییەکەو ماتۆڕەکەی عەلیمان لە ماڵی کاکم دانا، عەلیش ماتۆڕە حکومییەکەی برد بۆ مەڵبەند لە حاجی مامەند.
بۆ ڕۆژی دوایی هاتەوە، وتی: بەسەری تۆ شەڕ بوو لەسەری، هەموو ئەندام مەڵبەندەکان دەپاڕانەوە هەر یەکە دەیوت بۆ ئیشی من باشە، دایان بە دلێری سەید مەجیدو ئاوات عەبدولغەفور بۆ کاروباری دارایی و کۆمەڵایەتی.
عەلی تابلۆی ماتۆڕەکەی لەگەڵ خۆیدا هێنا بۆوەو بەستمانەوە لە ماتۆڕەکەی خۆمان .

سەرەتای مانگی ١١ی ١٩٨٣ عەلی وتی: هاورێیەکی خۆمان هەیە، ئەو کەسەی یەکەمجار پەیوەندیم پێوەکرد لە ڕێکخراو، ئێستا ئەویش دەیەوێت پەیوەندی بکات پێمانەوە زۆریش کەسێکی لە خۆ بردوو ئازایە، کاک کەمالی موهەندیسیش ئەیناسێ، ئەڵێ با لەگەڵ ئێوە دەستبەکاربێت.

ڕۆیشتین بۆ لای خوێندنگەی سلێمانی کچانەوە لە بەردەم خوێندنگەکە برادەرێک وەستا بوو عەلی بەیەکی ناساندین، منیش وتم: کاک نزار دەناسم و هاورێی گەڕەکین لە ئیبراهیم پاشا، هەرسێکمان ڕۆیشتین بۆ لای گردی سەیوانەوە، هاورێ نزار کەسێکی زیرەک و شارەزایی لە مارکسییەتدا هەبوو، ئەویش لێپرسراوی ٢- ٣ شانە بوو وەکو من دەیوت: حەز ناکەم دەستبەرداری ڕێکخراو بم بەڵام پێشمخۆشە بەشداربم لەگەڵتان و ئیشبکەم، ئێمەش تا حەدێک لە کارەکانمان وەستابووین، چونکە دەنگو باسی کوشتنی وریا هاتبووە ئاراوە، منو عەلی نەماندەناسی، بەڵام لای گۆران و کەمال و ئەوان کارێکی ناڕەواو ناخۆشبوو.

❊ ❊

کۆتایی مانگی ١١ جەزا وتی: دەبێت هاورێیەکی تر بناسیو ئنجا ٣ قۆڵی کۆببوونەوە بکەین ئەویش هەر ئەندام پۆلە ناوی نهێنی جەمشیدە، (عەمید فەرەیدوونی مرور) ماڵەکەیانی پیشاندام لە تووی مەلیک بەلای هەواری تازەدا خوار ٣٠ مەترییەکەوە، کە ڕۆیشتم لە دەرگام دا خۆی هاتە دەرەوە خۆم پێناسان، سەعاتێک بەیەکەوە قسەمان کرد، پاشان چەند کۆبوونەوەیەکمان کرد، هاورێ جەمشید ئاستی ڕۆشنبیری زۆر باش بوو، کورێکی هێمن و لەسەرخۆ، لە ئیشی ڕێکخستندا چالاک بوو، ٢ - ٣ جار ڕۆیشتم بۆ ماڵیان، باوکی لەماڵەوە ئیشی خەیاتی دەکرد، لەوکاتەدا دانوستانیش لە ئارادا بوو.

ڕۆژێک لە شەقامی ئیبراهیم پاشا بەیەکەوە دەڕۆیشتین، خەڵک هەمووی هوتافیان دەکێشا، بەسەیارەوە بەهۆڕن لێدان دەگەڕان بەناوشاردا، تەنانەت

سەیارەی قوات خاسەکانیش خەڵکی سلێمانی ڕۆیشتبوونە سەریانو هوتافیان دەکێشا، هێشتا ڕێگا بە پێشمەرگە نەدرابوو بێنە ناو شارەوە، تەنها ورە ورێکی ڕێکەوتن هەبوو، منیش بە هاوڕێ جەمشیدم وت: بیرت چۆن بەلای ئەم وەزعەدا دەڕوات؟

- وتی: بڵێم چی جارێ ئاوا دەیبینین دواییەکەی خێر بێت .حکومەت و ڕێککەوتن، یانی ئەم شۆڕشە گەورەیە بوو بە چەپڵەی سەرجادە، بەبێ ئەوەی هیچ ببێت؟!

هەردووکمان پێکەنینمان بە مەسەلەکە دەهات، تا ٢ مانگیش دوای دانوستان منو هاوڕێ جەمشید بەیەکەوە بووین، پاشان ئەو گواسترایەوە بۆ پۆلێکی ترو پەیوەندی ڕێکخستنمان بەیەکەوە نەما.

(هەتا ئێستاش پەیوەندیو برایەتیمان بەیەکەوە هەیەو لەگەڵ جەزا هەرسێکمان یەکتر دەبینین. هاوڕێ جەمشید، کوڕێکی بەئەدەبەو ڕێزی خەڵک دەگرێت و کەسێکی زۆر بەوەفایە، بەهیوای تەمەن درێژی).



عەمید فەرەیدوون عومەر (هاوڕێ جەمشید) - جەزای ئەحمەد کوردە - ڕەئووف شێخ جەمیل

# ١٩٨٤ دانوستان یان چۆگدادان

## - ٤٥ -

سەرەتای ساڵی ١٩٨٤ ڕۆژانە دەنگو باسی دانووستانو ڕێکەوتن لەگەڵ ڕژێمدا زیادی دەکردو بەردەوام بوو، ئێمەش زوو زوو لە ڕێکخراوەوە نوسراومان بۆ دادەبەزی کە بە هیچ جۆرێک ڕێکخستنەکان خۆیان دەرنەخەن هەتا خۆمان ئاگادارتان دەکەینەوە، بەڵام ئەوەی من تێبینیم کرد ڕێکخستنەکانی شۆڕشگێڕان هەر زوو خۆیان دەرخستو، شەو بە ئاشکرا پۆستەری شەهید عەلی عەسکەرییان هەڵدەواسی و پەیوەندییان بە گەنجان و خوێندکارانەوە دەکرد.

ناوشاری سلێمانی ببووە تێڕژان شەوو ڕۆژ خەو نەبوو، شەقام و کۆڵان، خەڵک هەمووی لەدەرەوە بوو، ڕادیۆی دەنگی گەلی کوردستانیش پەیتا پەیتا خەبەری بڵاودەکردەوە.. وەفدی یەکێتی ئەمڕۆ گەیشتە بەغداد بۆ قسەکردن و گفتوگۆ لەگەڵ میریدا.

ئێمەش دەمانووت: تا دوێنێ ڕژێمی خوێناوی حیزبی بەعس بوو، کەچی ئەمڕۆ بووە میری نیشتمانی.

لەو کاتەدا لە ڕێکخراوەوە نووسراوێک هات بۆ سەرجەم شانەو پۆلەکان، هەر ئەندامێک بیروڕای خۆی دەربڕێت بۆ دانوستان، هەمووی ڕاپۆرتی خۆی ئامادەکرد، بڕوا ناکەم یەک ئەندام و لایەنگر لە ڕێکخراودا ڕازی بوو بێت بە گفتوگۆ.

* * *

دوای چەند ڕۆژێک عەلی وتی: هاوڕێ باییز و ئەوان ئەڵێن چاومان پێتان بکەوێت کۆبوونەوە دەکەین دەربارەی دانوستان، بۆ ٢ ڕۆژ دوای ئەوە یەکترمان بینی و دانیشتنمان لە ماڵی عەلی کرد، ئەوانیش زۆر بێزار بوون هیچ ڕایەکی باشیان دەرنەبڕی، چونکە لەملایشەوە ورە وری ئاڵای شۆڕش هەبوو وە زۆربەی

گەنجەکانو خوێندکارانو ڕۆشنبیران بیریان بەلای ئەوانا دەڕۆیشتو باوەڕیان بە ڕوخاندنی ڕژێم هەبوو، ئەو هەلە لەوکاتەدا دەست ئەوان کەوتبوو، بەڵام بەهۆی هەلپەرستی مەلا بەختیارەوە نەیانتوانی بەڕێوەی ببەن.

لە نێوانی قسەکانا کاک کەمالی موهەندیس زۆر ناڕازی بوو بە دانوستان ئەیوت: کەواتە ئێمە هیچمان نەکردو ئاسنی ساردمان کوتا، ئەو هەموو ڕەنجە بە خەسار ڕۆیشت، لەلایەکەوە خەڵک دەکوژن کە خیانەتی کردووە (مەبەستی شەهید وریا بوو)، لەلایەکی ترەوە خۆیان بەدەرزەن خیانەت هەڵدەڕێژن بۆ ئەم میللەتە، بەتەمان ئازادی کوردستان لە ڕژێمی بەعس وەربگرن، لەلایەکەوە ئەڵێن ئازادی بە خوێن نەبێت ناسەندرێت، لەلایەکی ترەوە ئەڵێن هێزی پێشمەرگە هیلاکەو پێویستی بە پشوودان هەیە، وەکو زۆرمان کردبێت؟! یەعنی ڕژێمی بەعس ئەوەندە ساویلکەیە یەکێتی بە نیازە مافی کوردی لێبسەنێت.

هاوڕێ بابیز (گۆرانە ڕەش) وتی: لەم کاتەدا ڕژێمی بەعس لەوپەڕی هیلاکیو گیانەڵڵادایە شەڕی ئێران لەولاوە بوەستێت کە وێرانی کردووە، لەملاوە شەڕی کوردیش، بڕوا بکەن شۆڕشی یەکێتی لە شەڕی ئێران زیاتر تەنگی بە ڕژێمی بەعس هەڵچنیوە، بۆیە وا هاواری لێبەرزبۆتەوەو چۆک دادەدات.

کەمالی موهەندیس وتی: پرس و ڕای مەفرەزەکانی خۆمان کردووە یەک هاوڕێمان ڕای خۆی دەرنەبڕیوە، ئێوەش ڕای خۆتان دەرببڕن، منیش وتم:

- وەکو خۆم هیچ ڕایەکم نیەو ڕاپۆرتی خۆشم نوسیوە بۆ ڕێکخراو کە هەموو هاوڕێیان ناڕازین و ئەنجامەکەی باش نابێت، تەنها کۆمەڵێک خەڵک تیا دەچن و هەموو ماڵە پێشمەرگەو ڕێکخستنەکان دەستنیشان دەکرێن و ماڵوێرانی کوردی تیادا دەبێتو جەماوەر زەرەر دەکات، جا کە بڕوایان بە ڕژێمی بەعس هەبوو بۆ ئەوەندە لەسەریان دەخوێند، با کەمێکیان تیادا بهێشتایەتەوە چونکە ئەوان لە ئیستگەکەیانەوە ئەڵێن بۆ ڕوخاندنی ڕژێمی بەعسو هێنانە سەرکاری حوکمێکی ئیئتیلافی ڕاستەقینە بۆ گەلی کورد، ئەمەیان لە چیو ئەوەیان لە چی؟

هاوڕێ نزار بیروڕای خۆی دەربڕی، کەسێکی لەسەرخۆو بە هەڵوێست بوو،

وتی: ئەک ئێمە بڕوا ناکەم هیچ کەسێک لە کورد گفتوگۆی پێخۆشبێت، چونکە چەندەها تاقیکردنەوەی پێشومان بینیوە، ئەمان گاڵتەیان بە پارتی و بارزانی ـەکرد بۆ مفاوەزات و بە ئاشبەتاڵ، کەچی خۆیان هەر زوو هاتنە پێشەوە بۆ قسەکردن.

* * *

ڕۆژانە خەڵک چاوەڕێی هەواڵی باشبوو لە ڕژێمی بەعسەوە کەچی هیچ دیار ـەبوو، وەکو خۆم ڕۆیشتومەتە چەند ماڵ، دەنگی تەلەفزیۆنەکەیان زیاد دەکرد، ـەیانووت: ئێستا بەیانەکە دەخوێنێتەوە، هەتا ئەوساش بە درێژایی چەندەها مانگ دانوستانی ڕژێمی بەعس بە وێنە یان بە دەنگ و باس، پیشانی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستانی نەدا کە گفتوگۆ هەیە، تەنها ئەوەندە نەبێت هەندێ پارەی ـرد بۆ سەرانی یەکێتیو چەند گیراوێکی بێتاوانی ئازادکردو بە کەسوکار شاد بوونەوە، زۆربەی پێشمەرگە هەمویان سارد بوونەوە لە چەکداری و خۆیان و کەسوکاریان دەرکەوتن و بوونە دەستنیشانی سیخوڕەکانو پیاوانی ڕژێم، لە هەمووی گرنگتر ئەو هێزە گەورەیەی یەکێتی کەئەوسایە بەرەنگاری حیزبی بەعس و ئێران و هەموو حیزبە کوردییەکان دەبـوەوە، هیچ سامێکی نەما ـەبەردەم ڕژێمی بەعسدا، وەکو ئەیانووت: زۆربەی ئامری فەیلەق و فرقەکانی ـەربازی ڕژێم ئاواتیان ئەوەبوو، تەنها مامەڕیشە ببینن، کە دەیانبینی سڵیان ـێدەکردەوە.

پاشان مامەڕیشە ئەو پیاوە بەجەرگە لێهاتووە بە ئاسانی بەدەستی جاشێکی چەپەڵ شەهید کرا.

ڕژێمی بەعس لەسەرەتای دەستپێکردنی شۆڕشی یەکێتییەوە چەند جارێک ـێبوردنی گشتی دەرکردبوو، ئەوانەش لەبەر خاتری چاوی کاڵی کورد نەبوو، بۆ ئەوەی بە ئازادکردنی بەندییە سیاسییەکان شۆڕشی کوردی پێدابمرێنێتەوە، ـێبوردنی دەردەکرد بۆ تەسلیم بوونەوەی پێشمەرگەو سەربازی هەڵاتوو، بۆ ئەوەی بیانکاتە سەربازو دەرخواردی جەنگی ناڕەوای ئێران و عێراقیان بدات،

هەم بەخشندەیی خۆی دەردەبڕی بەرانبەر خەڵکی عێراق بە گشتی.

ڕژێمی بەعس لەدانوستانی ١٩٨٤ لە مانگی یەکەوە وردە، وردە دەستیکرد بە ئازادکردنی زیندانیەکان، بەتایبەت ئەوانەی کە لەژێر ئازارو ئەشکەنجەدا بوون، یەکێتی لیژنەی تەنسیقی دانابوو لەگەڵ ڕژێمدا، گوایە ئەوان لەسەر ڕێکەوتننامە ئازادیان دەکەن، ئەوکاتە تەنها بەندکراوەکانی یەکێتی ئازاد دەکران، هی حیزبەکانی تریان ئازاد نەدەکرد.

ئێمەش وەکو ڕێکخراو چاوەڕێی ئازادکردنی هاوڕێکانی خۆمان بووین، لەمانگی یەکدا کۆمەڵێک زیندانی ئازادکران، یەک لەوانە ئاکۆی حەمە شوکر بوو، ئەو ڕۆژەی ئازادکرا بەخۆشحاڵییەوە ڕۆیشتم بۆ سەردانی، بەڕاستی هاوڕێیەکی ئازاو بە جەرگ بوو.

پاش چاوپێکەوتن و خۆشحاڵی دەربڕین وتی: ئەڵێن هاوڕێیان ترسیان لە من هەبووە.

- ئەوەش دەبێت، چونکە خۆت دەزانی هەر کەسێک دەست ڕژێمی بەعس بکەوێت هاوڕێیان هەڵوێستی خۆیان وەردەگرن.

- دەبوایە کەس ترسی لە من نەبوایە، چونکە ئەوەی من بە گیانم سوک بووبێت تەنها لێدانی حیزبی بەعس بوو، پاشان وتی: من دەمەوێت هەر لەگەڵ تۆدا بم، دەبێت هەر لە بەشی پێشمەرگەی ناوشار ئیشبکەم.

* * *

لە سلێمانی کەش و هەوایەکی سیاسی ئازاد هاتبووە کایەوە، پێشمەرگە دەستە. دەستە دەهاتنە شارەکانەوە، ئەوانیش بە مۆڵەت و لەسەر بڕیاری لیژنەی تەنسیق، کە لە شاری سلێمانی و کەرکوکو هەولێر دانرابوون، ئەگەر کێشەیەک ڕووی بدایە ڕووبەڕووی لیژنەی تەنسیق دەکرانەوە. ڕۆژانە لە ئیستگەی گەلی کوردستانەوە، مژدەی خۆش دەدرایە کۆمەڵانی خەڵک، ناوی چەندەها زیندانیو گیراوی بێتاوان دەخوێندرایەوە کە ئازاد دەبوون.

پێشمەرگە لە ناوچە ئازاد کراوەکانەوە بەچەکەوە دەهاتنە ناو شارەکانەوە، مەرچەندە بڕیاریش بوو بەبێ چەک، بەڵام ئەوان هیچ دڵێکیان بە دانوستان خۆش نەبوو، بەڵکو ترسی حکومەتی بەعسیان هەبوو، وەکو ڕێوی لەلاوە ملیان بگرێتو بیانخوات.

لەو ناوەدا هیچی ڕسوا نەبوو تەنها بەعسیە کوردەکانو جاشەکان نەبێت لەگەڵ ئیتحادییەکانی ناو خوێندنگەکان، ئێمە وەکو خوێندنگەی ئامادەیی کشتوکاڵی بەکرەجۆ تەنها سەری بەرزمان بۆ مابوەوە کە ئیتحادمان نەبوو، خۆمان جێگەی ئەو مەسەلەیەمان گرتبووەوە خوێندنگەیەکی ئازادمان هەبوو، ڕێکخستنەکان ڕۆژانە پۆستەری شەهیدانیان هەڵدەواسی بەدیوارەکانی خوێندنگەداو کەس نەبوو لێیان بکاتەوە، وەکو بارەگای لێهاتبوو، ئێمە ئەو چەند کەسەی کە دیار بووین، هەموو خوێندکاران دەوریان دابووینو ئەیانووت: ئنجا ژووری ئیتحاد دەکەینەوەو یەکێتی خوێندکارانی کوردستان دادەمەزرێنین.

ڕۆژانە ئاهەنگ بوو لە هەموو خوێندنگەکانی سلێمانی و کورستاندا، ئیستگەی یەکێتی ئەوکاتە بە ئاسانی وەردەگیرا، بگرە خەڵک بە ئاشکرا ڕادیۆی بەدەستەوە دەگرت، یان لە ناو بازاڕو دوکانەکاندا بە ئاشکرا دەنگیان بەرز دەکردەوە، تۆمارگاکان سروودی نیشتمانیو شەهیدانیان لێدەدا، حیزبە سیاسییەکانی ئێرانیش وەکو کۆمەڵە و دیموکراتو چریکانی فیدایی و ئەوانە هەموو هاتبوونە سلێمانی بۆ پشوودان، پێشمەرگەی ئەم دیوو ئەو دیو تێکەڵ ببوون لەناو یەکدا.

سلێمانی تەواو ئازاد بوو، چەند تیپێکی پێشمەرگە لەناو شارا دەسووڕانەوە بۆ پارێزگاری لە خەڵکی شار، کاک وەهاب و جەمالی حەمەی خوا کەرەم سەرپەرشتییان دەکردن، هێزی پێشمەرگە تەواو هاتبوونە خوارەوە بۆ ناوچە نزیکەکانی وەکو شارباژێڕ و دۆڵە ڕووت، پیاوانو سیخوڕانی حیزبی بەعسیش بە خۆیانو جاشەکانیانەوە چاودێری خەڵکیان دەکرد.

پێش دانوستان هێزی پێشمەرگە لەڕێگا گشتییەکان بۆسەیان دادەنا بۆ

جاش و پیاوانی ڕژێمی بەعس و دەستیان لێدەوەشاندن، کەچی بەپێچەوانەوە لەدانوستانا جاشەکان بۆسەیان بۆ پێشمەرگە دادەناو چەند پێشمەرگەیەکی قارەمانی وەکو ملازم سەید کەریمیان شەهید کرد.

لەئەنجامی چالاکیەکی ناوشارا مامۆستا پێشڕەو بەدەستی جاشە خۆفرۆشەکان شەهیدکرا، ناوبراو لەپێش دانوستان لە کلکەی خەراجیان کەوتە کەمینی کۆمەڵێک جاشەوەو بریندار کراو تەسلیمیانکرد بەڕژێم، لەژێر ئازارو ئەشکەنجەدا ئیعترافی نەکرد، پاشان لەدانوستان ئازاد کرا، بەڵام دوایی هەر بەدەستی جاشە خۆفرۆشەکان شەهیدکرا.

من وەکو خۆم لەگەڵ ئەندامی حیزبی بەعسدا دانیشتوم، بۆ مناقەشە ئەیوت: ئێمە لەگەڵ سەرانی گەورەی حیزبدا کۆبوونەوەمان کردووە، پێمان وتوون وەفای ئێوە ئەوەندە بوو بۆ ئێمە، دەستتان لێبەردراینو ڕسواتان کردین، وەڵامیان ئەوەبووە هیچ خەمتان نەبێت، ئەمە شتێکی کاتییەو تەنها دەستی دەستییان پێدەکەین و دەبێت خۆیان بەپێی خۆیان بڕۆنەوە بۆ شاخ، تەنها تاقیکردنەوەی سەرانی سیاسیە کوردەکانەو دوایی دەیانبیننەوە چیان لێدەکەین، ئەمانە تەنها بۆ پارە هاتوونەتەوە بۆ دانوستان، چونکە پێشەکی داوای پارەیان کردووە نەک دانوستان.

مانگی ٣ی ١٩٨٤ لەگەڵ هاوڕێ جەمشید (عەمید فەرەیدون عومەر) شانەکانمان جیابوەوە، جەزا وتی:

- دەبێت هاوڕێیەکی تر بناسین ماڵیان لە مامۆستایانە، ماڵەکەیان لەودیو مزگەوتی قازی محەمەدەوە لەسەر گۆشەیەک خانویەکی غەربی گەورە بوو بەناوی شێخ عەلی کە ڕۆیشتین هێشتا لەخەو هەڵنەستابوو ئێمە بە خەبەرمان هێنا، کۆبوونەوەمان دەستپێکرد، لە قسەکانیدا پەلی هاویشت بۆ باری ئابوریو سیاسی ئەوروپاو ئەمریکا وتی: بەڕای من دەبێت وا بێ و وابێ.

جەزا وتی: کاکە ئێمە جارێ لە بارو زروفی ڕزگاری نیشتماندایین و ناگەین بە وڵاتانی ئەوروپا، ئەگەر کوردستان کەوتە ئەوەی نیشتمانێکی ئازاد بێت، ئەو کاتە دەتوانین قسەی لەسەر بکەین، ئەو کۆبوونەوەیەمان کرد، ٢-٣ جاری تر ڕۆیشتین بۆ ماڵیان یەکێک دەهاتە دەرەوە دەیوت: جارێ لە خەو هەڵنەستاوە سەربدەنەوە، جارێک دەیان وت: لە ماڵ نیە، پاشان هیچ مەوعیدێکی تری نەدا، ئێمەش وازمان لێهێنا.

* * *

دوای ئەو هاوڕێیەکی ترمان ناسی، ماڵیان لە سابوونکەران بوو لای گاووران، چەند جارێکیش ڕۆیشتین بۆ لای ئەو، ئەویش هەر ئارەزووی نەبوو دەمێک نەیوت ئەخوێنم، دەمێک ئەیوت ئیشم هەیە، لە کۆبوونەوەکاندا زۆر سست بوو، ناچار وازیشمان لەو هێنا، واملێهات وتم: جەزا ئەمە هەمووی پەنی یەکێتییە خەڵکی ئاوا سارد کردەوە لە کاری ڕێکخستن ئەمانە هەمووی کەسانی هەلپەرستو خەڵکی ئەم ڕۆژەن، هیچیان هاوڕێی ڕێکخستن نین ناکرێت هەر ڕۆژەی یەکێک بناسین، لە ئیشوکاری خۆشمان بێزار دەبین.

پاش چەند ڕۆژێکی تر جەزا وتی: هاوڕێیەکی تر هەیە دەبێت ئەوە بناسین ماڵیان لە مامۆستایانە، کاتێک ڕۆیشتین بۆ لای، ماڵێک بوو چەند خوێندکارێکی خەڵکی قەڵادزێ گرتبوویان بە کرێ، هەموویان لە ئامادەیی پیشەسازی بوون، ئەو کۆمەڵە گەنجە زۆر باشبوون، شانبەشانی خوێندن کاری ڕێکخستنیشیان دەکرد، ئێمەش کە ڕۆیشتین بۆ لایان ئەو کەسەی دەمانویست پەیوەندی پێوە بکەین، پێشتر پەیوەندی هەبوو بە شێخ عەلییەوە ئەو وازی هێناو ئەم هاوڕێیەیان خستبووە شوێنی بەناوی کارزان ئیسماعیل ئەم هاوڕێیە کوڕێکی باش و بە ئیلتیزام بوو، کە ئێمە دەڕۆیشتین بۆ لای ئەو دەڕۆیشتە ژوورێکی ترەوە، ئێمەش کۆبوونەوەمان لەگەڵ ئەنجام دەدا.

ڕۆژێک سەیرمانکرد ئەو هاوڕێیانەی تر لە هۆدەکەی تردا خەریکی لافیتە دروست کردنو دەستی وێنەکێشانیان هەبوو، زۆر بە جوانی لەسەرخام بە گەورەیی وێنەی شەهیدانیان بە بۆیەی ڕەنگاو ڕەنگ دروستدەکرد، ئەو وێنانەی دروستیان کردبوون، شەهیدان خوشکە سنەوبەرو شەهید ئارام و شەهیدانی قەڵادزێ و شەهیدەکانی ناوچەی پشدەر بوون.

جەزاش پێی وتن: لەم ڕۆژانـەدا مەراسیمێک ساز دەکرێت بۆ لێپرسراوی پۆلەکەمان، بەناوی شەهید (نەمر- خالید کەریم) لە گوندەکەی خۆیان گوندی کەنە سوورە، ڕژێمی بەعس ناوی داوەتەوە بە کەسوکاری کە شەهید کراوە، ئەگەر دەتوانن وێنەکەی دەهێنم بۆمان دروستبکەن، پاش چەند ڕۆژێک ٢ لافیتەی گەورەیان دروستکرد، یەکێکیان شەهید ئارام و ئەوی تریان شەهید نەمر، لە دوای دروستکردنی ئەو لافیتانە جەزا بە منی وت: دەبێت ڕۆژێک برۆین بۆ گوندی کەنە سوورە، کەرتی ڕێکخستنی بازیانیش ئامادە دەبن.

شەهید نەمر- خالید کەریم لەساڵی ١٩٨٢ لێپرسراوی پۆلەکەی ئێمەبوو، لەخۆپیشاندانەکانی ١٩٨٢ دەستگیرکراو ڕژێمی بەعس بەناحەق شەهیدی کرد، لەدوای شەهیدبوونی پۆلەکەی ئێمە بەناوی ئەوەوە ناونرا پۆلی شەهید نەمر.

ڕۆژێک کاک ئەحمەد کوردەو کۆمەڵێک پیاوی ترو من و جەزاش ڕۆیشتین بۆ

گوندی کەنەسوورە لەخوار سلێمانییەوە، کۆمەڵێک کادرو پێشمەرگەی کەرتی ڕێکخستنی بازیانیش هاتبوون، لەمزگەوتی ناو گوندەکەدا کۆڕو کۆبوونەوەیەکی جوانیان پێشکەش کرد، ئێمەش هەردوو لافیتەی شەهید ئارام و هاوڕێ ئەمر(خالید کەریم) مان هەڵواسی، ئەو ۲ لافیتەیە شێوازێکی جوانیدا بە مەراسیمەکە، پاشان هەموو ڕوومانکردە ماڵی شەهید ئەمرو سەرەخۆشیمان لێکردن.

دەمەو ئێوارەیەکی درەنگ کۆتایی بە مەراسیمەکە هات، کەرتی ڕێکخستنی بازیان داوای لافیتەکەی شەهید ئارامیان کردوو بردیان بۆ مقەڕی کەرتەکەیان، ئێمەش لافیتەی شەهید ئەمرمان پێشکەش بە بنەماڵەی شەهید کرد.



کاروان ئیسماعیل - ڕەئووف شێخ جەمیل

نـەورۆزی ساڵی ١٩٨٤ جیاواز تر بوو لە ساڵانی دی، خەڵک ئازاد بوو. پێشمەرگە بە سەربەستی دەسووڕانەوە، بڕیاریش بوو لەڕۆژی نەورۆزدا مام جەلال وتار بدات، ئەویش وەکو ئاهەنگێکی گەورە لە سووورداش ساز بکرێت. وە خەڵکیش خۆیان دڵیان گەرم بوو بۆ ئازادی، ئەوەی کە وجودی بۆ دانەئەنرا ڕژێمی بەعس بوو، بۆیە هەموو خوێندنگەکان بڕیاریاندا کە نەورۆز بکەنە ٢ نەورۆز، هەم نەورۆزی کوردو هەم نەورۆزی ئازادی، ئێمەش وەکو خوێندنگەی کشتوکاڵی بڕیارماندا کە نەورۆزێکی پڕ جۆش و خرۆش ئامادە بکەین، کچانو کوڕان هەموو بە جلی کوردییەوە بڕۆین بۆ خوێندنگەو نەورۆزی خۆمان بکەین. هەرچەندە ڕژێمی بەعس کردبووی بە پشووی ڕەسمی، بەڵام ئێمە وەک خۆمان نەورۆزێکی بەسۆزو ئاهەنگێکی پڕ شکۆمان سازکرد، هەمووی شیعرو وتار خوێندنەوە بوو بە باڵای کوردو کوردستاندا، بۆ نیوەڕۆکەی کۆتاییمان بە ئاهەنگەکە هێنا، ئنجا کوڕان و کچان هەموومان بەپێ بەرەو شاری سلێمانی گەڕاینەوە.

* * *

کۆتایی مانگی ٤ پێش ئەوەی مۆڵەت بدرێین بۆ تاقیکردنەوەی بەکالۆری پۆلی شەشەم، لە خوێندنگە خوێندکاران بڕیارماندا کە سەیرانی بەهارە بکەین، ڕۆژی پێنجشەممە دابنێین بۆ سەیرانی ئەو ساڵە.

سەیرانی ساڵی ١٩٨٤ جیاوازییەکی زۆری هەبوو لەچاو ساڵانی دی، چونکە ئازادی بۆ گەلی کورد هەبوو، زۆربەی خەڵک چەکی پێبوو، یاخود پێشمەرگە لەگەڵ ماڵ و خێزانی خۆیاندا بەچەکەوە دەڕۆیشتن بۆ سەیران، بازگەکانی ڕژێم هیچ کۆنترۆڵێکیان نەبوو بەسەر خەڵکدا، بەتایبەتی ڕۆژانی پێنجشەممە و

هەینی، بۆیە ئێمەش بڕیارماندا کە سەیرانی خۆمان بکەین، کۆمەڵێک لە کچانی خوێندنگە بەتایبەتی ئەوانەی لەگەڵ خۆمانا پەیوەندیو هاوڕێیەتیمان هەبوو، بە منو عەلییان وت: کە چەک بهێنین لەگەڵ خۆمان کە وێنەی پێوەبگرین، ئەوکاتە شانازی بوو وێنەگرتن بە چەکەوە، ئێمەش بڕیارماندا لەگەڵ خۆمان چەک بەرین.

بۆ ڕۆژی پێنجشەممە بڕیار درا بڕۆین بۆ دووکان و چەند پاسێکمان ئامادەکرد، هەموو خوێندکارەکان خـواردنو پێداویستی خۆیان ئامادە کردبوو، وەکو سەرپەرشتیاری خوێندکاران مامۆستا جەلال ئۆفەر هاتبوو لەگەڵمان، ئێمەش ئەو کۆمەڵەی خۆمان من و عەلی و وەهـابو حەمەعەلی و جەزای وەستا ڕەحیم کە هاوڕێی دەرەوەمان بوو وەکو خاوەنی سەیارەکە هات لەگەڵمان، بەسەیارەیەکی مسیۆبوشی تایبەت ڕۆیشتین، ئەوەندە پاس هاتبوو ڕێگا نەبوو بوەستن، لەدوکان کچ و کوڕ بەیەکەوە کۆمەڵێک وێنەی زۆرمان گرت، زۆربەی کچەکان بەچەکەوە وێنەیان دەگـرت، جگە لەو سەیرانە خۆشەو کۆمەڵێک وێنەی جوان هەتا ئێوارەیەکی درەنگ بە خۆشی ڕامان بواردو بەرەو سلێمانی گەڕاینەوە، دوای ئەو سەیرانە ئێمە خوێندکارانی پۆلی سێیەکان مۆڵەت دراین بۆ تاقیکردنەوەی بەکالۆری.



ڕەئووف شێخ جەمیل     عەلی حەمەڕەحیم

سەیرانی خوێندنگەکان بەهاری ساڵی ١٩٨٤

ڕۆژێ جەزا وتی: کە چەند پۆست کارتێکی شەهیدان لە ڕێکخراوەوە هاتووە، دەبێت بیدەین بە شانەکان، ئەوان دابەشی بکەن بۆ ئەو ماڵانەی پیایانا ڕادەبینن و هاوکاری خێزانی شەهیدان دەکەن، کارتەکە وێنەی شەهیدان (بەختیارو ڕەئووف و هۆشیار)، منیش دابەشی شانەکانم کرد، ئەوانیش دابویان بە خەڵکی باش و خاوەن هەڵوێست ٤٥٠ دینار یارمەتییان کۆکردەوە، منیش لەگەڵ ڕاپۆرتێک دام بە سەروو خۆم، ئەوەش یارمەتییەکی باشبوو بۆ خێزانی شەهیدان.

*

لە ڕێکخراو هیچ چالاکییەکمان نەما، تەنها چەند تەعمیمێک دەهات بۆمان وەک ئاگاداری یان بەیاناتی خوێندکارانی ئەوکاتە کە بەدەستی یاسا ناڕەواکانی ڕژێمەوە دەیاننالاند بۆ بەزۆر کردنیان بە جەیشی شەعبی ئەوەشی نەیکردایە دەریاندەکرد لە خوێندن.

ئەوەی ڕاستی بێت منیش تەواو بێزار ببووم تەنانەت نە دەڕۆیشتم بۆ لای جەزاش، دەتوانم بڵێم زۆربەی هاوڕێیانی ڕێکخراو بێزار ببوون چونکە ئەوەی ئێمە تێبینیمان دەکرد لەلایەکەوە دانوستان، لەلایەکەوە دژایەتی کردن لەگەڵ کورددا، زیاتر لەگەڵ خوێندکاران و مامۆستایان و هونەرمەندان چونکە ئەوانە پێشەواو پێشڕەوی کۆمەڵ بوون، لەو کاتەدا کەوتبوونە گیانی هونەرمەندانەوەو دەستیان کرد بە ڕاگواستنیان بۆ شارەکانی تر، وە دژایەتی کردنی مامۆستایان و بەزۆر کردنیان بە بەعسی و دژایەتی زۆری خوێندکاران، بەتایبەتی خوێندکارانی زانکۆی موصل، کە بەزۆر دەیانکردن بە جەیشی شەعبی.

چەند جارێک لەگەڵ جەزا کەوتبوومە کێشە کە بێزارم لە هەموو شتێک، هەرچەندە شانەکانی خـوارەوە زۆر لەگەڵم خەریکبوون کە واز لە ڕێکخراو نەهێنم، بەڵام من بە حوکمی ئەوەی پەیوەندیم بە ئیغتیالاتی ناوشارەوە هەبوو لەڕێکخراو سارد بوبومەوە، چونکە ڕێکخراو ئیلتیزامی تیادا نەما، هەموو هۆکەشی

ـنوستان بوو، من ئێستاش ناڵێم دانوستان، بەڵکو ئەڵێم چۆکدادان، چونکە
ـەک ڕێکخراوی ناو شارەکان بەڵکو هێزی پێشمەرگەو تەنانەت کادرەکانیش
ـڕازی بوون بە دانوستان، ئەمە کاری چەند سەرکردەیەکی ناو یەکێتی نیشتمانی
کوردستان بوو کە لە خۆیان بایی ببوون بەو هێزەی کە هەیانبوو کە شەڕیان
ـەگەڵ هەموو لایەک دەکرد.

ڕژێمی بەعس لە ڕێگەی د. قاسملۆوە ئەم دانوستانەی دروستکردو ساردی
کردنەوە.. لە چالاکی و لە خەباتی پێشمەرگانە.

بەهۆی کاری هەڵەی سەرکردەکانی دانوستانەوە، بێزار بووم و بە تەواوی وازم
ـە ڕێکخراو هێنا، لێرەدا خەباتی ڕیکخراوەیم کۆتایی پێدێت و نێوانی من و جەزا
ـە خەباتی نهێنیدا کۆتایی هات.

ساڵی ١٩٨٥ دوای کۆتایی هاتنی دانوستان، کاک ئەحمەد کوردەو خێزانەکەی
گیران و جەزاو براکانیشی ڕۆیشتن بۆ شاخ، چونکە لەدوای دانوستان جێگایان
نەبووەوە بەهۆی تەنگ پێهەڵچنینی ڕژێمی بەعسەوە، هەموو کوڕەکانی کاک
ئەحمەد بوون بە پێشمەرگەو دوای ئازادبوونی کاک ئەحمەد کوردە، ئەوانیش
ڕویان کردە شاخ، پاشان بەر تۆپبارانی کیمیاوی گوندی زێوێ کەوتن، جەزاش
لە داستانی رزگاریدا بەسەختی بریندار کرا، تا گیرانی سەرگەڵو بەرگەڵو ئەوان
هەر بە شاخەوە بوون، دوایی بەخێزانی ڕویان کردە ئێران، دوای ئەوە جەزا
بە ماڵو خێزانەوە ڕۆیشت بۆ تاراوگە بۆ وڵاتی بەریتانیا، هەتا دوای ڕاپەڕین
لە ساڵی ١٩٩٣ دا من و جەزا یەکمانگرتەوە، لەساڵی ٢٠٠١ دا لە ئەڵمانیاوە
بەسەردان ڕۆیشتم بۆ لایان لە لەندەن، ئێستا لە سلێمانی دەژیەو خانەنشینی
پێشمەرگەی کەمئەندامە.




ڕەئووف شێخ جەمیل    سابیر کۆکەیی    جەزای ئەحمەد کوردە

بەریتانیا- لەندەن- ساڵی ٢٠٠١

له مانگی ٥ دا هاورێ بابیز شەوێک منو عەلی بانگکرد بۆ ماڵی خۆیان، ئەوکاتە ماڵیان لە خانووەکانی مەعمەلی جگەرە لەسەری ئەو سەر لە گەڕەکی ڕزگاری بوو، وتی: بۆ کارێکی پێویست بانگم کردون، پاش قسەکردنێکی زۆر، وتی: حەزمکرد کەس لەماڵ نەبێت با بەسەربەستی خۆمان دانیشین، پاشان کاسێتێکی ڤیدیۆی هێناو سەیرمانکرد، گۆران بۆی باسکردین کە چۆن کاربەدەستانی شاری سلێمانی سەر بە ڕژێم سەرگەرمی ڕابواردنن لەگەڵ ژنی یەکتردا، (ئێستا پێویست ناکات ناوی ئەو کەسانە بهێنم تا سووکایەتیان باسبکەم، چونکە ئەوانەی خۆمان زۆر شەریف تر نین تا باسی خۆفرۆشان و پیاوانی بەعس بکەین)، گۆرانیش کاسێتەکەی دەستکەوتبوو، وتی: دەینێرم بۆ مام جەلال بابیبات بۆ سەرانی بەعس کە ئەوە کردارەکانیانە لەناو شاردا، ئەوە ئەندامەکانی حیزبەکەیەتی چی دەکەن، پاشان کاسێتێکی تری داینێ، وتی: ئەمە ٣ سەعاتییە لێرە مەجال نیە سەیری بکەین، خۆتان بیبەن سەیری بکەنو بۆم بهێننەوە چونکە سوودی هەیە بۆتان، سەیرمکرد گۆران چەکێکی ویزەی داناوە لە پاڵ خۆیدا، منیش زۆر حەزم لێکرد، عەلیش وتی: چییە حەزت لەوەش کرد، گۆران وتی:

- ببورە ناتوانم بتدەمێ بۆ خۆم پێویستمە، منیش دەستمدایە، سەیرمکرد فیشەکی دەمانچەی میکارۆڤ ٣٢ فیشەکی دەخوارد، دەسکەکەی وەکو کلاشینکۆفی مزەلی درێژ دەبێ، وتم: ئەگەر بیبەم دڵم دەشکێنی؟ وتی:

- باشە بۆ ماوەی هەفتەیەک بیبە، بەڵام بەمەرجێک نابێت یەک شتی لێبێت، چونکە ناو شار تەنها ئەو ویزەیەی تیایە، منیش بێ سێو دوو بردم، بەڵام ئەوەندە جوان بوو، دڵم نەدەهات دەستکاری بکەم، تەنها بەشەو من و عەلی هەڵمان دەگرتو لەگەڵ خۆمان دەمانبرد، دوای هەفتەیەک گۆران خۆی داوای کردەوەو منیش بۆم گەڕاندەوە.

بۆ شەوی دوایی، من و عەلی کاسێتەکەمان برد بۆ ماڵی نەوزادی خزمی عەلی لە حاجیاوا، وەهاب و حەمە عەلی هاورێشمان ئاگادار کرد، ئەو شەوە ماڵی نەوزاد کەسی لێنەبوو، وتمان بەسەربەستی خۆمان دادەنیشین فیلمەکە دەبینین، دەستمان دایە تەلەفزیۆن ڤیدۆی وەرنەگرت، چییەتی؟ پاڵ سیگامی تیا نییە، ئەی چی بکەین؟ عەلی وتی:

- با بڕۆین تەلەفزیۆنەکەی ماڵی خۆمان بهێنین.

سیانمان ڕۆیشتین، تەلەفزیۆنی ماڵی عەلیمان هێنا، لە گەڕەکی خەباتەوە نامان بەشانمانەوە بردمان بۆ حاجیاوا، ئنجا فیلممان سەیر کرد، فیلمەکە باسی شۆڕشەکانی کورد بوو هەر لە شۆڕشی ئەیلولی ساڵی ١٩٦١ وە تا ١٩٨٤، مەلا مستەفاو مام جەلال، ئنجا ڕێککەوتننامەی جەزائیر، شۆڕشی ئیسلامی ئێران‌و حیزبە کوردییەکانی کوردستانی ئێران‌و شێخ عیزەدین و قاسملۆ ئەوانەی هەموو تیادا بوو. بۆ ئەو کاتە سودێکی باشی هەبوو، چونکە ئەو جۆرە فیلمانە دەگمەن بوون.

* * *

مانگی ٥ مۆڵەت درابووین بۆ سەعیکردن بۆ تاقیکردنەوەی بەکالۆری. دوانیوەڕوان گوێمان دەگرت لە ئیزگەی یەکێتی، تا بزانین ڕۆژانە چەند کەس ئازاد دەکرێن، من و عەلی بەتایبەتی بۆ ناوی حاجی گوێمان دەگرت، چونکە ڕۆژانە ڕژێم ناوەکانی دەدا بە سەرانی یەکێتی و ئەوانیش وەکو دەستکەوتی دانوستان ناوەکانیان دەخوێندەوە، بەڵام ڕژێم بە ناوی لێبوردنی گشتییەوە ئازادی دەکردن..

ڕۆژی ١٠/ ٥ من و عەلی عەسرەکەی گوێمان گرتبوو چاوەڕوانی ناوی حاجیمان دەکرد، بەزنجیرە ناوەکانی دەخوێندەوە، وتی ٢٦ جەلال عەبدوڵڵا من و عەلی بەپەلە ڕۆیشتین بۆ ماڵی حاجی مژدەیان بدەینێ.

دایکی حاجی‌و خوشکەکانی دانیشتبوون، وتیان: ئێمەش گوێمان لێبوو کە

ناوی حاجی خوێندەوە.

دوای ٢ ڕۆژ حاجی ئازاد کرا، لای عەسر بوو عەلی هات بۆ لام، وتی:

- بابڕۆین حاجی لەماڵەوەیە، ڕۆیشتین بۆ لای دەوری حاجی قەرەباڵغ بوو، لەگەڵ ئێمەی بینی باوەشی پیاکردین.

ئەو خەڵکەی لەماڵیان دانیشتبوون هەموویان سەریان سووڕما، چاومان پڕ ببوو لە فرمێسک، ئنجا دایکی حاجی باوەشی پیاکردین، وتی: حاجی بڕوا بکە پێیان لێنەبڕیوم، کەمالی موهەندیس، گۆران، مەلا ناسر، برادەرانی تر هەموویان هاتوون دڵخۆشییان داوینەتەوە زۆر هاوکارمان بوون، هەستمان نەکردووە کە تۆ گیراویت.

ڕۆژی دوایی من و عەلی ڕۆیشتینەوە بۆ ماڵی حاجی، عەلی بە حاجی وت: ئەمڕۆ گۆرانو کەمالی موهەندیس دێن بۆ سەردانت ئاگادار بە.

پاش سەعاتێک ئەوانیش هاتنو ئنجا ئێمە ڕۆیشتینە ژوورێکی ترەوە دانیشتین، بە چروپڕی قسەمان کرد دەربارەی دانوستان و وەزعەکە، کە هیچ شتێکی دڵخۆشکەرەی تیادا بەدی ناکرێت بۆ کورد، پاشان گۆران زەرفێکی دایە دەست حاجی.

کە گۆرانو کەمال ڕۆیشتن، حاجی زەرفەکەی کردەوە ١٥٠ دیناری تیا بوو، وەکو دیاری بۆیان هێنابوو، حاجی ویستی بەشی بکات لەگەڵمان، بەڵام ئێمە ڕازی نەبووین.

ڕۆیشتینەوە ناو میوانەکان، حاجی دەستیکرد بە گێڕانەوەی بەسەرهاتی خۆی کە چۆن ئازارو ئەشکەنجەیان داوە، شتی وای باسدەکرد ئێمە سەرمان سووڕدەما، چۆن ماوە لەژێر ئەشکەنجەدا.

زۆربەی میوانەکانی حاجی ڕۆیشتن، حاجی بە من و عەلی وت: لەم ماوەیەدا جوابتان لێدەگێڕمەوە کە دەعوەتی زابتێکی ئەمنم کە لەسجن بووە بە هاوڕێم، خۆی وەعدی داوە کە من ئازاد بکرێم دەعوەتێکم بکات، لە خواردن و خواردنەوەی ئوتێل سلێمانی (سلێمانی پالاسی ئێستا)، ئەوکاتە نادییەکەو مەتعەمەکەی

لەدیوی ئەم دیوەوە بوو، ئێستا هەمووی دوکان و بازاڕە، منیش وتم: حاجی من نایەم، دەترسم سەرمان بکەیت بە گۆما، حاجی، وتی: ئەگەر نەیەیت زویر دەبم، بزانە حاجی چۆن قارەمانێک بووە لە سجن.

پاش هەفتەیەک، حاجی و عەلی وتیان: مەوعیدەکەمان ڕێکخستووە بۆ دەعوەتی زابتەکە.

سەعات یەک ڕۆیشتین زابتە ئەمنەکە هەر خۆی دانیشتبوو، لەگەڵ حاجی یەکتریان ماچکردوو ئێمەشی پێناساند، عەلی بەناوی (عەباس) منیش بەناوی (ئەحمەد)، پاش نان خواردن بیرەمان بۆ بانگکرا، پاشان زابتەکە کەوتە مەدحی حاجی، کەسێکی چەند خۆڕاگر بوو، وتی: تەنانەت هەموو ئەمنەکان سەرسام دەبوون لە خۆڕاگری حاجی، ئێمە لێماندەدا ئەو خۆی لە ئێمە نزیک دەخستەوە، وامانلێهاتبوو ببووین بەبرادەر، هەموو کۆڵمان دابوو لە ئیعتراف پێکردنی.

یەکی ٢ بیرەمان خـواردەوە، سەعات ٣ هەستاین ویستمان پارە بدەین، ئەمنەکە ڕازی نەبوو، وتی:

- من خۆم وەعدم داوە، ئەگەر حاجی ئازاد بکرێ دەعوەتی بکەم، کاتەکەش مفاوەزاتە بۆ هەمووماان باشە، ئینشائەڵڵا بەینمان باش دەبێتو کوردو عەرەب بەیەکەوە ئاسودە دەژین.

کۆتایی مانگی ٥ کاکم و براژنم ناونیشانی کچێکیان پێدام لە بەرزنجە کە دایکی ئامۆزام بوو، وتیان بۆ نارۆیت بیبینی بەڵکو بەدڵت بێت.

منیش لای شێخ ئەحمەدی کارگوزاری خوێندنگەکەمان باسمکرد، کە خەڵکی بەرزنجەو خزمیشم بوو، وتی من ئەیانناسم، خۆم دێم لەگەڵت، ڕۆژێک بە ماتۆڕ لەگەڵ شێخ ئەحمەد ڕۆیشتین بۆماڵیان لە بەرزنجە کە چاوم بە کچەکە کەوت بەدڵم بوو، ئەوەی من دەمویست بۆ هاوسەرو هاوڕێی ژیانم لە هەڵسو کەوتی ئەوا هەبوو، لە دوای ئەوە بەسەیارە لەگەڵ عەلی و وەهاب و جەزای وەستا ڕەحیم دەڕۆیشتین بۆ ماڵیان، لەو ماوەیەدا هەموو شتێکم لەگەڵیدا بڕاندەوە بڕیارم دا دوای تەواوبوونی خوێندنم هەموو شتێک تەواو بکەم، ئنجا کەوتمە داوی خۆشەویستییەوە و هەمیشە لە یادم بوو.

* * *

لە ١٩٨٤/٦/١ دا دەستمانکرد بە تاقیکردنەوەی کۆتایی ساڵ، ماوەی ١٥ ڕۆژی خایاند.

دوای تەواوبوونی قۆناغی خوێندن، ڕۆیشتمەوە بەلای دەستگیرانەکەمەوە، ئنجا کێشەی ئەویش لەولاوە بوەستێت، لە ماڵیشەوە دایک و باوکم و ئەوان حەزیان دەکرد من ژن بهێنم، چونکە تەنها من مابووم لە خێزانەکەمانا کە ماڵو هاوسەری خۆمم هەبێت، عەلیش زۆر هانی ئەدام، ئەیوت:

- تۆ دەستپێشخەری بکە، بڕیار بێت منیش ژن بهێنم، هەرکاتێک بڕۆیشتمایە بۆ لای دەستگیرانەکەم، یەکێک لەهاوڕێکانم دەهاتن لەگەڵم لەبەر چەند هۆیەک، هەموو جارێکیش دەمانچەو ڕومانەم لەگەڵ خۆم دەبرد، ئەو کێشەیەم لە مەڵبەند لای مەلا بەختیارو حاکم قادرو حاکم سەردار باسکردبوو، بەڕاستی

ئەوانیش دڵسۆزانە کێشەکەیان بۆ چارەسەر کردم، (پێویست ناکات لێرەدا باسی ئەو کێشەیە بکەم).

ڕۆژێک خۆم بەتەنها ڕۆیشتم بۆ ماڵیان لە بەرزنجە، لای نیوەڕۆ ڕۆیشتم بۆ مزگەوت، (بەرزنجە هەرچەندە ناحیەش بوو، بەڵام خەڵکەکەی وەکو لادێ هەڵسوکەوتیان دەکرد، دەبوایە پیاوان بڕۆیشتنایە بۆ مزگەوت، ژنان بۆ کانی). دەمانچەو دوو ڕوممانەم پێبوو، ئەوەندەمزانی ٣ سەرباز ئەملاو لایان لێگرتم. یەکێکیان بە جۆرێک بە عەرەبی وتی: زابتەکەمان بانگت دەکات، منیش وتم: غەڵەت نەکەن لەگەڵم، قبوڵی ناکەم لێتان، ئێوە بڕۆن خۆم دێم بۆ لای.

ناو بەرزنجە قەرەباڵغ بوو، تەنانەت جاشیشی لێبوو، چەند پێشمەرگەیەک بەچەکەوە هاتن، وتیان:

- خەمت نەبێت، بڕۆ بۆ لایان یەک شت ببێت ئێمە قبوڵی ناکەین.

ڕۆیشتم بۆ لای زابتەکە، تەوقەی لەگەڵ کردم و پرسیار و پرسیارکاری؟ وتی: ئیشت چییە لێرە؟

کاری خۆم تێگەیاند، وەرەقەی لیژنەی تەنسیقم پێبوو بۆ دەمانچەکەم، زابتەکە وتی: لە مەڵبەند حاکم سەردار دەناسی؟ هاوڕێی زانکۆمە، بڵێ مولازم ئەوەل جاسم سەلامت لێدەکات ئیتر زۆر لە خۆی بووەوە، وتی: جاشەکان پێیان وتین ئێمە ناتوانین قسەی لەگەڵ بکەین تۆ بانگی بکە، بزانە چی دەکات لێرە، وتی: هەرچی کێشەیەکت هەبوو بە من بڵێ؟!

ئەوەندەمزانی خەزوریشم هات، ئەو عەرەبی دەزانی، کە زابتەکە ئەوی بینی. وتی:

ئێمە نەهاتووین بۆ خراپە لەگەڵ خەڵک، ئێوە خۆتان جاشەکانتان خراپە دەکەن.

منیش وتم: ئەوان شیعاری جاشایەتییان هەڵگرتووە، جاش بەمانا کوردییەکەی کوڕی کەر، ئەو، ئەو ناوە قبوڵ بکات هەموو شتێک قبوڵ دەکات.

ڕۆژێک عەلی وتی: حاجی دەمانچەی پێ نیە، خۆت دەزانی ئەو کاتە بە دەمانچەکەیەوە گیرا، ئەڵێم با دەمانچەیەکی بۆ بگرین بە دیاری بیدەینێ، چونکە حاجی هەموو شتێک دەهێنێت.

بۆ ڕۆژی دواییتر ڕۆیشتین بۆ ژێر پردەکە چەند ئیڤایەک هاتن، کەسی وایان لەگەڵ نەبوو کە دەمانچەیان پێبێت، دیسان بۆ ڕۆژی دوایی ڕۆیشتینەوە وەستاین نائیب زابتێک دەمانچەیەکی میکارۆفی پێبوو، لەگەڵ عەرەبانەیەکی حەماڵیدا هات، ڕۆیشتینە نزیکیەوە ئەویش کەمێک مەشغوڵ بوو بە شت داگرتنەوە، من دەمانچەم لێڕاکێشاو دەستی بەرزکردەوە، عەلی دەمانچەکەی لێکردەوە، کاکی حەماڵ بە عەرەبانەکەیەوە سەر بەرەو خوار ڕایکرد، ئێمەش ڕامانکرد بۆ لای مزگەوتی گەورە، خۆمان کرد بە کۆڵانەکانی پشتی مزگەوتەکەداو ڕۆیشتین.

بۆ دوا نیوەڕۆکەی ڕۆیشتین بۆ لای حاجی و دەمانچەکەمان پێشکەشکرد، وتمان:

- ئێمە پارەمان نیە بۆت بهێنین. ئەوە دەمانچەیەک.

وتی: من دەمانچەی ئێوەم ناوێت، لە گۆران و ئەوانی وەردەگرم یان خۆم دەیکرم.

وتمان: ئەوە شۆڕش بۆی ناردووی؟!

پێکەنی وتی: هەرچی سەیری دەکەم، ئەم دەمانچەیە گیراوە، ئێمەش ڕاستییەکەمان بۆ گێڕایەوە چۆنمان گرت، ئەبێ ئەوەش بڵێم کاتێک ئێمە ئەو دەمانچانەمان دەگرت زۆر پێمان ناخۆشبوو کەئەو سەربازو ئەفسەرانە دوایی تووشی لێپرسینەوە دەبون، بەڵام دوو هۆ بوو، یەکەم: ئەو دەمانچانە بۆ هەڵگرتن زۆر بچووک بون بۆ ناوشار، دووەم: دەمانچەی چاک بون بۆ حاڵەتی تەقەکردن.

حاجی هەموو گیانی پێکەنین بوو، کەسێکی زۆر لێهاتوو بەوەفاو بێ خیانەت

بوو، حەزی بە تێکۆشان دەکرد، هاوڕێ پەرست بوو خۆی لەسەر برادەر بە کوشت دەدا، هەمیشەماڵەکەیان پڕ بوو لە هاوڕێی کۆمەڵە، خێزانەکەشیان بە هەمان شێوە بەتایبەتی ڕەعنا خانی دایکی، مانعی نەبوو وەکو ئافرەتێکی تێکۆشەر هەموو کارێک ئەنجام بدات بۆ شۆڕش، خوشکەکانی نەسرینو پەروین کە چەندەها جار بەیاناتیان دەبرد بۆ خوێندنگە بڵاویان دەکردەوە، ئێمە شوێنی سەرەکیمان ماڵی حاجی بوو بۆ هەموو کارێک، چونکە تێکڕای خێزانەکەیان شۆڕشگێڕ بوون، باوکیان هەمیشە خەریکی دەرس و دەوری قورئان بوو، ئەو حەقی بەسەر کەسەوە نەبوو، هەموو جارێک دەمانووت: ڕەعنا خان مامۆستا سەید عەبدوڵڵا لەکوێیە؟

بەسەر ئیشارەتی دەکرد بۆ ژێر زەمینەکەی خۆیان دەیوت: حەقتان نەبێت بەسەرییەوە عیلاقەی هیچی نیە هەر خۆی سەلامەت بێت گوێ نادات بەوە لای، ئێمەش پێدەکەنین.

با ئەوەش بڵێم مەلا ناسر یەکێک بوو لە برادەرە بە وەفاکانی حاجی کە زۆر یەکتریان خۆش دەویست هەمیشە لە ماڵیان بوو، من لەوەوپێش مەلا ناسرم دەناسی بەهۆی ماڵی حاجی جەلالی دراوسێمانەوە، دوایی بەهۆی حاجی و عەلییەوە هاوڕێیەتیمان زیاتر خۆشبوو.

سەرەتای مانگی ٧، ئێوارەیەک باوکم هاتەوە بۆماڵەوە، هێشتا خۆی نەگۆڕیبوو بانگی کردم وتی: ڕەئووف؟ هەواڵی عەلی نازانیت، ئەمڕۆ نەتبینیوە؟

- نەخێر، نەمبینیوە، بۆچی؟!

- بڕۆ هەواڵێکی بزانە، ئەمڕۆ بە عەلیم زانی، بە دەست قوات خاسەکانەوە لەبەردەم دوکانەکەمەوە بە شپرزەیی بردیان، هەر سەیری منی دەکرد؟

منیش لە ماڵێکی دراوسێمانەوە تەلەفۆنم کرد بۆ ماڵەوەیان، وتیان: عەلی گیراوە.

بەپەلە خۆم گۆڕیو بە باوکم وت: قسەکەی تۆیە ئەو بووە گیراوە.

ڕۆیشتم بۆ ماڵیان هەموو شپرزە بوون، وتیان: بە دەمانچەکەیەوە گیراوە، وەستا جەباری برای دەیوت: من خەمی دەمانچەکەمە بزانن هی حکومەتەو لێکۆڵینەوەی لەسەر بکەن حسابی دەڕوات.

تا درەنگانێکی شەو لە ماڵیان دانیشتم هەر دڵخۆشیم دەدانەوە، بۆ سبەینێ مەوعیدم ڕێکخست لەگەڵ وەستا جەبار بڕۆین بۆ سووورداش، بەڵکو سۆراخێکی بکەین.

ڕۆیشتین بۆ سووورداش بۆ لای مەلا بەختیار وتمان: عەلی بە دەمانچەکەیەوە گیراوە، ئەویش کەمێک بۆڵە بۆڵی کرد، وتی: هەتا بتوانم هەوڵی بۆ دەدەم و ڕزگاری دەکەم، عەلی زۆر چاکەی هەیە بەسەرمانەوە، بەڵام ئەوەش بزانن خەتای خۆیەتی، چونکە ئێوە سوور دەزانن دانوستان لە کاڵبوونەوەدایە، حکومەت خواخوایەتی یەکێک پێی خوار دابنێت، ئێستا کەی وەختی دەمانچە هەڵگرتنە بە ئاشکرا ؟!

مەلا بەختیارمان ئاگادارکردو بۆ نیوەڕۆکەی گەڕاینەوە بۆ ماڵی عەلی، من ماتۆڕەکەی عەلیم دەرکردوو، ڕۆشتم بۆ ماڵی گۆران ئاگاداری بکەم، گۆران لەماڵ نەبوو، ڕۆیشتمەوە بۆ لای خانەقا، هەر نەمبینی ئنجا ڕۆیشتم بۆ لای حاجی،

ئاگادارم کرد عەلی گیراوە، زۆری پێناخۆش بوو، وتی: چی بکەین باشە؟

وتم: هەوڵێکی باش بدەین چونکە وەفا خۆشە بۆ هاوڕێیان، بەڵێ ئەو هەڵەی خۆیەتی گیراوە دەبێت هەر چۆنێک بێت ڕزگاری بکەین.

بۆ ئێوارەکەی لەگەڵ حاجی ڕۆیشتینەوە بۆ لای خانەقا کەسمان نەبینی، بۆ شەوەکەی لەگەڵ حاجی ڕۆیشتینەوە بۆ ماڵی گۆران لە ماڵ نەبوو.

بۆ ڕۆژی دوایی لەلای سلێمانی پالاس لە سەیارەیەکی بەڕازیلیدا بینیم، منیش بە ماتۆڕەکەوە ئیشارەتم بۆ کرد، وەستاندم مەسەلەکەم تێگەیاند دەستیکرد بە قسەکردن، هەتا قسەی ناخۆشیش، وتی:

- هەمووتان دەستتان داوەتە بەرەڵڵایی، کەی ئێستا وەختی دەمانچە هەڵگرتنە. عەلی ئەڵێی عەسابەیە بەو بازاڕەدا دەڕوات، ئنجا کێ دەتوانێت رزگاری بکات نەخوازە بە دەمانچەشەوە.

من زۆرم قسە بۆ کرد، وتم: دوێنێ مەلا بەختیارم ئاگادار کردووە، دەبێت بە هەموومان هەوڵی بۆ بدەین، وتی: سبەینێ وەرە، بۆ لای دائیرەی ئیستخبارات بزانین ئاوات عەبدولغەفور نابینین.

بۆ ڕۆژی دوایی لەگەڵ حاجی ڕۆیشتین بۆ ئەوێ، گۆران لەگەڵ برادەرێکدا وەستا بوو، ئێمەش سەلامەمان لێکردن، وتی:

- ئەم برادەرە دەناسن؟ کاک دڵشاد مەریوانی، بەیەکی ناساندین، (دوایی کە ڕۆیشتین زۆر باسی دڵشاد مەریوانی بۆ کردین چ کەسێکی تێکۆشەرە) وتمان:

- چیت کرد؟ وتی:

- کاک ئاوات لە ژورەوەیە، ئێستا دێتە دەرەوەو پێی دەڵێم.

پاش کەمێک کاک ئاوات هاتو پێمان ووت :

- وتی: دوێنێ مەلا بەختیاریش پێی وتووم، تەئکیدیشی کردەوە کە دەبێت بەگەرمی هەواڵی بزانم، وتی: بەینمان بەرەو باشی ناڕوات لەگەڵ حکومەت، ئیشو کارەکانمان باش نیە، حکومەت زۆر گلەیی هەیە ئەڵێن دەستوەشاندنی زۆر لە هێزەکانمان دەکرێت.

من و حاجی ڕۆیشتینەوە بۆ ماڵی عەلی، مەسەلەکەمان تێگەیاندنو دڵخۆشیمان ـانەوە.

دایکی عەلی زۆر بێتاقەت بوو، لەگەڵ ئەوەشدا ئافرەتێکی بێدەنگو لەناخەوە ـەکوڵا، بەس دەرینەدەبڕی.

ئنجا ڕۆژانە دەڕۆیشتم بۆ ماڵی عەلیو زۆربەی کات هەر لەوێ بووم.

* * *

کۆتایی مانگی ٧ ڕۆیشتم بۆ ماڵی حاجی، پاشان بەیەکەوە ڕۆیشتین بۆ بازاڕ چاومان بە گۆران و ئەوان بکەوێت، ڕۆیشتین بۆ فولکەی خانەقا کەسمان نەبینی، پیاسەیەکی ناو بازاڕمان کرد، سەیرمکرد حاجی دەمانچەی پێیە، سوێندم لێخوارد دەبێت بگەڕێینەوەو من نایەم لەگەڵت، وتم: هێشتا عەلی ئازاد نەبووە نۆرەی تۆیە.

- وتی: باشە کاکە دەگەڕێینەوە، ڕۆیشتینەوە بۆ لای خانەقا، گۆرانمان بینی بە حاجیم وت: شکاتت لێدەکەم، هەرچی حاجی وتی: قسە نەکەی، بە هاوڕێ بابیزم وت حاجی دەمانچەی پێیە، ئەویش سەرزەنشتی حاجی کرد، حاجیش وتی: ئەی خۆت، بابیز وتی: کوا من دەمانچەم پێیە، حاجی بەمنی وت: دەست لە گیرفانی لای ڕاستی شەڕواڵەکەی بدە.

(هاوڕێ بابیز دەمانچەی لای ڕانی ڕاستی دەبەست و گیرفانی شەڕواڵەکەی لەناوەوە لێکردبوەوە)، وتم:

- هیچ کاکە تەکساسە، دەبا عەلی هەر لەوێ بێت بەخوا ئەویش بێتە دەرەوە هەمان شێوە دەستپێدەکاتەوە.

هاوڕێ بابیز وتی: ئیشمان بۆ عەلی کردووە، بەم زووانە ئازاد دەبێت، ئەوەی بۆ ئەو کراوە بۆ کەس نەکراوە هەر لە هەوڵداین، قەدەرێکی زۆر وەستاین لای جادەی کاوە، پاشان لەیەک جیابووینەوە.

بۆ ڕۆژی دوایی ڕۆیشتم بۆ ماڵی عەلی، وەستا جەباری برای وتی: تەلەفۆنمان بۆ کراوە بۆ چاوپێکەوتنی لە دائیرەی ئەمن.

پاش ٢ ڕۆژی تر ڕۆیشتمەوە بۆ هەواڵپرسین، وەستا جەبار وتی:

- منو پورم ڕۆیشتین بۆ لای تەنها دوور بەدوور لە نێوانی شوشەوە بینیمان، نەمانتوانی قسەی لەگەڵ بکەین، بە ئیشارەت وتی: چەند ڕۆژێکی تر ئازاد دەبم.

* * *

ڕۆیشتم بۆ لای حاجی هەواڵی عەلی پێبڵێم، وتی: ئاگاداری هەموو شتێکم.

- وتم: بەنیازم دەستگیرانەکەم بگوێزمەوە، لەبەر عەلیش دڵم نایەت.

- حاجی وتی: کاکە برۆ ئیشی خۆت بکەو لێی مەوەستە، هەر کەسێک قسەی کرد من وەڵامیان دەدەمـەوە، چیش بڵێیت ئامادەم، چونکە من دەزانم تۆ کێشەت هەیە، تا دانوستان ئەم تۆزەشی بەبەرەوە ماوە، بە قسەی من بکە، عەلیش بەمزوانە ئازاد دەبێت.

منیش ١٩٨٤/٨/٤ هاوسەرگیریم کردو ژیانی خێزانیم پێکهێنا .

* * *

١٩٨٤/٨/١٠ عەلی ئازاد کرا، ڕۆیشتم بۆ ماڵیان خۆشحاڵی خۆمان بۆ یەکتر دەربڕی، خەڵکێکی زۆر لە خزم و کەس کۆببوونەوە، پاشان برادەران هەموو هاتن بۆ لای.

لە مەجالێکدا، پێموت: کە ژنم هێناوەو داوای لێبوردن دەکەم تۆ لەو حاڵەتەدا بووی.

وتی: لێبوردنی چی بەسەری تۆ ڕێگات بۆ خۆشکردم با ئەم قەرەباڵغییە نەمێنێت منیش ژن دەهێنم، یانی تۆ ژنت هەبێت، من نەم بێت؟!، خەمت نەبێت لەمەشدا هەر بەیەکەوەین، (بوو بە پێکەنین).

دوای هەفتەیەک عەلی هات بۆ لام، وتی: حەز دەکەم لەماڵەوە دەعوەتێکتان

بکەم، حاجی و مەلا ناسریش بانگ دەکەم، بۆ ڕۆژی دوایی سەعات ١٠ ی سەرلەبەیانی خۆم و هاوسەرەکەم ڕۆیشتین بۆ ماڵیان، دەعوەتەکە بۆ نیوەڕۆ بوو، حاجیو مەلا ناسریش ئامادەبوون، بۆ نیوەڕۆ نانمانخوارد، پاشان من و عەلی و حاجی و مەلا ناسر لە ژوورێکدا دانیشتین، باسی ژیانی خۆمان دەکرد، عەلی باسی زیندانی بۆ دەکردین، ناوی هەر زابت و ئەمنێکی دەهێنا، حاجی دەیوت: دەیناسم و ئەشکەنجەی چاکی داووم.

دوای سەعات ٤ ی عەسر حاجی و مەلا ناسر ڕۆیشتن، عەلی وتی: بڕیارە ئەمڕۆ گۆرانو کەمالی موهەندیس بێن بۆ سەردانم، سەعات ٥ ی ئێوارە ئەوانیش هاتن، ماوەی سەعاتێک دانیشتنو زۆرمان قسەکرد دەربارەی کارەکانی خۆمان.

* * *

دایکی عەلی، لە گرتنی عەلییەوە تووشی نەخۆشی ببوو، هیچ دکتۆرێک چارەسەری نەدەکرد، عەلی بردیشی بۆ بەغداد چارەسەری نەبوو، کەسوکاری ئەیانووت: خورپەی گیرانەکەی عەلی وایلێکرد ئەگینا لەوەوپێش عەیبی نەبوو.

دایکی عەلی بە عەلی دەووت: هەتا من ماوم لە ژیانا دەبێت ژن بهێنیتو ماڵ و خێزان دروست بکەیت، عەلیش لەبەر خاتری دڵی دایکی بڕیاریدا ژن بهێنێت، هات بۆ لای من وتی: ئەڵێم ژن بهێنم تۆ دەڵێیت چی؟ بەڵکو دایکم چاک ببێتەوە، (کردمان بە پێکەنین)، وتم:

- ئەی ئەگەر ژنت هێناو چاک نەبوەوە! وتی:
- ئەوە ژن ژنی خۆمەو ئیتر قوڕی کوێ بکەم بەسەر خۆما.

کچێک هەبوو بەرانبەر ماڵی خۆیان ناوی ئاشتی بوو، ئەومان بنیاتنا، عەلی لە ماوەی چەند ڕۆژێکدا هەموو شتێکی تەواو کرد، لەمانگی ١١ دا بوو مانگی هەنگوینی بردە ئوتێل ئاشتی، دوای هەفتەیەک بەسەر هاوسەرگیری عەلیدا، دایکی کۆچی دوایی کرد، هەرچی بەرو دراوسێ و کەس و کار هەبوو ئەوەندەیان پێناخۆش بوو، هەر مەپرسە، ئەو دایکەیان ئەوەندە بەڕێزو دڵسۆزی ئەو خێزانە بوو، ئەتوانم بڵێم ئەو ماڵە گەوهەرێکی زۆر بەنرخیان لەدەستدا.

## کاڵبوونەوەی دانوستان و
## متمانە پێنەمانی لای کۆمەڵانی خەڵک

### - ٥٣ -

دانوستان تەواو دەنگو ڕەنگی کاڵ ببووەوە، لە مانگی ١٢ دا کەس متمانەی پێنەما، پێشمەرگە گەڕانەوە شاخ، خەڵکی شار زۆربەی دەرکەوتبوون بەتایبەت لایەنگرانی یەکێتی، سیخوڕو جاسوسانی ڕژێمیش کەوتبوونە خۆیان و کلکیان بەرز کردبووەوە، خۆیان بۆ جەنگێکی کوشندەو ڕووبەڕوو بوونەوەیەکی خراپ ئامادەکردبوو بەرانبەر بە کۆمەڵانی خەڵک.

خۆشی و شادی گەلەکەمانو شاری سلێمانی، تەنها تەمەنی گوڵاڵە سوورەیەک بوو، پاشان بارانی وەیشومەو ڕەهێڵەیەکی زۆری داگیرکەران هەموویان پێڕشتینەوە، هەموو خۆشییەکیان لێزەوت کردینو کەس متمانەی بە کەس نەما، بڕوای ئەوە نەمابوو بۆ یەک شەو بە ئاسودەیی لە ماڵی خۆتا بخەوی، زۆربەی ئەو خەڵکە فیرارەی لە دێهات و شاخەکاندا لە ژێر چەتری ڕزگاریو ئازادی پێشمەرگەدا دەژیان و لە ماوەی ئەو ساڵەدا هاتبوونەوە شارەکان و زۆری نەڕۆیشتنەوە، یان بوون بە جاش یان سەربازی ڕژێم، کۆمەڵێکی زۆری پێشمەرگە چەکیان داناو نەگەڕانەوە بۆ شاخ، زۆربەی ئەو هاوڕێیانەی کە سەر بە ڕێکخراو بوون دەستیان لەکارکێشایەوەو پەیوەندییان نەکردەوە.

شەوێک لە ماڵەوە سەیری تەلەفزیۆنم دەکرد، دەنگوباس دەستیپێکرد وتی:

- ئەمڕۆ سەرۆکی فەرماندە سەدام حسێن چاوی کەوت بە دەستەیەک لە خوێندکارانی ئامادەیی کشتوکاڵی بەکرەجۆ، بەهۆی دامەزراندنەوەی (اتحاد الطلبة) لەناو خوێندنگەکەیاندا، کە چەند ساڵە بەکاری تێکدەران خوێندکاران بێبەشبوون لە مافە ڕەواکانی یەکێتیەکەیان، ئێستاش بەهۆی ڕێکخستنەوەو گەشەپێدانیان لەناو خوێندنگەکەیاندا چەند خوێندکارێکی چالاک، بانگهێشتی لای سەرۆکی فەرماندە کران بۆ ڕێز لێنانیان.

که ئەوەم بینی چاوم پەڕییە پشتی سەرم ئەوەندە بێزار بووم.

باوکم وتی: چییە بۆ وا بێزار بووی؟

منیش بۆم باسکرد، کە ئێمە ئەو ۳ ساڵە چۆن بووین و دوای ئێمەش چۆن دەبێت.

- باوکم وتی: ئێ وایە، خۆ هەموو کەس ئێوە نیە، خەڵک ئاوا دەیکات و دەیخوات، سبەینێش کورد شتێ بەدەست بهێنێت، هەر ئەوانە یەکەم کەس دەیخۆنو ئێوەش سەیریان دەکەن.

وتم: وانیە باوکە، هەموو شتێک وەکو تیشکی ڕۆژ دیارو ڕوونە!

وتی: دەباشە ئەوە من مردوو، تۆ زیندوو بزانە وا دەبێت یان نا.

(ئێستا من زیندوو ئەو مردوو هەزار ڕەحمەت لە گۆڕی، بۆ خۆیی و بۆ قسەی، قسەکەی زیاتر دەرچوو، سەیرەکەشمان پێنابڕێت).

دوای ئەوە کەوتمە خەیاڵێکی قوڵەوە، چاوم فڕی بۆ ناو خوێندنگەکەی خۆمان لە یەکەم ڕۆژەوە تا کۆتایی قۆناغی خوێندنم، هەموو شتێک بەدەست خۆمانەوە بوو، خوێندکاران هەمووی ئازاد بوون، کەس لێپرسراوی زۆرە ملێی کەس نەبوو، بەڵام وەکو دوایی بیستم چەندەها خوێندکار سەر بە (اتحاد الطلبة) بوون لەناو خوێندنگەی کشتوکاڵیدا.، ئێمەش ئەوکاتە هەموو خوێندکاران سەر بە یەکێتی و کوردایەتی بووین، هەموو گیان لەسەر دەستبووین بەرانبەر ئەو ڕژێمە خوێنڕێژە.

* * *

۱۹۸۵/۱/۲٥ مامەڕیشە شەهید کرا بە بیستنی هەواڵەکە ئەوەندە داخم خوارد لە ژیان بێزار ببووم.

کوردستان و شاری سلێمانی هەمووی خەمبار بوو بۆ مامەڕیشە، داخێکی وایکردە دڵی کۆمەڵانی خەڵکەوە، بە پیلانو بەدەستی جاشی خۆفرۆش و خاک وێرانکەر تەحسینی خۆفرۆشو شەرەف فرۆش، ئەو مامە ڕیشەیەی لای سیخوڕو پیاوانی ڕژێم پێیان دەووت (الرجل الحديدى)، بە هەزارەها پیلان و داوی ڕژێم

شەهید نەکرا، بەڵام بە دەستی خۆفرۆشێک شەهید کرا.

من ناڵێم کورد ئەڵێم خۆفرۆش و گەلفرۆش، ئەمەش لە چاوی دانوستانو دۆڕاندنی شۆڕش لەلایەن سەرانەوە، نەک هەر ئەو، چەندەهای وەکو شەهید سەید کەریم و مامە ریشەو مامۆستا پێشڕەو کەوتنە داوی پیلانە گڵاوەکانی جاش و ڕژێمەوە، لەماوەی ساڵێک دانوستاندا چەندەها کورد بە دەستی خۆفرۆشان شەهیدکران.

*

٤-٥ ڕۆژ دوای کارەساتی مامەریشە، شەوێک کەرتێک پێشمەرگە دەڕۆنە سەر ماڵی دکتۆر عادل بەڕێوەبەری قوتابخانەی کشتوکاڵی بەکرەجۆو دەیکوژن.

بەڕاستی ئەیڵێم زۆرم پێناخۆشبوو بۆ دکتۆر عادل، چونکە هیچ خراپەیەکی نەبوو بەرانبەر خوێندکاران، ٣ ساڵ من لەو خوێندنگەیە بووم، هەرچی زانیاری هەبوو دەیزانی لەسەرم بەڵام دەنگی نەدەکرد یەک خوێندکار گلەیی لێ نەبوو. چونکە پیاوێکی توندوتیژ نەبوو تاکو خراپەی لێبوەشێتەوە، زۆر کەسیش ئەیانووت لە تۆڵەی مامەریشە پێشمەرگە چەند چالاکییەکیان کردووە، کوشتنی دکتۆر عادلیش یەکێک بوو لەو تۆڵانە، لەدوای کوژرانی دکتۆر عادل مامۆستا هیمەت کرا بە بەڕێوەبەر.. ئەبێ ئەوەش بڵێم مامۆستا سەبیحە هاوسەری کاک قادری حاجی عەلی ڕۆیشت بۆ شاخ لەگەڵ کاک قادر بوو بە پێشمەرگە.

* * *

نزار مستەفا کادری ڕێکخراوو ئەندامی مەفرەزەی تۆڵە، کە لەپێشەوە باسمکردووە لەلایەن خۆفرۆشێک دەستنیشان دەکرێت ڕۆژی ١٠ / ٢ / ١٩٨٥ پیاوانی ڕژێم و جەیش شەعبی دەڕۆنە سەرماڵیان دەستگیری بکەن، ئەویش ئازایانە پەلاماریان دەدات و لە دەستیان هەڵدێ، بەڵام سیخوڕەکان لە دواوە تەقەی لێدەکەن و بریندراری دەکەن، هەر بەو برینەوە ڕا دەکات تا شەقامی ئیبراهیم پاشاو بە سەیارەیەک خۆی دەگەیەنێتە نەخۆشخانە.

بۆ ڕۆژی دوایی عەلی هات بۆ لام ڕووداوەکەی بۆ گێڕامەوە، وتم: ئەی ئێوە ڕۆیشتن بۆ لای؟ وتی: لەبەر چاودێری پیاوانی ڕژێم کەسمان نەڕۆیشتین، گۆران

دەڵێت با ئێمەش دەستنیشان نەکرێین، وتم:

- من ئەڕۆم بۆ لای، عەلی وتی: کاکە مەڕۆ، ئێمە لەو خۆفرۆشە دەترسین کە دەستنیشانی کردووە، کێ دەڵێت حکومەت تەڵەی دانەناوە بۆ ئەوانەی دەڕۆن بۆ سەردانی.

(عەلی ڕاستی کرد، ئەو کەسەی دەستنیشانی نزاری کردبوو، منی دەناسی).

نزار تا ماوەی ٣٢ ڕۆژ بەو ئازارو برینداربیەوە ژیانی بردە سەر، تا ١٩٨٥/٣/١٢ گیانی لەدەستدا.

تەواوی برادەران هەموو بە داخ بووین بۆی، بەتایبەتی ئەوانەی پەیوەندی ڕێکخراوەییان پێوەی هەبوو، چونکە نزار کوڕێکی لەسەر خۆو هێمن و زۆر دڵسۆزو بە وەفا بوو.

هاوڕێیەتی من و نزار دەگەڕایەوە بۆ ساڵانی ١٩٧٠، چونکە کوڕانی خەڵکی شەقامی ئیبراهیم پاشا هەموو یەکترمان دەناسی، نزار وەختی خۆی لە تۆپێندا گۆڵچییەکی لێزان بوو، لەگەڵ سەرهەنگ و براکانی تریشی هەر هاوڕێ بووین، زیاتر بە هۆی خوێندنەوە.

ئێستاش سەرسام دەبم لەو خۆفرۆشانەی لەپێناوی مشتێک پارەدا کەسێکی تێکۆشەر بە کوشت دەدەن، کە هەزارەها خۆزگەو ئاواتی هەبووە لە ژیاندا، هەمیشە ژیانی خۆیی‌و خێزانی لە مەترسیدا بووە لە پێناوی سەربەرزیی‌و ئازادیدا.

ماوەیەک تێپەڕی بەسەر شەهید کرانی نزاردا، لەگەڵ عەلی و کاک کەمالی موهەندیس‌و حاجی ڕۆیشتین بۆ ماڵیان، جەمیلەخانی دایکی‌و کاک مستەفای باوکی زۆر ڕێزیان گرتین، زۆرمان قسە بۆ کردن کە بە شەهید بوونی نزار دڵتەنگین، دایکی هەر دەیوت: ئێوە خۆشبن، کەئێوەم بینی وا دەزانم نزار زیندوو بۆتەوە. دایکی ئافرەتێکی لەسەرخۆ بوو، هەموو کارەساتەکەی بۆ گێڕاینەوە، کە نزار چەند ئازایانە ڕایکردووە لە دەست ئەو خۆفرۆشانە.

مانگی ١١ی ١٩٨٥ هەواڵمان پێگەیشت کە مەلا بەختیار لەلایەن یەکێتییەوە دەستگیرکراوە.

ئێمە بەبیستنی ئەو هەواڵە تووشی شۆک بووین، تەنها لەبەرئەوەی کەتەفرەقە نەکەوێتە ناو یەکێتییەوە پێمان ناخۆشبوو ئاڵای شۆڕش بەو دەردەبەرن، پێمانخۆشبوو بەئاشتی کێشەکەیان چارەسەر بکردایە، هەتاکو ئەوکاتەش هێزنەی پێشمەرگەی ناوشار پەیوەندیمان بەمەلا بەختیارەوە هەبوو.

ئەگەر ڕاستی بڵێین بیروباوەڕی ئاڵای شۆڕش و بەرنامەکەی ڕاستبوون، چونکە باوەڕیان بە یەکریزی و ڕووخاندنی رژێم هەبوو، بەڵام مەلا بەختیار کەسێکی هەلپەرستبوو وەکو لە پێشەوە باسمکرد هەتا دانوستان هەبوو، لەگەڵ یەکێتیی بوو، کەدانوستان کاڵبووەوەو یەکێتیی هەستی بە نوشستی خۆی کرد، مەلا بەختیاریش بەهەلیزانی کەوتە فکری جیابوونەوە لەیەکێتی، لێپرسراوە تاکرەوەکانی ناو یەکێتیش دەیانویست لەخۆیان زیاتر کەس نەبێت، بۆیە نەخشەی گرتنی مەلا بەختیاریان داڕشتو ئاڵای شۆڕشیان بەو دەردە برد کەخۆیان مەبەستیان بوو، هەرکەسێکیش باسی ئاڵای شۆڕشی بکردایە دەیانگرت.

لەدوای گیرانی مەلا بەختیار، گۆران زۆر تووڕە بوو ئەیوت: یەک مەفرەزە نادەم بەدەستەوە هەتا مەلا بەختیار ئازاد نەکرێت، پەیوەندیش ناکەم بە یەک لێپرساوی ترەوە.

ئـەوەی من ئاگاداربووم، ٣ مەفرەزەم دەناسی کە گـۆران سەرپەرشتی دەکردن:

١- مەفرەزەی تۆڵە، کەمالی موهەندیس سەرپەرشتی دەکرد.

٢- مەفرەزەیەکی تر کە حەمەشکور سەرپەرشتی دەکرد.

٣- مەفرەزەیەکیش مامۆستا شێخ عەبدول سەرپەرشتی دەکرد، جگە لەچەند

مەفرەزەی تر.

ماوەی ٢ مانگ زیاتر ئێمە چاوەڕوانی مەلا بەختیار بووین ئازاد بکرێ. بەڵام دەنگی نەبوو، کاک کەمالیش لەگەڵ گۆران کەوتبووە کێشەوە، ئەیووت بەمشێوەیە ئیشمان ناڕوات، لەگەڵ ئێمە داوای کۆبوونەوەی کرد.

ڕۆژی ١٠ / ١ / ١٩٨٦ لە ماڵی عەلی کۆبوونەوەمان کرد کاک کەمال وتی:

- من جیا دەبمەوە، هەرچییەک بە گۆران ئەڵێم، ئەڵێت: هەتا مەلا بەختیار ئازاد نەکرێت من ئیش ناکەم، ئێمەش بەم شێوەیە ناتوانین، یان دەبێت هەموومان دابنیشین یان ئیش بکەین.

کاک کەمال بڕیاریدا لەگەڵ عەلی بڕۆن بۆ ناوچەی قەرەداغ کێشەی خۆمانیان تێبگەیەنن و پەیوەندی بکەنەوە بە مەڵبەندی یەکەوە.

* * *

من ئەوکاتە لەژیانی فیراریدا بووم، چەند ڕۆژێک چاوەڕێم کرد کاک کەمال و عەلی وەڵامی مەڵبەند بهێننەوە بۆ گۆڕینی پەیوەندی، دوای چەند ڕۆژێ عەلی و حاجی هاتن وتیان: لەمڕۆژانەدا، واتە ١٩٨٦/١/١٦ گۆران و کەمالی موهەندیس و حەمەشکور بە هەموو بەڵگەیەکەوە دەستگیرکراون، ئەویش بەدەستنیشانکردنی خۆفرۆشێک، هەموو سەرمان سوڕما لەو کارە، چۆن بەجارێک هەموویان گیراون ئەگەر نەخشەی تەواویان بۆ دانەڕێژرابێت.

من وەکو خۆم زۆر بەداخ بووم بۆ کاک کەمال، حەمە شوکرم نەدەناسی، بەڵام وەکو باسیان دەکرد کەسێکی زۆر قارەمان بوو.

کاک کەمال کەسێکی لەسەرخۆ بوو، لە ماوەی دانوستاندا هیچ کارێکی لاوەکیم لێ نەبینی، ئێستاش نەمبینی دەمانچەیەک هەڵبگرێت، یان زۆر بە نهێنی هەڵیدەگرت، کەس پێی نەدەزانی، لە کارەکانیا زۆر بە دیسپلین بوو، کاری بەڕەڵڵایی نەدەکرد، هەمیشە ڕەخنەی لێمان دەگرت و تووڕە دەبوو بە ئیشی نابەجێ، قەت نەی دەووت من لێپرسراوم هەمیشە ئەیووت: لێپرسراوێتی لە کاتی تەنگانەدا دەردەکەوێت، بە عەلی و حاجیم وت: ئێستا چی بکەین؟

- حاجی وتی: با ماوەیەک چاوەڕوان بکەین، بزانین چی ڕوو دەدات.
- وتم: با عەلی بڕوات بۆ مەڵبەند ئاگاداریان بکات.

حاجی وتی: هەموو یەکێتی و ناوشار زانیوویانە کە گیراون، ئەوانە هەروا کەمنین، حکومەت بە ئاڵتوون دەیان کڕێت، جارێ باشترین چارەسەر ئەوەیە چاوەڕێ بکەین بزانین چی دەبێت، ئەگەر ئێمەش دەستگیرنەکراین دوایی خۆمان دەستبەکار دەبین.

❋

چاوەڕوانی دەنگوباسی کەمالی موهەندیسو ئەوان بووین چییان بەسەردێت، لەدوای ئەوانیش مەلا ناسرو حاجیش کەوتنە داوی رژێمەوەو ئەوانیش دەستگیرکران، بەجارێ ئەندامانی لیژنەو مەفرەزەکان پەرەوازە بوون.

ئێمەش پەیوەندیو ئیلتیزاممان نەما بەلیژنەی ناوشارەوە، من و عەلی بڕیارماندا ئەگەر نەگیرێین خۆمان دەستبەکاردەبینو مەفرەزە دروستدەکەینەوە.

❋

لە دوای دەستگیربوونی هاوڕێیان، ئەوکاتە من سەربازی فیرار بووم زۆر خۆم دەرنەدەخست، لەماڵەوە خۆم بە کتێب خوێندنەوە خەریک کردبوو سەرەڕای ئەوەش بێ ئیش و بێ پارە، ژیانێکی ناخۆشم بەڕێ دەکرد، بۆ نەگبەتی مەسەلەیەک هەیە ئەڵێت: (ماڵ خۆی لە خۆیدا نەبوو میوانیش ڕووی تێکرد)، لەو کاتەشدا ماڵی خۆم جیا کردبوەوە، لەسەر ماڵی باوکم نەمابووم، هیچ پێویستییەکی ناو ماڵم نەبوو، ٢ هۆدەی ڕەقو تەق لە قاتی سەرەوەی ماڵی باوکم، بەڵام ئەوەی باشبوو بەرەو بەهارو هاوین دەڕۆیشتین، وە مەسرەفیشمان کەمبوو هەر خۆم و ژن و منداڵێک بووین، وە یارمەتی خوشکو براکانمو ماڵی باوکمم بۆ دەهات، چونکە ژیانی منیان دەزانی، ناو بەناو عەلی دەهات بۆ لام، دەنگو باسمان بەیەک دەگەیاند ئەیووت: ژیان هەر وەکو خۆی ئاساییە.

ژیانی عەلی لە ژیانی من باشتر نەبوو، ئەو ماوەیە هەر خەریکی کرێکارییو چەرمەسەری ژیان بوو، ڕۆژێک ئیشی دەکرد ٢ ڕۆژ بێئیش.

بەهاری ١٩٨٦، خەڵک هەمووی بەشداری جەژنی نەورۆزیان دەکرد، منیش لە ژوورەوە نەدەهاتمە دەرەوە، دەمووت: با نەگیرێمو تووشی بەڵا نەبم، گەڕەکی خۆمان ئەو کاتە هەموویان دەیانزانی کە من فیرارم لە دەست ڕژێم، ئەگەر شتێک ڕووی بدایە دەهاتن پێیان دەووتم، بەڕاستی خەڵک دڵسۆز بوون، بەتایبەت ئەیڵێم کە ماڵی ئامەی گوڵناز هەرچەندە دووریش بوون لە ماڵمانەوە، کەچی بۆ بچوکترین کێشە پێیان دەووتم، بەتایبەتی محەمەدی کوڕیان کە کەمئەندام بوو، بە ٢ دارشەقەوە دەهات بۆ ماڵمان، ئەو کاتەی کۆمەڵێک گەنجی بێتاوانیان لە تۆڵەی خۆفرۆشێکدا گوللەباران کرد بەرانبەری پارکی دایک، ڕۆژی ٩ / ٤ / ١٩٨٦ بە ئەمری پارێزگاری سلێمانی (شێخ جەعفەری) چڵکاوخۆرو خوێنڕێژ، ئەم محەمەدە بە ٢ دارشەقەوە هات پێی وتم: کارەساتێکی ئاوا هەیە، وریای خۆت بە، ماڵی ئامەی گوڵناز دوکانی سەرجادەیان هەبوو، بەدەم ماڵەکەی خۆیانەوە بەرامبەر خوێندنگەی ناوەندی ژین شتو مەکی خواردەمەنییان دەفرۆشتو وەکالەتی بایعیشیان هەبوو، لە نێوانی ماڵی ئێمەو ئەوان دەشتێک هەبوو، منیش لە دەشتەکەوە دەڕۆیشتم بۆ ماڵیان کە لە پشتی ماڵەکەیانەوە دەرگایان هەبوو، لە دەرگام دەدا حاجی ئامین (ئامەی گوڵنار) دەیکردەوە، منیش لەوێوە دەڕۆیشتم بۆ دوکانەکەیان هەرچی پێداویستی ماڵەوە هەبووایە هەموویم دەکڕی، بەشی ٢ هەفتە زیاتر تاکو نەڕۆمە دەرەوە، هەموو جارێک حاجی ئامین ئەیووت:

- ئەگەر زانیت وەزعت باش نییە یان شتێک ڕوو دەدات وەرە بۆ ماڵی ئێمەو خەمت نەبێت، ئەتکەمە ژووری مانگاکان گڵۆپی تێدا نییە، وات دەشارمەوە باوکی حکومەتیش نەتدۆزێتەوە، ئەوکاتە ئەوان مانگایان هەبوو، هەزار درووود بۆ گۆڕی حاجی ئامین کە ئێستا کۆچی دوایی کردووە.



مانگی ٤ هەوا بـەرەو خۆشی دەڕۆیشت منیش لە سەربانەکەی خۆمان وەستابووم، سەیری ماڵەکانی دەوربـەرم دەکرد، سەیرمکرد شۆفلێک هاتە کۆڵانەکەمانەوە، دەستی کرد بە ڕووخاندنی خانووە کۆنەیەک منیش ڕۆیشتم بۆ لایان، خۆم بە خاوەن ماڵ ناساند، وتی: نیازم وایە ئەم بەشەی دواوەی تێک بدەمو هۆدەیەکی بە بلۆک تیادا دروستبکەمەوە، منیش پێموت: ئەی بۆ نەیەم ئیشی تیادا بکەم، شارەزایی باشم هەیە، ڕازیم کردو بۆ بەیانییەکەی دەستمکرد بە ئیشکردن، ڕۆژی بە ٦ دینار، بە کورتی بیڵێم، هەتاکو هۆدەکە تەواو بوو ئیشم تیا کرد، لەو دیویشەوە خانوویەکی تریان تێکدا، ئیشی ئەو خانووەشم گرت، هەر لە ئەساسەوە هەتا تەواو بوون ئیشم تیا کرد، ئێستاش لە بیرمە لەم خانووەی یەکەم جار ٨١ دینارم ئیشکرد، ئەو خانووەی تریشیان ٤١٠ دینار، کە بۆ ئەو کاتەی من زۆر باش بوو، ناو ماڵی تەواوم پێکرد پارەشم پێمابوو. ئەوەش لە ماوەی ٤ مانگی بەهارو هاویندا بوو.

ئنجا وورده وورده ناسرام هەر ماڵ بوو، دەهاتن بۆ لام کەئیشیان بۆ بکەم. تەواو خۆم مەشغوڵ کرد بوو بە ئیشکردنەوە، زۆر بێزار نەدەبووم لەژیان.

ڕۆژێک لەو خانووەی کۆڵانی ئەو دیو کە ماڵی خەلیفە جەباریان پێدەووت ئیشمان دەکرد، وەستاکەمان دەیووت: باوکم خەریکە دەمرێت، ئەوەندەمزانی هاتن بە شوێنیدا وتیان: باوکت مرد، ئەویش دەستی لە ئیش هەڵگرتو لەگەڵ کرێکارەکانی ڕۆیشتن، ئیشو چیمەنتۆیان بۆ من بەجێهێشت.

وتیان: تۆ وەزعت خراپە مەیە لە دوای ئێمە ئیشەکە تەواو بکە، منیش وورده وورده دەستمکرد بە ئیشکردن، لەشەقامی ئیبراهیم پاشا سەیارەیەکی قوات خاسە وەستا بوون، منیش بە وریاییەوە ئیشم دەکرد، پیاوێکیش لەبەر دەرگای ماڵی خۆیان، لەسەر سینییەک بسکیتو لوقمو بنێشتو گوڵەبەڕۆژەی دانابوو دەیفرۆشت، ناوی مام مستەفا بوو، وتم: ئاگات لە قوات خاسەکان بێت ئەگەر هاتن، نەک من مەشغوڵ بم.

سەعات ٣ ی پاش نیوەڕۆ، لە ئیش تەواو بووم، ئەشیاکانم کۆدەکردەوە،

گوێم لێبوو مام مستەفا بانگم دەکات، سەیرمکرد ٢ قوات خاسە دێنە خوارەوە بۆ لای من، هەر ئەوەندەم بۆ کرا خۆم بەسەر دیوارەکەدا هەڵداو ڕامکرد، خۆم کرد بە ماڵێکداو بە پەیژەکەیاندا سەرکەوتم و ڕۆیشتم بۆ سەربان، بەرەو دەشتەکەی لای ماڵی خۆمان، لەوێوە ·خۆم هەڵدایە خوارەوەو ڕامکرد بەرەو کۆڵانەکانی مەڵکەندی، ژنانی گەڕەک هەموویان لەبەردەرگا دانیشتوون، دایکمو هاوسەرەکەشم لەگەڵیان، دەستیانکرد بە هاوارو نزاکردن، پاش سەعاتێک بە وریایی هاتمەوەو ڕۆیشتمەوە بۆ لای ئیشەکە کەسی لێنەبوو.

بە مام مستەفام وت: دوای من چی ڕوویدا، وتی: وەڵڵاهی کوڕم خوا ڕەحمی پێکردیت هاتنە شوێنەکەت دەستیانکرد بە گەڕان، لەگەڵ خۆیان هەر قسەیان دەکرد.

منیش تا ٢ ڕۆژ نەڕۆیشتمەوە بۆ ئیش دەمووت نەک بێنەوە.

سەرەتای مانگی ٦ دوای نیوەڕوان سەعات ٣ ئیستگەی یەکێتیم دەکردەوەو گوێم لێدەگرت، چەند ڕۆژێک هەر باسی چەککردنی جاشەکانی دەکرد لەلایەن ڕژێمەوە، کە دەبێت جاشایەتی نەمێنێتو ئەو کوردانە بێنەوە ڕیزی سوپا.

ئێستگەی یەکێتیش لێبوردنی دەردەکرد بۆ ئەو جاشانە خۆیان پاکبکەنەوەو بڕۆنە ڕیزی پێشمەرگەوە.

منیش ڕۆیشتم بۆ لای عەلی، وتم: من هیچ شتێکم پێ نییە لەناوشارا، بۆ ماوەیەک ئەڕۆم بۆ ئەو دێهاتانەی شارباژێڕ سەر لە برادەرانو خزمو ناسیاو دەدەم، وتی:

- ئێمە هیچ هیوایەکمان نەماوە بە مەلا بەختیار، ئێستا ئەو لەلایەن یەکێتییەوە گیراوە، هاوڕێیانی تریشمان لەلایەن ڕژێمەوە گیراون، ڕۆیشتم بۆ ماڵی حاجی ئەڵێن هەواڵمان هەیە لەسەری، بەنیازە ئازاد بکرێت، گیرانەکەی ئەمجارەی هیچیان بەدەستەوە نییەو چەند کەسێک بەرگرییان لێکردووە

وتی: ئەگەر هەر دەڕۆی بڕۆ بۆ سەرکردایەتی، هەر چۆنێک بێت لەسجن مەلا بەختیار ببینەو قسەی لەگەڵ بکە، ئنجا پەیوەندی بکە بە مەکتەبی سیاسییەوە، بەتایبەتی کاک نەوشیروان، کێشەی خۆمانی تێبگەیەنە، قسەمان تاوتوێ کرد، ئەگەر حاجی ئازاد بکرێ مەفرەزەیەکی تووندو تۆڵ دروستبکەینەوە بۆ ئیشو چالاکی لەناو شارا.

* * *

ڕۆژی ٥ / ٦ / ١٩٨٦ بۆ بەیانییەکەی ڕۆیشتم بەرەو گوندی وێڵەدەر، کە گەیشتمە ئەوێ گوندەکە هەمووی وێران تەنها ٢-٣ ماڵێک دروستکرابوەوە لەگەڵ چەند هۆدەیەکی بچووک، کە چەند کەسێکی سەربازی هەڵاتووی گوندەکە باری ناچاری دروستیان کردبوەوە، حاجی مێوژ هۆدەیەکی دروستکردبوو بەرانبەر

ڕێگای سلێمانی، ڕۆیشتم بۆ لای حاجی باوەشمانکرد بەیەکداو لای دانیشتم سەیری ژوورەکەیم کرد، فەردەیەک برنجو فەردەیەک فاسۆلیاو تەنەکەیەک ڕۆنو دۆشاو دانرا بوو پرسیارم لێکرد، ئەم هۆدەیەت بۆ بەرانبەر ڕێگاکە دروستکردووە؟ وتی: کاکە من چاوم لە ڕێگاکەوەیە، ئەگەر جاشیش بێت لەم دۆڵەوە خۆم دەردەکەم، هەتا بتوانم بۆ خۆم چێشتو نان دروستدەکەم، ئێ برادەرانی ناوشاریش زوو زوو سەرم لێدەدەنو مەشروبە حەیاتەکەش دەهێنن کاتێکی خۆش دەبەینەسەر.

ویستم بڕۆم حاجی نەیهێشت، وتی: دەبێت ئەم شەو لای من بیت، ئەو شەوە لای حاجی مامەوە، بۆی گێڕامەوە پێشمەرگەی یەکێتی هاتوون ئیهانەیان کردووە، گوایە ئەم لەگەڵ ئاڵای شۆڕشە.

بۆ ڕۆژی دوایی ڕۆیشتم بۆ لای حەمە عەلی شەریف و ئەوان کە فیرار بوون لە سەرو دێیەکەوە هۆدەیەکیان کردبوو، پاشان ڕۆیشتم بۆ گوندی سیتەک هێشتا ئاوەدان بوو، وەهابو تەها سیتەکی و یاسین و شەهید عەزیز سیتەکی لەوێ بوون، ئەو کاتە فیرارێکی زۆر لەو گوندە دەژیان، ٢- ٣ ڕۆژ مامەوە لە ماڵی کوێخا ڕەحیم باوکی تەها سیتەکی، پیاوێکی دەستو دڵفراوان و نان بدە بوو، هەر کەسێک لە ڕێبوار و پێشمەرگە بڕۆیشتایەتە گوندی سیتەک، ماڵی کوێخا ڕەحیم پێشوازییان لێدەکرد، ماڵیان هەمیشە لانەی برادەرانی کوڕەکانی بوو، بەڕاستی ئەوەندە ماڵی چاکبوون باسکردنیان تەواو نابێت، من وەکو کوڕی ئەو ماڵە وابووم. ئێستاش پەیوەندی و دۆستایەتیمان هەیەو شایانی ئەوەن زیاتر لەوە باسبکرێن.

دوای چەند ڕۆژێک لەسیتەکەوە ڕۆیشتم بۆ گوندی کاژاو، دوو سێ ڕۆژیش لە ماڵی حاجی عەلی بووم، بە هۆی ماڵی خەزورمەوە ناسیاویم لەگەڵیاندا پەیدا کردبوو، ئەوانیش ماڵی چاکبوون لەگەڵ میوانو پێشمەرگە، هەر کەس بڕۆیشتایەتە ئەو گوندە دەڕۆیشتنە ماڵیان، ئەو کاتە ڕەئووفو محەمەدی کوڕی حاجی عەلی فیرار بوون، دوکانیشیان هەبوو لە گوندەکەدا، زیاتر بەهۆی ئەوەوە

خەڵک رووبان تێدەکردن.

لەناوچەی شارباژێڕ هێزی پێشمەرگەی لێنەما بوو، مەگەر مەفرەزەیەک بهاتایە. چونکە بەرەو چۆڵبوون دەڕۆیشت، بە ئاسانی جاش دەهاتنە ناو گوندەکانەوە. هێزی پێشمەرگە گەڕابوونەوە بۆ دۆڵی جافایەتی.

بڕیارمدا بەرەو سەرکردایەتی بڕۆم بۆ سەرگەڵوو بەرگەڵوو، لە گوندی کاژاوەوە بەرەو گوندی وێڵە ڕۆیشتم، ماڵی خزمێکمان لەوێبوو شێخ عەبدوڵڵای سەرخوار کە بەهۆی ئاژەڵدارییەوە روویان لەو گوندە کردبوو، ماڵێکی زۆر بەڕێز بوون. شەوێکیش لای ئەوان مامەوە، بۆ ڕۆژی دوایی ڕۆیشتم بەرەو گوندی گورگەیەر. ئەو ناوچەیە ئەوەندە چۆڵبوو، بێزار دەبووی پیایدا بڕۆیت، لە گوندی گورگەیەر نزیک بوومەوە ناو گوندەکە بەلامەوە چۆڵبوو، هەڵوێستەیەکم! کرد لە دڵی خۆما وتم: بۆ ڕاستەوخۆ بڕۆم بۆ ناو ئەم گوندە، سەیرمکرد ناو گوندەکە ٥-٦ ئیڤای سەربازی لێیە، منیش ڕۆیشتمە بەینی ٢ دارەوە کە نەبینرێم، قەدەرێک دانیشتم چاوەڕێم کرد بزانم چی دەبێت، کەئیڤاکان ڕۆیشتن بە وریایی ڕۆیشتمە ناو گوندەکەوە کەسی تیا نەبوو، ئنجا وردە وردە خەڵکی گوندەکەو گەنجەکان پەیدا بوونەوە، یەکەم کەس کە بینیم سەرداری سەلیم سەهۆڵ کەبرادەرێکی خۆم بوو، لەدوای هەواڵپرسین وتم: ئەو ئیڤایانە چیبوون.

وتی: هەڵبژاردنە لە چوارتا، کەمالی حەمەی مامڕەش خۆی هەڵبژاردوە. ئێستا هاتون خەڵکی گوندەکانو فیرارەکان بەرن بۆ دەنگدان، کە دەنگبدەن بە خۆی، ئەڵێ کەس نەترسێت، ئێمەش خۆمان شاردەوە تا نەڕۆین، بۆ ئێوارە کاوەی شێخ عەلی دۆڵپەموویم بینی، لە پێشەوە باسمکردووە، کاوە خزمایەتیمان هەبوو لەگەڵ ئەوەشدا هاوڕێیەتیشمان زۆر خۆشبوو، ئەو شەوەشر لای ئەو مامەوە لە گورگەیەر، هەر ئەو جارە بینیمەوە، پاشان ڕۆیشت بۆ دۆڵی جافایەتی، چەکی هەڵگرتەوەو لە گوندی فەیاڵ شەهید کرا.

بۆ ڕۆژی دوایی ڕۆیشتمەوە بۆ ناو چەمەکەی سیتەک کە بپەڕمەوە بۆ بەری سیرەمێرگ، تراکتۆرێک هات چەند کەسێکی بەسەرەوە بوو، منیش سەرکەوتم

ـەگەڵیان سایەقەکە وتی: ئەو چەمە جاشەکانی کەریم کانی ساردی لێدەوەستن، ئەبێت وریا بن، ئێمە بەپێ ڕۆیشتین، تا ماوەیەک ئنجا سوار تراکتۆرەکە بووینەوە بەرەو گوندی مارەڕەش، (ئەوکاتە ئەو تراکتۆرانە لە کانی پانکەوە دەڕۆیشتن بۆ سەفرەو زەروون بۆ شتومەکی قاچاغ).

لەوێوە بەرەو گوندی هەڵەدن و سەرگەڵوو ڕۆیشتم، لەسەرگەڵوو پرسیاری مقەڕی حاکم قادرم کرد نیشانیاندام، کەڕۆیشتم حاکم قادر لەبەر دەرگا وەستا بوو یەکترمان ماچ کرد، ئەو کاتە جەزای وەستا ڕەحیم لای حاکم قادر پێشمەرگە بوو، ئەو شەوە لایان مامەوە قسەمان زۆر کرد دەربارەی وەزعی سلێمانی و ژیانی پێشمەرگە، پاشان مەوزوعی خۆمانم باسکرد، حاکم وتی: ئەگەر بە قسەی من دەکەیت، بڕۆ بۆ لای کاک نەوشیروان، هەموو شتێکی تێبگەیەنە، چونکە مەلا بەختیار بەکەڵکی ئەوە نایەت لەم کاتەدا بڕۆی بۆ لای، دوێنێ شەو ڕایکردووەو گیراوەتەوە، ئەوەندەی تر مەسەلەکەی قوڵ بۆتەوەو باری قورس بووە، ئێستا کەسانی وەکو ئێوە بڕۆن بۆ لای خۆیان دەزانن چیتان بەسەر دەهێنن، وتم: خۆشم هەر بە مەبەستی لای کاک نەوشیروان هاتووم.

بۆ ڕۆژی دوایی ڕۆیشتم بۆ بەرگەڵوو، زانیم ئازادەڕەش لای کاک نەوشیروانە، ڕۆیشتم بۆ مقەڕەکە بۆ لای ئازاد، بە بینی یەکتر خۆشحاڵیمان دەربڕی، چونکە ٢ ساڵ بوو یەکترمان نەبینیبوو، لای ئازاد زۆر خۆشم ڕابوارد، چونکە خۆی لێپرسراوی مقەڕەکە بوو حەمامی بۆ گەرم کردم، خۆمو جلەکانم شۆری بەڕاستی خزمەتی چاکی کردم، ئەو کاتەی من ڕۆیشتم کاک نەوشیروان لەوێ نەبوو.

ئازاد وتی: دابەزیوە بۆ دۆڵی ئەحزاب.

- وتم: دۆڵی ئەحزاب لە کوێیە؟ وتی: دۆڵی مالومەیە، ئەم دۆڵە هەرچی حیزبی کوردییە بە حیزبە ئێرانیەکانیشەوە هەموویان لەوێ کۆبوونەتەوە، لەبەرئەوە ناویان ناوە دۆڵی ئەحزاب، تا چەند ڕۆژێک چاوەڕێ بووم کاک نەوشیروان بگەڕێتەوە، هەر نەهاتەوە ئنجا ئازاد جیهازی کرد، جوابیان دایەوە، جارێ بە نیاز نییە بگەڕێتەوەو زۆر مەشغوڵە.

له مقەڕەکەی کاک نەوشیروان تێبینی ئەوەمکرد، چەند ئنجانەیەک بەشێوەیەکی هونەری جوان دروستکرابوون لە قەپاغە نایلۆنی گوللە تۆپ، هەمووی گوڵی تیا روێنرا بوون، هەر دیقەتم دەدان لە جوانی ئەو ئنجانانە پرسیارم کرد لە ئازاد کێ دروستیکردوون؟، وتی:

- پێشمەرگەیەکمان لایە دەسترەنگینە، ئەو دروستیان دەکات، لەبەرئەوەی کاک نەوشیروان زۆر حەزی لە گوڵ و گوڵزارە، دوای چەند رۆژێک چاوەڕوانی لای ئازادم جێهێشت و گەڕامەوە بۆ سەرگەڵو بۆ لای حاکم قادر، وتم:

- لەو رۆژەوە دانیشتووم کاک نەوشیروان بێتەوە ئەڵێن هەفتەیەکی تر دێتەوە وتی: بەختت نەبوو.

ئنجا لەگەڵ جەزای وەستا رەحیم، مقەڕ بە مقەڕ دەگەڕاین بۆ کتێبو چاپکراوی یەکێتی، تاکو کۆمەڵێک کتێب و گۆڤارم دەستکەوت.

لەناو گوندی سەرگەڵو خەڵکێکی زۆر بەتایبەت گەنجان هەموویان بە پانتۆڵەوەو جانتا بەشانیانەوە هەر هاتووچۆیان دەکرد، منیش پرسیارمکرد: ئەم گەنجانە بەنیازی چین، وتیان: یەکێتیو ئێران رێککەوتوون، ئەمانیش بەنیازن لەرێگای ئێرانەوە برۆن بۆ دەرەوەی وڵات، ئەوکاتە پێشمەرگە بەو گەنجانەیان دەوت لە واقیع رادەکەن.

لەدوای چەند رۆژێک گەڕامەوە کۆمەڵێک کتێب و گۆڤاری کۆمەڵەو رێبازی نوێو شەرارەم لەگەڵ خۆما هێنایەوە، پێشمەرگەیەکی زۆر کۆبوبوەوە لەدۆڵی جافەتی دەیانوت هجومە بۆ ئەزمڕ، لە رێگا تراکتۆر باریان لە سەفرەو زەرونەوە دەهێنا بۆ کانی پانکە بەناو سەیتەرەی جاشەکانا چونکە قسەیان نەدەکرد، ئەو جاشانە خەڵکی ناوچەی هەولێر بوون، بە ناچاری لەترسی سەربازی ببوون بە جاش.

لەگوندی گاپیلۆن تراکتۆرێکم راگرت، سایەقەکەی کورێکی مێرد منداڵ بوو. وتم: ئەم کتێبانەم پێیەو فیراریشم دەمەوێت برۆمەوە بۆ شاربازێر، وتی: خەمت نەبێت، کتێبەکانی لێوەرگرتمو لەناو بۆکسێکدا لەبەر پێکەیدا داینا وەکو شوێنی پاتری وا بوو، بەتانییە کۆنێکی تێئاخنی، منیش لەگەڵیدا سوار

بووم، ٢-٣ کەسی تریشی لەگەڵبوو، باری تراکتۆرەکە هەمووی بەتانی بوو، سنوری پێشمەرگەمان جێهێشت و کەوتینە سنوری جاشەکانەوە، هەر جاش بوو لەسەر ڕێگاکە دانیشتبوون داوای پارەیان لە قاچاغچییەکان دەکرد، گەیشتین بە سەیتەرەیەک جاشێکی هەولێری مێردمنداڵ هات، زۆر ڕووی خۆشبوو لەگەڵ سایەقەکە کەوتە قسەی خۆش، ئەیووت داکی عوکومەتی بگێن، گوێ مەدەنێ پاشان وتی: ژێر ئەو بەتانییە چی تێدایە، بەتانییەکەی لابردو کتێبەکان دەرکەوتن وتی: ئەوە چییە؟

سایەقەکە وتی: ئەوە هەمووی کتێبی پێشمەرگەیە هی ئەو برادەرەیە، وتی:

- بەخودای ئەمنیش کتابی پێشمەرگەم دەوێت لۆ خۆم دەیخوێنمەوە، منیش ٢ ژمارەی ڕێبازی نوێم دایە، لاپەڕەکانی هەڵدایەوە، وتی: ئەی بە قوربانتان بم ئەوە ڕەسمی پێشمەرگەی تیادایە، وتی: ئنجا بڕۆن خواتان لەگەر، گەیشتینە سەر جادەی ئەزمڕ وتم: من لێرە دادەبەزم بەپێ دەڕۆم، سایەقەکە وتی:

- دامەبەزە ئێواران هیچ نییە جاشەکان لە ترسی پێشمەرگە ناوێرن بێن، ئنجا پەڕینەوە بۆ سیتەک، لەناو چەمەکەی سیتەک دابەزیم، پارەم دا بە سایەقەکە وەری نەگرت، وتی:

- من پارە وەرناگرم، مادام تۆ کتێبی پێشمەرگەت پێیە، منیش سوپاسیم کردو بەرەو سیتەک ڕۆیشتمەوە بۆ لای وەهابو تەهاو ئەوان، لەناو ڕەزەکانی سیتەک لەگەڵ وەهاب هەر سەیری کتێبو گۆڤارەکانمان دەکرد، وتم:

- دەبێت هەموویان بەرمەوە بۆ سلێمانی، ئەو شەوە لە سیتەک بووم‌و بۆ ڕۆژی دوایی ڕۆیشتمەوە بۆ گوندی کاژاو بۆ ماڵی ڕەئووفی حاجی عەلی.

کتێبەکانم دایە دەست کاک ڕەئووف، وتم: دەبێت بیانپارێزیت بۆم، هەتا خۆم دەگەڕێمەوە بۆیان، بۆ ڕۆژی دوایی گەڕامەوە بۆ گوندی وێڵەدەر، لەوێوە بە سەیارەیەکی جێب لاندرۆڤەر گەڕامەوە بۆ سلێمانی.

دوای ماوەیەک بەپێ لە سلێمانییەوە ڕۆیشتم بۆ گوندی کاژاو، کتێبەکانم بەڕێی قاچاغدا هێنایەوە بۆ سلێمانی، ئێستاش هەموویانم ماون.



لەڕاستەوە: مامۆستا کەریم وێڵەدەری- عەلی حەمەشەریف وێڵەدەری-وەهاب عوسمان سیتەکی-
تەها کوێخا ڕەحیم سیتەکی- ڕەئووف شێخ جەمیل- هاوینی ساڵی ٢٠٠٢ گوندی سیتەک

٢ ڕۆژ دوای هاتنەوەم لەسەرگەڵوو، عەلی هات بۆ لام، چۆن ڕۆیشتم و هاتمەوە هەموویم بۆ گێڕایەوە، پێکەنی، وتی: ١٥ ڕۆژە ڕۆیشتووی بەدەستی بەتاڵ گەڕایتەوە.

ئنجا باسی ڕۆیشتنی گەنجانم کرد، چۆن بەپۆل کۆچدەکەن بۆ هەندەران، عەلی وتی: باشە با بەیەکەوە بڕۆین بۆ هەندەران، ماڵ و ئاڵتوونی هاوسەرەکانمان دەفرۆشین و ئەوانیش دەبەین، هەتا ڕێگاوبان سەخت نەبووەو زستان نەهاتووە. بڕوا بکە من و تۆ پارەی سەروزیادمان پێیە، کەس و کاریش یارمەتیمان دەدەن. وتم: من باوەڕم بەدەرەوەی وڵات نییە، باوەڕم بە خەباتی ڕەوای نەتەوەکەم هەیە، زۆرمان قسەکرد بەڵام عەلی نەیتوانی من ڕازی بکات.

*

لەمانگی ٧ دا حاجی ئازادکراو بە یەک شادبووینەوە، بەسەرهاتی گرتنەکەی بۆ گێڕاینەوە، چۆن کەمالی موهەندیس و حەمەشوکری دیووەو هەموو زانیارییەکی لەسەریان دەزانـی، تەنانەت ئەو خۆفرۆشەشی بەگرتی دابوون تەها ناوێک ئەیووت پیشانتان دەدەم.

حاجی کوڕی کۆڵنەدان بوو، دەنگ و باسی ئیشکردنی لەئێمە پرسی؟ وتمان چاوەڕێی ئازادکردنی تۆ بووین، زانیاریمان هەبوو ئازاد دەکرێی، دەست بەئیش دەکەینەوە.

بۆ ڕۆژی دوایی عەلیمان نارد بۆ مەڵبەندی یەک، دوای ٢ ڕۆژ گەڕایەوە وتی: پەیوەندیم کردۆتەوە بە کاک عومەر فەتاح و شێرکۆ جدی و ئەوانەوە. دەمانچەیەکی چواردە خۆرو کۆمەڵێک نامەی هێنابوو بۆ دەوڵەمەندەکان بۆ یارمەتی شۆڕش، عەلی وتی: پێیان وتووم دەبێت زۆر ئاگاتان لەخۆتان بێت لەکاتی یارمەتی داواکردن، چونکە لەوانەیە هی وایان تیا بێت سەر بەڕژێم بێت. یان لەترسی گیانی خۆیان بەحکومەت بڵێن.

*

وەکو وتم: حاجی هەموو زانیارییەکی دەزانی لەسەر کەمالی موهەندیسو حەمەشوکرو مەلا ناسرو گۆران، بۆیە زۆر بە گرنگ باسی دەکردن، ئەیووت: ـە نیازی ئازادبوونی کەمال و حەمە شکور مەبن، بەڵام گۆران ئازاددەکەن، هەرچەندە عەلی ۲ - ۳ جار سەردانی هاوسەرەکەی کردبوو بۆ هەواڵپرسین.

بە عەلی وتبوو واستەمان بۆ گۆران کردووە لەلای شێخ محەمەدی شێخ عەبدولکەریمی کرپچنە، ئەویش بە عیزەت دووری وتووە کە واستەی بۆ بکات ئازاد بکرێت، بەڵام ئەو قسانە قەناعەتی بە ئێمە نەکرد.

کۆتایی مانگی ۱۰ ڕۆژێک عەلیو حاجی هاتن، وتیان ئاگات لە خۆت بێت، گۆران ئازادکراوە، ئێمە بینیوومانە بە ساردییەکەوە قسەی لەگەڵ کردوین، ئەیووت:

- من ئیعترافم نەبووەو واستەشم کردووە، بۆیە ئازادکراوم، بەڵام لەوانەیە کەمالو ئەوان حوکمی هەتا هەتایی بدرێن.

حاجی ئەو کەسەی پیشانی عەلی دابوو، کە بەگرتی دابوون عەلیش ئەیووت پیشانت دەدەم، هەر ئەو کەسەش دەستنیشانی نزاری مستەفا ئەفەندی کردوو بەدەستی ڕژێمی بەعس بەکوشتی دا، بەڵام ئێمە ژیانی فیراری سەری لێشێواندبووین نەماندەتوانی بەسەربەستی بگەڕێین، ئەگینا ژیانی ئیشکردنمان لەناو شاردا کێشە نەبوو، هەرچەندە ئێمە لەلایەنی ئیشی ڕۆژانەو کەسابەتەوە زۆر بێ پارە بووین، هەموو جارێک لەناو خۆماندا دەمانوت:

- سەیری ئەم ژیانە ئێمە بەسەری دەبەین، سەربازی هەڵاتووین، بێ کاسبی، بێ پارە، ئیشی ناو شاریش دەکەین، ۳ کێشەی یەک لە یەک ناخۆشتر، خۆشمان سەرمان لە خۆمان دەرنەدەکرد، بەڵام هەمووی ژیانی فیراریيەکە سەری لێ تێکدابووین، نەشمان دەویست سەر شۆڕ بکەین بۆ جاشایەتی، تەنانەت بەلامانەوە نەنگی بوو کە وەرەقەیەکی ساختەی خەفیفەش هەڵبگرین بۆ کاری پێویست.

١٧ / ١ / ١٩٨٧ تۆپبارانی شاری سلێمانی دەستیپێکرد لەلایەن ڕژێمی ئیسلامی ئێرانەوە، کارەساتێکی گەورەی لە شاردا نایەوە، هەر یەکەم ڕۆژ کوشتارێکی زۆری لە خەڵکی شار کرد، بەتایبەت گەڕەکی ئیسکان و لای جامعەکە، بەڵام پاسدارانی ئێران زیاتر مەبەستیان سەربازگەی حامیە بوو، کەچی تۆپەکان ئەو گەڕەکانەی گرتەوە، شاری سلێمانی تەواو بێزار کرد، ئنجا هەموو ڕۆژێک تۆپباران دەکرا، ئەویش بەهۆی جەنگی عێراق- ئێرانەوە بوو کە خاکی کوردستان کرابووە هەدەفـو ببووە گۆڕەپانی شەڕەکە، لەویاشا کَوردیان بێبەش نەکرد لەو ڕەحمەتە.

لە کاتی تۆپ بارانا خەڵکی شار بۆ خۆپاراستن لە نەعرەتەی تۆپ گەورەو بچووک دەڕۆیشتنە ژێر زەمینیماڵانەوە، لەناو بازاڕیشدا دەڕۆیشتنە ژێر باڵەخانەکانەوە، تۆپبارانی شاری سلێمانی ماوەی ٣ مانگی خایاند.

منیش هیچ پێناسێکم نەبوو بۆ هاتووچۆ، عەلیو حاجیش لەو کاتەدا فرسەتیان دەهێنا دەهاتن بۆ لام، ئێمەش بە کۆڵانەکاندا دەڕۆیشتین بۆ ناو بازاڕ، دەستنیشانی کەسانی دەوڵەمەندمان دەکرد، ناوەکانمان دەدان بە مەڵبەندو ئەوانیش نامەیان دەنووسی بۆیان، ئەو کەسانەی بۆمان دەبردن لەپێشا قسەمان لەگەڵ دەکردن، ئنجا نامەکانمان دەدانیو دەمانووت:

- دەبێت پارەکە ئامادەبێت تا خۆمان دێینەوە، وەکو نەرمە هەڕەشەیەک پێمان دەووتن: نابێت هیچ کارەساتێکی خراپ ڕوو بدات، چونکە زیانی بۆ خۆتان دەبێ، دوایی دەڕۆیشتینەوە بۆ لایان، لە پێشدا یەکێکمان دەڕۆیشتینە ژوورەوە، دوانیشمان بەدەمانچەوە چاودێر بووین لەدەرەوە، نەخشەمان دادەنا ئەگەر شتێک ڕوو بدات هەتا بتوانین دەستبکەینەوەو خۆمان ڕزگار بکەین.

ئەو کەسانەی من ڕۆیشتم بۆ لایان (ڕەحیمی مەلا عەلی شیش فرۆشو

بەڵێندەر)، (کەمالی حاجی شەریف) لەگەڵ کۆمەڵێک خەڵکی تردا.....، با ئەوەش بڵێم کەمالی حاجی شەریف، زۆر بە سنگی فراوانەوە پارمەتی داینو تەنانەت ٥٠ دیناریشی داینێ بۆ کرێی سەیارە کە بیبەین بۆ مەڵبەند لە جیاتی خۆی، بەڵام حاجی (......)و حاجی (.....) ئاسنگەر کە ٢ برا بوون نەیانداو کەوتن بە ڕقا، ئێمەش لەباتی ئەوە کوڕەکەیمان برد بۆ مەڵبەند تا ٦ مانگ لێی نەپرسییەوە، پاشان بە بڕی ١٠٠٠٠ دینار لێی خۆشبوون.

یەکێکی تر لەوانە حاجی مەحمود کونجرینی بوو، من ڕۆیشتمە لای نامەیەکم بۆ برد، قسەم زۆر بۆ کرد وتم: دێمەوە بۆ لات. پاش چەند ڕۆژێک ڕۆیشتمەوە بۆ لای.

وتم: حاجی هاتومەتەوە بۆ پارەکە، وتی: وەرە دانیشە، با قسەت بۆ بکەم، ئەگەر ڕۆیشتیتەوە بۆ دەرەوە، زۆر زۆر سەلام بگەیەنە بە مام جەلال و نەوشیروان، پێیان بڵێ بەخوا پارەکەم هەمووی بردووە بۆ حەج، دوعای خێرم بۆ کردوون کە خوا بیان پارێزێت لە هەموو دەردو بەڵایەک بۆ ئەم میللەتە بمێنن، بەخوا کاکە پارەم نییە بتاندەمێ.

❋ ❋ ❋

عەلی وتی: نامەیەک هەیە دەبێ بیبەم بۆ دکتۆرێک، دوای ٢-٣ ڕۆژ هاتەوە وتی: ئەزانی دکتۆرەکە نایداو ئەڵێ: من لەوانەیە ڕێگای خۆم هەبێت، منیش وتم: کێیە؟ وتی: دکتۆر نەوزاد عەتارە، وتم:

-ئەی بۆ قسە ناکەی من ئەیناسم کەسێکی زۆر بەڕێزە، خۆم لە فرسەتێکدا ئەڕۆم بۆ لای قسەی لەگەڵ دەکەم، با هاوکاری ترمان بکات ئەگەر بریندارێک شتێکمان هەبێت.

دوای ماوەیەک نەخۆش بووم، ڕۆیشتم بۆ لای بۆ چارەسەر، دەنگو باسم لێپرسی، وتی: خۆشیت، وتم:

- دکتۆر بیستومە داوای هاوکارییان لێکردووی بۆ شۆڕش.

- هیچی وا نەبوو، تۆ چۆن دەزانیت؟

- دکتۆر ئاگادارم.

- خۆت نەتناردبوو؟

- نەخێر دوایی پێیان وتم، وتی:

- من چۆن پارە دەدەمە دەست هەموو کەسێک بەینی خۆمان بێت ڕێگای خۆم هەیە، کێ ئەڵێ ئەمە دەستی ڕژێم نییە بۆ سەر ئێمە تا بزانن چی دەکەین بۆ شۆڕش.

- وتم: دکتۆر ئەوە کێشە نییە جارێکی تر نایبینیتەوە، بەڵام ئەگەر بەڕێزت بتوانیت هاوکاریمان بکەیت لەکاتی چالاکیدا لەوانەیە یەکێکمان بریندار بێت، یان لە شاخ یەکێک برینەکەی سەخت بێت، پێمان بڵێین بۆ هاوکاری، بەڕێزت دەتوانیت هاوکاری ئەوەمان بکەیت؟ وتی: ئەگەر شتی وابوو تەنها خۆت وەرە ئەوکاتە شتێک دەکەین، بە عەلی و حاجیم وت: کە ڕۆیشتوومەتە لای دکتۆر نەوزاد قسەم لەگەڵدا کردووە بۆ هاوکاری کردنمان بۆ کاری پێویست، ئیتر ئەوانیش نەڕۆیشتنەوە بۆ لای.

❊ ❊ ❊

بڕیارماندا لەتۆڵەی گیرانی یەک ساڵ بەسەر کەمالی موهەندیسو حەمە شکوردا چەند چالاکییەک بکەین، حاجیو کەمال (کەمال مەحمود فەرەج، هاوڕێیەکی تری مەفرەزەکەمان بوو)، دەڕۆن بۆ بازاڕ زابتێکی ئەمن دەبینن. حاجی بە کەمال دەڵێت ئەمە زابتی ئەمنەو زۆر بێناموسە، حاجی تەقەی لێدەکات دەیکوژێتو چالاکییەکەیان سەرکەوتوو دەبێت.

ڕۆژێک من و عەلی لە مەزادخانەکەی خوارەوە ڕۆیشتینە ناوەوە ٢ زابتمان بینی، یەکێکیان دەمانچەیەکی چواردە خۆری پێبوو، ئەوی تریان هیچی پێنەبوو.

ـوایان کەوتین تا خۆیان کرد بەناو قەیسەرییە باریکەکەدا، لەویادا فەرش و بەتانی و شتی فۆلکلۆری لێدەفرۆشن، خۆیان مەشغوڵ کرد بە فەرش‌و شتەوە عەلی، وتی: من تەسلیمی دەکەم و تۆ دەمانچەکەی لێبسەنە ئنجا دەیکوژم، ڕۆیشتینە پشتیانەوە، عەلی دەمانچەی لێڕاکێشا، کە تەسلیم بێ، زابتەکە یەکسەر دەستی دایە دەمانچەکە، منیش دەستیم گرت.

عەلی تەقەی لێکردوو ڕایکرد، منیش هەرچیم کرد دەمانچەکەم بۆ لێنەکرایەوە، زابتەکەی تریش کەدەمانچەی پێنەبوو ڕایکرد، ناچار منیش بەدوای عەلیدا ڕامکرد، خۆمان کرد بە گوزەری دارتاشەکانا.

عەلی وتـی: دەمانچەکەت هێنا؟، وتـم: نەخێر، تۆ ڕاتکرد منیش فریا نەکەوتم.

وتی: با بڕۆینەوە دەمانچەکەی بهێنین، وتم: دەمانچەی چی؟ ! ئێستا دنیا ورووژاوە، با تووشی شتێ نەبین، نەختێک بۆڵە کەوتە بەینمانەوە،(دوایی زانیاریمان دەستکەوت زابتەکە کوژرا بوو)، ئەو چالاکییانە لەتۆڵەی گیرانی یەک ساڵ بەسەر تێپەڕبوونی کەمالی موهەندیس‌و حەمە شوکردا بوو.

❊

وەکو لە پێشەوە باسمکرد، پیشەی من بۆ ژیانی ڕۆژانە تەنها کرێکاری بوو، بۆیە لە کاتی تۆپبارانی شاری سلێمانی چەندەها ژێرزەمینم دروستکرد بۆ ماڵان، ناوبانگم دەرکردبوو هەر کەسە ژێر زەمینی دروست بکردایە دەهاتن بۆ لام بۆ ئیشکردن، بۆ ژیانی ئەو کاتەم باشبوو دەرامەتی خۆم پێدەبردە سەر، کۆمەڵێک ماڵیش سوودیان لەو ژێر زەمینانە وەردەگرت، هەبوو بەناوی ژێر زەمینەوە شوێنی نهێنی بۆ فیراری دروستدەکرد بۆ کاتی پشکنینی حکومەت.

پیاوێک لە گەڕەکەکەمان ناوی حاجی لەتیف بوو زۆربەی ئیشەکان ئەو بۆی دەدۆزیمەوە پیاوێکی زۆر باش‌و بەڕێز بوو، سەرەتای بەهار بوو ڕۆژێک هات بۆ لام، وتی: ئیشی ٢ ڕۆژم بۆ دۆزیویەتەوە لە مزگەوتی حاجی حان، ئیشی

لەبغ بوو، منیش ئیشی لەبغم دەزانی، دەستمکرد بە ئیشکردن، برادەرێکم هات کەماڵیان بە تەنیشت مزگەوتەکەوە بوو بە ناوی عەلی حاجی سادق، دەستمانکرد بە قسەکردن و برادەرێتیمان نوێکردەوە، پاشان ڕۆیشتم بۆ ماڵیان و هات بۆ ماڵمان، نێوانمان خۆشبووەوە، ڕۆژێک وتی: بۆ نایەیت بۆ لای باوکم ئیشی مریشکفرۆشتن بکەیت، بەڵکو ئیشەکە باشبێت و خێری تێدا بێت، منیش ڕۆیشتم بۆ مەیدانی مریشکەکە بۆ لای حاجی سادقی باوکی عەلی، لە ژێر پردەکە دەستمکرد بە مریشکفرۆشتن، بەڕاستی ئەوە ئیشێکی زۆر باش بوو بۆ من، وردە وردە، فێری ئیشەکەش بووم، عەلی و حاجی (مەبەستم هاوڕێیانی مەفرەزەیە) سەردانیان دەکردم و لام دادەنیشتن، زۆر جاریش دەمانچەکانیان دەهێنا لای من دایاندەنا، منیش لە دوکانەکەدا دەمشاردنەوە.

حاجی هەموو جارێک دەیکرد بەگاڵتە ئەیووت: باشترین شوێن بۆ دەمانچە شاردنەوە لای تۆیە، چونکە شوێنەکەت ئەوەندە پیس و پۆخڵ و بۆگەنە، کەس شکی ئەوە ناکات هیچی لێبێت، ڕۆژێکیان هاتن وتیان: ئەبێت بێیت لەگەڵمان بۆ لای کەسێکی دەوڵەمەند تۆ قسەی لەگەڵ بکەیت، منیش وتم: ئێستا ناتوانم ئیشم زۆرە، ئەوانیش دەیانوت: ناڕۆین تا تۆ لەگەڵمان نەیەیت، هەتا نەیانبردم نەڕۆیشتن، وتیان: ئێمە ئیش بکەین بۆ شۆڕش و تۆش کاسبی بکەیت، بەسەری خۆت ناهێڵین، ئەوکاتە لەو دووکانی مریشکەدا کوڕێکم لەگەڵدا بوو ناوی خالید بوو کوڕێکی باشبوو کەدەڕۆیشتم بۆ ئەملاو ئەلا زۆر یارمەتی دەدام، شتێکیشی لە مەسەلەی من دەزانیو قەت نەیدەدا لە ڕووم، تەنها دەیووت: بڕۆ من لێرە دەبم خەمت نەبێ، ئێستا خالید دوکانی زەڕنگەری هەیە لە بازاڕی خەفاف. کوڕێکی زۆر باش و بەوەفایە.



خالیدی زەڕنگەر



لەڕاستەوە: عەلی حاجی سادق- عەبدولی حاجی سادق- حاجی سادق- ڕەئووف شێخ جەمیل
ساڵی ١٩٩٥

له ١٩٨٤ بەدواوە، له کوردستان ڕژێمی بەعس خەڵکێکی زۆری دەگرت به جاش، بەشی زۆری خەڵکەکەش سەربازی هەڵهاتوو بوون، باری ناچاریی خۆیان دەکرد به جاش خەفیفە، هەبوو سەربازی هەڵاتووش نەبوو، هەر لەبەر خاتری پارە دەبوو به جاش، هەشبوو هەر خۆفرۆشو بێناموس بوو، دژی میللەتی کورد دەیکرد، کۆمەڵێک ڕەفیق حیزبی کوردیش لەبەر خاتری پارە خەریکی پێکهێنانی فەوجی جاش بوون، بێگومان ڕژێمیش نەخشەیەکی دارێژراوی دانا بوو بۆ کوردستان، نەک لەبەر خاتری چاوی کاڵی کورد پارە هەڵبرێژێت بۆ کۆمەڵێک خۆفرۆش، به ئارەزووی خۆیان تەخشانو بەخشانی بکەن، یەکێک لەو مستەشارانە مامۆستا هیمەت کەریم فەتاح بوو، کە له پێشەوە باسمکردووە (مامۆستای ئامادەیی کشتوکاڵیم)، لەساڵی ١٩٨٧ ئەویش خەریکی وەرگرتنی فەوجی خەفیفە بوو.

منیش عەلیو حاجیم تێگەیاند، پەیوەندی بکەین به مامۆستا هیمەتەوە، ئیشێکی باشی پێبکەین بۆ شۆڕش، ئەوانیش ڕازی بوون، منیان ڕاسپارد قسەی لەگەڵ بکەم، له مانگی ٥ دا بوو ڕۆیشتم بۆ ماڵی مامۆستا هیمەت له ماڵ نەبوو، هاوسەرەکەی وتی: لێرە نییە له ناوچەی شوانە، خەریکی پێکهێنانی فەوجەو زۆر مەشغوڵە.

ژمارەی تەلەفۆنی ماڵەوەیانم وەرگرت، بۆ ڕۆژی دوایی تەلەفۆنم بۆ کرد لەماڵ بوو، وتم: دەمەوێت بتبینم هەندێک کاری گرنگم پێت هەیە، وتی:

- سبەینێ وەرە بۆ لام، بۆ ڕۆژی دوایی ڕۆیشتم، دانیشتین بەیەکەوە قسەمان کرد باسی ڕژێم و هێنان و بردنی وەزعەکە، وتی: حەمە ڕەئووف دەڵێی هەر کۆڵت نەداوە، خەریکی ئیشی ناوشاری، وتم:

- دەمەوێت بێمەوە بۆ لات تا لەیەکتر حاڵی ببین، ڕەزامەندی خۆی دەربڕی، وتی: من زۆر مەشغوڵم با به تەواوی ئەم فەوجە وەربگرمو لەم کێشانە ڕزگارم

ـێت بەیەکەوە قسە دەکەینەوە.
- وتم: من سەربەست قسە دەکەم، پشتیش ناکەمە میللەتەکەم لە پێناوی بەرژەوەندی خۆما، جا دەبێت تۆش وەکو من بیر بکەیتەوە، لەوانەیە کاری گرنگمان پێت هەبێت بۆ شۆڕش بیری لێبکەرەوە، ماوەیەکی تر سەرت ـێدەدەمەوە.

* * *

دوای ۱۰ ڕۆژ ڕۆیشتمەوە بۆ لای مامۆستا هیمەت، وتی: ئێستا ئیشوکاری ـەوجەکەم تەواو بووەو لە ناحیەی شوانم، حەمە ڕەئووف دەمەوێت بەڕاشکاوی قسە بکەیت، چونکە من هەر هیمەتەکەی جارانم نابێت هیچ شتێکی شاراوە ـەنێوانماند هەبێت.
- وتم: ئەم جارە لەگەڵ عەلی بەیەکەوە دێین بۆ لات، هەموو شتێکت تێ ـەگەیەنین، هیوام وایە تۆش بە دڵی ئێمە ڕای خۆت دەرببڕیت.
پاش چەند ڕۆژێک من و عەلی ڕۆیشتین بۆ لای مامۆستا هیمەت، هەموو شتێکمان تێگەیاند، بۆ پەیوەندی کردن بە مەڵبەندەوە کە ئیشمان لەگەڵ بکات، ئەویش خۆشحاڵی خۆی دەربڕی، بەڵام بە مەرجێک نامەیەکی مۆر کراوی مەڵبەندی بۆ بهێنین.
- وتم: تۆ ڕاپۆرتێک بنووسە، بۆ مەڵبەند، کە پەیوەندیت کردووە بە ئێمەوەو هاوکاری خۆت دەرببڕە، ئێمەش وەڵامەکەی بۆت دەهێنینەوە، بەڵام بە مەرجێک دەبێت بە دڵی ئێمەو مەڵبەندو مەکتەبی سیاسی ئیشمان بۆ بکەیتو گیانفیداییت تیادا هەبێت، نابێت هیچ زەرەرو زیانێکت بۆ هاوڕێیانو پێشمەرگە هەبێت.
وتی: من هەتا ئێستا هیچ خیانەتێکم نەکردووە، بەرانبەر میللەتی کوردو ناشیکەم، سەد ساڵی تریش حیزبی بەعس لەویادا بێت، من ئەوەندە ئیشی بۆ ناکەم کە زیانی میللەتەکەمی تیا بێت، من منداڵەکانم ناوناوە سیڤەرو لۆزان بە ناوی پەیماننامەکانی کوردەوە، کە هیچیان بۆ گەلی کورد نەکرد، ترسیشم لە

کەس نییە.

وتی: تۆ نامەکەم بۆ بنووسە، ئنجا من بە خەتی خۆم ئەینووسمەوە، چونکە من وەکو ئێوە نازانم بینووسم، منیش لەبەر چاوی خۆی نامەیەکم بۆ نووسی بۆ مەڵبەندی یەک، ئنجا خۆی لەبەر نامەکەی من نووسییەوەو منیش نامەکەی خۆمم دڕاند، وتی: هەر کاتێک وەڵامی نامەکەتان بۆ هێنامەوە، منیش چی بڵێن بەپێی توانا بۆتان دەکەم.

*　　*　　*

هاوینی ١٩٨٧ ناوچەی قەرەداغ هاتووچۆی سەخت ببوو، زۆر بە زەحمەت دەمانتوانی بڕۆین بۆ مەڵبەند، چونکە سوپای دەوڵەتی ئێران هاتبووە ناو خاکی کوردستان، یەکێتی و حیزبەکانی تریش شانبەشانی ئێران دژی ڕژێمی بەعس شەڕیان دەکرد، ڕژێمی بەعس ئەوەندە توورە بوو لە میللەتی کورد هەر کەسێکی بگرتایە، لە زەوی قەدەغە کراودا حسابی جاسوسی ئێرانی بۆ دەکرد. ئەوکاتە ناحیەی قەرەداغیش بە دەست هێزی پێشمەرگەوە بوو.

ڕژێمیش ئەو ناوچانەی هەموو کردبوو بە زەوی قەدەغەکراو، هەر کەسێکی بگرتایە بێ سێ و دوو دەیکوشت، چونکە هەتاکو بورجەکەی قەرەداغ بەدەست ڕژێمەوە بوو.

بۆ ڕۆژی دوایی منو عەلی خۆمان ڕێکخستو وەسیەتمان کرد بۆ ماڵو منداڵ. کە ئەمە ڕێگەی هاتو نەهاتەو ئەگەر نەگەڕاینەوە خۆتان خۆش، بەیانی زوو بەسواری تەکسییەک ڕێگای تانجەرۆمان گرتەبەر، لای زرگوێز دابەزین و تراکتۆرێک هات پڕ بوو لە مانگاو گوێرەکە، ناوەکەی هەمووی شیاکە بوو من و عەلی لە دواوە سوار بووین ، هەتا بورجەکەی قەرەداغ.

عەلی وتی: ئەمانە جاشەکانی شێخ مەحمودی سەید گوڵن قسە ناکەن، ملی ڕێگاکە دەگرین ئەگەر قسەشیان کرد، شتێک ڕێکدەخەین، کاتێک گەیشتینە لای جاشەکان کەس قسەی نەکرد.

ئێمەش ڕێگای قەرەداغمان گرتە بەر، جادەو جادە بەپێ بەسەر ئەو قیرەدا، سەیارەیەک نەبوو سواری ببین، بەو مانگی ٦ و گەرمایە پشتمان شکا تا گەیشتینە ئەم لای قەرەداغەوە، دەگەیشتین بە هەرچی دێیەک ڕووخابوو، نێکانی گەڕەزیل و باخان و چەندەها دێی تر، ئاوەدانییان تیادا نەمابوو، گریانمان دەهات بۆ ئەو گوندە خۆشانەی کوردستان کە ئێستا ئاوا خاپوور بوون بەدەست درندەیی ڕژێمی بەعسەوە، لە پێش قەرەداغەوە دێیەک مابوو بەناوی زێوەمەر.

عەلی وتی: من شارەزام، لێرەوە دەڕۆینەوە سەر چەمی سمۆر، پێش ئەوەی بگەینە ناو گوندەکە بە دووری ٥٠٠ مەتر تراکتۆرێک بە عەرەبانەکەیەوە سووتا بوو.

پاش کەمێک ڕۆیشتینە ناو گوندەکە لە دەرگای ماڵێکمان دا، ئافرەتێک پێشوازی لێکردین، داوای نانمان کرد، ئافرەتەکە نان و دۆی بۆ هێناین، کەمێک پشوومان داو عەلی وتی: ئەو تراکتۆرە سووتاوە کەسی تیادا مرد؟!

ئافرەتەکە وتی: وەڵڵا برا تەیارە سووتانی خێزانێکی تیا مەحف بوەوە، وتی:

- ئەی ئێوە لە کوێوە هاتوون، وتمان: لە شارەوە هاتووین، وتی:

- حافیزوڵڵا هەر لە جادەوە هاتن؟ وتمان:

- بەڵێ!

- هەر خوا فریاتان کەوتووە، چۆن کۆپتەرتان بۆ نەهات؟ وەڵڵاهی چۆلەکە دەرناچێت.

دوای نانخواردن و پشوودان، ماڵئاوایمان لە ماڵەکە کردوو ملی ڕێگامان گرتەبەر بەرەو چەمی سمۆر، کە ڕۆیشتینە چەمەکە ئاوەکەی تەنک ببوو بەئاسانی پیایدا پەڕینەوە.

عەسرێکی درەنگ گەیشتینە گوندی کۆشک و تەکیە، ئەو ناوە پێشمەرگەی زۆری لێبوو، ئنجا بەرەو بەلەکجاڕ ڕۆیشتین زۆر هیلاک بووین.

پێشمەرگەیەک بەسواری ئێسترێک هات بەلامانداو سڵاوی لێکردین، عەلی وتی:

- ئەگەر دەڕۆی بۆ مەڵبەند بە هاوڕێی مەلا کەمالو شێرکۆ جدی بڵێ: عەلیو هاوڕێیەکی تر بەڕێوەن زۆر هیلاکن، ئەگەر سەیارەی لێیە بابێن بەدواماندا.

کاکی پێشمەرگە ڕۆیشت و ئێمەش هەر دەڕۆیشتین.

ڕێگاکەی هی سەیارە بوو، بەڵام زۆر خۆڵ بوو، دوای نیو سەعات تاریک داهات، شەوقی لایتی سەیارەیەک لە دوورەوە دەرکەوت، بەرانبەرمان هات.

عەلی وتی: پەیامەکە گەیشت، لەوانەیە سەیارەی مەڵبەند بێت.

- بەڵێ، وا بوو هاوڕێی مەلا کەمال بە سەیارەیەکی توێتای سپی هات بەرەو ڕوومان، دابەزی و ئەملاو لای ماچ کردین، لە ڕێگا وتی: دەزانن ئەم سەیارەیە هی کابرای دەوڵەمەندە کە پارەی نەدا و کوڕەکەیتان هێنا بۆ مەڵبەند، ئێست هاتووە پارەکە بدا، ئاگاتان لەخۆتان بێت دەتانناسێت!؟ کاتێک گەیشتینە بەلەکجاڕ ڕۆیشتین بۆ مقەڕەکەی هاوڕێ و ئەوان، ئەو پیاوەش لەسەربان خەوتبوو، کە ئێمەی بینی هەستاو بە هاوڕێی وت: ئەو برادەرانە وەختی خۆی هاتنە سەر دوکانەکەم، دەیانناسمەوە پێیان بڵێ دوو قسەیان لەگەڵ دەکەم هاوڕێش پێی دەوت: ئەوانە کادری تیپی ١٥ هەروامانن هاتوون، کابرا هەر بەرەنگاری قسەکەی هاوڕێ دەبوەوە، ئەیووت: ئەو باڵا بەرزەیان دەناسمەوە.

(لە ڕاستیدا ئێمە دوای چەند تەبلیغێک پێمانوت بۆ پارە هەر نەیداو قسەی ناخۆشی دەکرد، پاشان کوڕەکەیمان لەسەر ئەمری مەڵبەند لەناو دوکانەکەید برد، بەسەیارەیەکی تەکسی کە خاوەنی تەکسیەکە پەیوەندی لەگەڵ خۆماندا هەبوو بەناوی فەرەیدون، حاجی و کەمال و عەلی بە ڕێگای هەزار مێرد دا بردیان بۆ مەڵبەند، پاش چەند مانگێک ئنجا پارەی دا، مەڵبەندیش کوڕەکەیان ئازادکرد).

دوای نانخواردنو پشوودان من و عەلی ڕۆیشتین بۆ مقەڕەکەی کاک عومەر فەتاح، کۆبوونەوەیەکی ٢ سەعاتیمان کرد، نامەکەی مامۆستا هیمەتم دایە.

ئەویش ڕەزامەندی دەربڕی و وەڵامی نامەکەی دایەوە، وتیشی: بەڵکو بەنزینمان فریا بخەن بۆ سەیارەکانی مەڵبەند، هیچ ڕێگایەک نەماوە سەیارەی دێهاتەکان بێن بەنزینیان لێوەربگرین، ئەو شەوە ڕۆیشتینەوە بۆ لای هاوڕێی مەلا کەمال، هاوڕێ ٢ جێگای ئامادە کردبوو بۆ ئێمە.

بۆ بەیانییەکەی هەستاین ڕۆیشتین بۆ لای شێرکۆ جدی سەعاتێکیش لای ئەو بووین (شێرکۆ جدی ئەندامی دارایی مەڵبەند بوو وە پوورزای کەمال محمود فەرەجی ئەندام مەفرەزەی تۆڵە بوو)، ئەوکاتە پارەی ناوشارمان تەسلیمی ئەو دەکرد، پاشان هەرچوارمان بەسەیارەی مەڵبەند هاتینەوە بۆ قەرەداغ لە گوندی کۆشک لاماندا، شێرکۆ جدی دەعوەتی کردین بۆ گۆشت و جگەری برژاو، وەکو وتم: قەرەداغ بەدەست پێشمەرگەوە بوو، پاسداریشی لێبوو ئەیانووت بە نیازین کەرکوک بگرین، ئێمە لە قەرەداغ لە هاوڕێی مەلا کەمال و شێرکۆ جیا بووینەوەو بەرەو سلێمانی هاتینەوە، تەیارە هەر گرمەی دەهات بەسەر ناوچەی قەرەداغەوە.

- ئێمەش بەسەر جادەکەدا هاتین نامەکانمان وا دانابوو ئەگەر شتێک ببێت فڕێی بدەین، گەیشتینە گوندی باخان زۆر هیلاک بووین بە عەلیم وت:

- هێشتا ڕۆژ زۆری ماوە با بڕۆینە ناو ئەو چنارانەوە، پشوویەک بدەین‌و کەمێک درەنگ بکات، ئنجا بڕۆین با تووشی شتێک نەبین، بەرەو چنارەکان ڕۆیشتین، (ئەوکاتە ئەو دێهاتانە وێرانکرابوون، ئەو پەڵە چنارانەش کە ئێمەی بۆ ڕۆیشتین بڕدرابوونەوە، دوایی هەڵیاندابوەوە گەڵای زۆر سەوزو جوانیان دەرکردبوو، ئەوەندە چڕبوون کەسی تیا نەدەبیندرا)، ئێمەش ڕۆیشتینە لای کانیەکەوە کەمێک ئاوی پێدا دەهات، خۆمان فێنک کردەوەو شوێنمان خۆشکرد بۆ خەوتن، ئەوەندە هیلاک بووین نازانم چەند خەوتین، لە دەنگی وڕەی هێلیکۆپتەر خەبەرم بووەوە، سەرم هەڵبڕی دوو هێلیکۆپتەر هاتن بەو ناوەدا دەسووڕانەوە، ئنجا هاتن بۆ سەر شوێنەکەی ئێمە، عەلیم خەبەر کردەوە، وتم:

- نەجوڵێیت، هێلیکۆپتەرە، هەر سەیرمان دەکردن، نامەکانم خستە ژێر بەردێک، وتم: ئەگەر گیراین دەڵێین سەربازی هەڵاتووین، خۆمان تەسلیم دەکەینەوە، ئەگەر کوژراشین تەواو.

ماوەی ١٠ دەقە هێلیکۆپتەرەکان، دەهاتنەوە سەر ئێمەو دەڕۆیشتن، ئنجا دوورکەوتنەوە.

عەلی وتی: ئەوە لە ڕەبایەکانەوە بینیویانین، ژنەکەی دوێنێی گوندەکە ڕاستی وت، تا ٢ سەعاتیش نەهاتینە دەرەوە لەناو چنارەکاندا هەر ڕاکشابووین، نزیکی سەعات ٤ ی عەسر نامەو شتەکانمان هەڵگرتەوەو لە نزیکی جادەکەوە بە چەمەکاندا بە وریایی دەڕۆیشتین هەتا گەیشتینەوە لای بوورجەکەی قەرەداغ زۆری خایاند، عەسرێکی درەنگ ڕۆیشتینەوە ناو جاشەکان، هیچ دەنگیان نەکرد، تەکسییەکی بیجۆ وەستا بوو، سواری بووین و بەرەو سلێمانی گەڕاینەوە.

* * *

دوای هاتنەوەمان لەمەڵبەند، منو حاجیو کەمالو عەلی کۆبوونەوەیەکمان ئەنجامدا، باسی مەڵبەندمان کرد کە پێویستیان بە بەنزین هەیە، دەبێت شتێکیان بۆ بکەین، ئنجا باسی مامۆستا هیمەتمان کرد، حاجیو ئەوان نەیاندەناسی. کەمێک لێی بە گوومان بوون، کە پەیوەندیکردن بە ڕەفیق حیزبیو مستەشارەوە ئاسان نییە، دەبێت زۆر ئاگامان لە خۆمان بێت، بەڵام منو عەلی شارەزای بووین لێی نەدەترساین کە خراپە بەرانبەرمان بکات، منو عەلی ڕۆیشتینەوە بۆماڵی مامۆستا هیمەت نامەکەمان دایە، خوێندییەوە وتی:

- ئێستا چی بکەین من فەوجەکەم لە ناحیەی شوانە، ٢ فەوجی تریشی لێیە. یەکێکیان فەوجی شێخ تایەر جەبارییەو ئەوی تریشیان فەوجی....... (ناوی ئەوی تریانم بیر نەماوە)، وتم:

- مامۆستا دەبێت کارێک بکەین کەجێی دەستمان دیار بێت بۆ شۆڕش، هەرچەندە ئێمە زۆریشمان پێناخۆشە کە تێکەڵ بەو جاشانە دەبین، وتی:

- لەوە مەترسن، ئێوە بەتایبەت لەگەڵ خۆم دەبن، بە عەلی وت: لەگەڵ من

وەرە بۆ ناحیەی شوان با شارەزای ناوچەکە بیتو شوێنەکان بناسیت، ئەوکاتە سەرکردایەتی ئاگادار دەکەین چیبکەین.

چەند جارێک عەلی لەگەڵ مامۆستا هیمەت ڕۆیشت بۆ ناحیەی شوان، وتی: ناوچەکە زۆر لەبارە نەخشەم داناوە بۆ گرتنی، تۆش وەرە بزانم چی دەڵێن؟

منو عەلیو مامۆستا هیمەت ڕۆیشتین بۆ ناحیەی شوان سەیرمکرد ناحیەکە هەمووی وێرانەیەو تەنها چەند بینایەکی تیادا ماوە، ئەوانیش زۆربەیان وێران بوون و دەرگاو پەنجەرەیان پێوە نەمابوو، کات هاوین بوو ئەگینا کەس تیایدا نەدەژیا.

تەنها فەوجی جاشی تیا بوو، ئەوانیش بەشەو لەسەربانەکان دەخەوتنو بە درێژایی و پانی ناحیەکە لە هەر چوار لاوە هەمووی ڕەبایە بوون، هەتا دەڕۆیشتی بەرەو شارۆچکەی تەقتەق، بە ڕۆژیش یەک، یەک جاشیان دادەنا بۆ چاودێری جادەکە لەترسی پێشمەرگە، کەوتینە چاودێری ناوچەکە، تەنها چەکداری جاشی تێدا بوو، لەگەڵ مامۆستا هیمەت قسەمانکرد، کە ئێمە نەخشەو بەرنامە دادەنێین بۆ گرتنی ناوچەی شوان، وتی:

- ئێوە چۆن ئەڵێن من لەگەڵتانم، پاشان هاتینەوە بۆ سلێمانی.

من ڕاپۆرتێکم نووسیو حاجی و کەمال ڕۆیشتن بۆ مەڵبەند، ٢٠ هەزار دینارو هەندێ پێویستی ترمان نارد.

پاش ٢ ڕۆژ حاجی و کەمال گەڕانەوە، وتیان: ڕێگا زۆر سەخت بووە کەس دەرناچێت، لە مەڵبەند هەر ئەڵێن بەنزینمان فریا بخەن، ئێمەش گفتمان پێداون دەبێت هەر چۆنێک بێت بەنزینیان فریا بخەین، دەبێت لەسەر بڕیاری مەڵبەند پەیوەندی بکەین بە کاک فەرەیدون عەبدولقادرەوە لە مەڵبەندی ٢ ، چونکە ناحیەی شوان سەر بە سنوری مەڵبەندی ٢ وە، دەبێت نەخشەی چالاکییەکە لە فەرەیدون عەبدولقادر بگەیەنین ئەوان جێبەجێی بکەن.

* * *

له کۆبوونەوەیەکدا کەمالو حاجی وتیان دەبێت بەنزین جێبەجێبکەین بۆ مەڵبەند، چونکە گفتمان پێداون، وە کاک عومەر فەتاح دەیوت: بە ڕەئووفـو عەلیشمان ووتوە بۆ بەنزین دەبێت هەرچۆنێک بێت بۆمان چارەسەر بکەن.

وتم:

- سەیارە چۆن پەیدا بکەین؟

حاجی وتی: من پیکابی برادەرێکی خۆم دەهێنم، ئنجا چۆن بڕۆین بۆ بەنزینخانەکەو بەنزین وەربگرین، بەناوی فەوجی مامۆستا هیمەتەوە یان هەر بەناوی پێشمەرگەوە بڕۆین، حاجی وتی: جارێ بڕۆین بۆ بەنزینخانەکە سەیرێک بکەین بزانین چۆن دەبێت؟!

حاجیو عەلی ڕۆیشتن، هاتنەوە وتیان بەردەرگای بەنزینخانەکە مەفرەزەیەک تەواری کوردی لێیە، بەڵام نازانین چۆن بە لێپرسراوی بەنزینخانەکە بڵێین.

- عەلی وتی: منو حاجی دەڕۆین بە لێپرسراوی بەنزینخانەکە ئەڵێین ئەگەر ڕازیبوو باشە، ڕازی نەبوو بەهەڕەشە لێیدەسێنین، ئەو کاتە هەموو بەچەکەوە دەڕۆین ئەگەر تووشی شتێک هاتین یان دەکوژرێین یان خۆمان دەردەکەین، بۆ ڕۆژی دوایی عەلی و حاجی ڕۆیشتن قسەیان لەگەڵ لێپرسراوی بەنزینخانەکە کرد.

- وتبووی: من چ باوەڕێک بە ئێوە بکەم کە بۆ پێشمەرگەتان دەوێت، دەترسم تووشی کێشە ببم، ئێوە ئەگەر نامەیەکم بە مۆرەوە بۆ بهێنن وەکو سووکە هەڕەشە، ئەگەر کەشفیش ببێت ئەڵێم هەڕەشەیان لێکردووم.

ئێمەش نەماندەزانی چۆن بڕۆینەوە بۆ مەڵبەند، چونکە ئەوەندە ئاسان نەبوو بەو خێراییە، عەلی وتی: من نامەیەکم لایە بۆ سەر دەوڵەمەندەکان لای خوارووی نامەکە بۆشایی زۆرە با ڕەئووف بە خەتێکی جوان بینوسێتو ئەیدەینێ بەڵکو ڕازی بکەین.

بەم شێوەیە نامەکەم نووسی:

(بۆ وێستگەی سووتەمەنی رزگاری)

داوا لە بەڕێزتان دەکەین نوسراومان پەسەند بکەن و چەند بەرمیلێک بەنزینمان پێویستە بۆ مەڵبەندی پێشمەرگە، هاوکاریتان جێگای دڵسۆزی خۆتانو سەربەرزی گەلەکەمانە، سەرپێچیشتان زیان گەیاندنە بەهێزی پێشمەرگەو سزای قورسی لەدوایە).

ئیتر بۆ پێشەوە.

ڕووەو سەرکەوتن

مەڵبەندی یەکی (ی. ن. ک)

نامەکەمان خستە زەرفێکی بچوکەوە عەلیو حاجی بردیان بۆ بەنزینخانەکە، بە دڵخۆشی گەڕانەوە وتیان: ئیشەکەمان سەریگرت، بڕیاری ٤ بەرمیل بەنزینی دا، بەڵام بەمەرجێک سەعات ١٢ نیوەڕۆ دەبێت هەر خۆمان بڕۆینەوەو لای کەس قسە نەکەین، وتیشی: دەبێت نامەکەم لابێت ئەگەر شتێک ڕووی دا لای حکومەت ئەڵێم بە زۆرو بەهێزی چەک لێیان سەندوم، وە لە بازگەکانی حکومەت بڵێن نەوتە چونکە نەوت قەدەغە نییە، عەلی و حاجی زۆریان قسەکرد دەربارەی پیاوەتی ئەو برادەرە، وتی:

- منیش هەموو کەسوکارم پێشمەرگەیە.

بۆ ڕۆژی دوایی قسەمانکرد چۆن بڕۆین، من چەکێکم لە مامۆستا هیمەت وەرگرت.

عەلی وتی: تۆ کلاشینکۆفەکە بهێنەو لەگەڵ کەمال لەبەر دەرگا بوەستن ئەگەر هەرچییەک ڕوویدا، یان دەستبکەنەوە یان تەوارییەکان تەسلیم بکەن، من و حاجیش بەدەمانچەوە دەڕۆین و سەیارەکە دەبەینە ژوورەوە، بەرمیلەکان پڕ لە بەنزین دەکەین، ئەگەر زانیمان تەڵەیە دەستدەکەینەوە، ئەگەر هیچیش نەبوو ئەوا بەسەلامەتی دەڕۆین.

ڕۆژی دوایی عەلی و حاجی پیکابەکەیان بە ٤ بەرمیلەوە هێنا، منو کەمالیش

به تەکسییەک بەدوایاندا ڕۆیشتین، گەیشتینە بەنزینخانەکە لەبەردەم دەرگاکە وەستانیان، حاجی دابەزیو قسەی لەگەڵ تەوارییەکان کرد، منیش بەچەکەوە ڕۆیشتمە تەنیشتیان وەستام، ئەوەندەمزانی یەکێک هات ئیشارەتی بۆ سەیارەکە کردو بردیە ژوورەوە، ئێمەش هەر وەستابووین تا حاجی بەرمیلەکانی پڕ کرد، عەلی پارەی بەنزینەکەی داو ڕۆیشتن، ئێمەش بە تەکسیەک بەدوایاندا، گەیشتینە لای وڵووبە حاجی وەستا ئێمەش لە تەکسیەکە دابەزین، دەستمانکرد بە قسەکردن، حاجی و کەمال وتیان: ئێمە دەیبەین، کاک عومەر فەتاح ئەیووت لە شارەزوورەوە ڕێگا هەیە خۆمان دەزانین چۆنی دەبەین ئێوە بگەڕێنەوە، حاجی دەمانچەکەیدا بە عەلی، ئەوان ڕۆیشتن و منو عەلی گەڕاینەوە.

حاجیو کەمال بۆ ئێوارە گەڕانەوە، وتیان: لەخوار زەڕایەنەوە بە جادەیەکی گڵدا بردمان هەتا گەیشتینە گوندە ئاوەدانەکان لە گوندێک دامانگرتن پارەمان دا بە گەنجێکی گوندەکەو، وتمان: بە سواری وڵاخ بڕۆ بۆ بەلەکجاڕ، نامەیەکمان بۆ نووسی بیدا بە مەڵبەند کە بیگەیەنێت بە دەستی شێرکۆ جدی، تراکتۆر بنێرن بۆ بەرمیلە بەنزینەکان، وتیان دڵنیابن کە دەگات خەمتان نەبێت.

❊ ❊ ❊

وەکو لەپێشەوە باسمکرد لەمەڵبەندی یەکەوە وتیان دەبێ پەیوەندی بە فەرەیدون عەبدولقادرەوە بکەین، چونکە ناوچەی شوان پەیوەندی هەیە بە مەڵبەندی دووەوە.

قسەمان لەگەڵ کرد کە بڕۆین بۆ لای فەرەیدون عەبدولقادر لە چۆخماخ، کەمال و حاجیمان نارد دوای ٣ ڕۆژ هاتنەوە، هاتن بۆ لای من لە ماڵەوە، وتیان: پەیوەندیمان کرد بە کاک فەرەیدونەوەو قسەمان لەسەر کرد، کە دەمانەوێت ناحیەی شوان بدەین بە دەست پێشمەرگەوە ئەویش نامەی داینێ بۆ ناوچەی خاڵخاڵان، پەیوەندی بکەین بە مامۆستا جمهور و کاک شوانەی تەنسیقەوە تا لەگەڵ ئەوان کارەکان ڕاپەڕێنین.

عەلی وتی: با قسە لەگەڵ مامۆستا هیمەت بکەینەوە، من ئەڕۆم بۆ ناوچەی خاڵخاڵان، قسەیان لەگەڵدا دەکەم بزانین چی ئەڵێن.

ڕۆیشتین بۆ ماڵی مامۆستا هیمەت قسەمان لەگەڵ کرد، وتی:

- من چاوەڕێی ئێوەم؟

ئێمەش بە عەلیمان وت: بڕوات بۆ ناوچەی خاڵخاڵان، بە سەیارە ڕۆیشت بۆ چەمچەماڵ لە وێوە بڕوات بۆ گۆپتەپەو عەسکەر .

دوای ٢ ڕۆژ هاتەوە، تەواوی ئیشەکانی جێبەجێ کردبوو، وتی:

- چاوم کەوتووە بە کاک شوان و مامۆستا جمهور، تاووتوێی ئیشەکانمان کردووە، بە عەلییان وتبوو نەخشەیەکی ڕەبایەو ناحیەکەمان بۆ بهێنەو خەمتان نەبێت، وتی ناونیشانی کەسێکیشیان داومەتێ لە چەمچەماڵ ئەو ماتۆڕی پێیە بۆ ڕاپەڕاندنی ئیشەکان پەیوەندی بکەم بەوەوە. عەلی ڕوویکردە من، وتی: حاکم قادریش لەناوچەی خاڵخاڵان بوو بەڵام خۆم لێ ئاشکرا نەکرد.

*

من و عەلی و مامۆستا هیمەت ڕۆیشتین بۆ ناحیەی شوان، ٤ ڕۆژ لەوێ ماینەوە، نەخشەیەکی تەواوی ناحیەکەو هەموو ڕەبایەکانی دەوروبەریمان کێشا، چەند چەکی گەورەو بچووکی تێدایەو چەند ئاربیجی تێدا بوو، هەموویانمان سەرژمێرکرد، ڕەبایەکانی فەوجەکەی مامۆستا هیمەت ئاسان بوون دەمانووت سەرژمێری چەک و نەفەرەکانە، بەڵام فەوجەکەی شێخ تایەر جەباری و فەوجەکەی تر کەمێک ئاسان نەبوون، بۆیە هەر بە سەردان دەڕۆیشتین بۆ ڕەبایەکانو بەچاو چەکەکانمان دەژماردن.

لەگەڵ مامۆستا هیمەت لەسەر ٢ لاپەڕەی گەورە نەخشەی ناوچەکەمان کێشا، بەڕێگاکان و هەموو ڕەبایەکانەوە، دامانە دەست عەلی بیباتەوە بۆ دوا بڕیاری کاک شوان و ئەوان.

عەلی بۆ ڕۆژی دووەم هاتەوە، وتی: بڕیاریاندا ناحیەی شوان بگرن، وتی: ئەڵێن دەبێت تۆشمان لەگەڵدا بیت و هاوڕێیانی تریش لە ناحیەی شوان ئامادە

بن، بەڵام دەبێت زۆر ئاگایان لە خۆیان بێت نەکوژرێن، عەلی وتی: ئێستا ئەوان خەریکی کۆکردنەوەی چەند تیپێکن، ئەڵێن نابێت ٣ تیپ کەمتر بێت، ئێمە دەمانەوێ سەرکەوتن و دەستکەوتی باش بەدەست بهێنین، ئێستا بە منیان وتووە کە ئێوە ئامادەبن و من خەبەرەکە بدەمەوە بەوان.

من و مامۆستا هیمەت بە عەلیمان وت هەتا زوو بڕۆی باشترە، عەلی دوای پشوویەک گەڕایەوە بۆ چەمچەماڵ و بۆ شەوەکەی گەیشتەوە گۆپتەپە، من و مامۆستا هیمەتیش هاتینەوە بۆ سلێمانی.

حاجی و کەمالم ئاگادارکردەوەو ڕۆیشتین بۆ لای مامۆستا هیمەت، کە هەمووما‌ن بڕۆین بۆ ناحیەی شوان، مامۆستا هیمەت وتی: حەمە ڕەئووف من نایەم بەڵام چیام لە شوێنی خۆم داناوەو هەموو شتێکم تێگەیاندووە، چیا پوورزای مامۆستا هیمەت بوو، کوڕێکی باوەڕپێکراو بوو، پاشان من و حاجی و کەمال بەچەکەوە بەسەیارەی مامۆستا هیمەت گەڕاینەوە بۆ ناوچەی شوان. وتیان کە ئێمە لەناو ناحیەکەوە لەسەر بانێک بەچوار دەوردا دابنیشین، ئەگەر پێشمەرگە هاتن فیشەکی سوور هەڵبدەین وەکو ئیشارەت، وە ئەگەر بزانین جاشەکانی دەوروبەرمان دەستدەکەنەوە ئێمە تەقەیان لێبکەین.

بۆ شەوی دووەمین هەتا ٤ ی بەیانی چاوەڕێی پێشمەرگەمان کرد نەهاتن. هیچ جۆرە گەیاندنێکیشمان نەبوو کەپەیوەندییان پێوە بکەین، بۆ بەیانییەکەی مامۆستا هیمەت هاتەوە بۆ لامان، وتی: دەنگو باس، وتمان: نەهاتن، لەوانەیە ئەمشەو بێن تا لای عەسر مامۆستا هیمەت مایەوە پاشان ئەو گەڕایەوە بۆ سلێمانی.

بۆ شەوی سێیەم هەمان چاوەڕوانی هەر دیار نەبوون، لە ڕەبایەکانەوە هەندێ جار تەقە دەکرا، ئێمەش دڵمان خۆش دەبوو بەڵام هیچ نەبوو، بۆ ڕۆژی دوایی مامۆستا هیمەت گەڕایەوە، وتی: حەمە ڕەئووف دەنگ نەبوو؟ وتم: دەنگیان نییە نازانم هۆکەی چییە؟ عەلیش دیار نییە، عەسر بوو بە تەقە لە خوار ناحیەی شوانەوە، وتم: مامۆستا بابڕۆین بزانین ئەو تەقانە چییە؟

٢ - ٣ سەیارە کۆبووینەوە، بە وریایی ڕۆیشتین تا ڕەبایەیەکی خوارەوە کە بەسەر ڕێگایەکدا دەیڕوانی بەرەو سنووری پێشمەرگە، کەڕۆیشتین جاشەکانی ناو ڕەبایەکە خۆیان دابوو بە زەوییەکەداو بڵاوببوونەوە خۆیان ئامادە کردبوو بۆ بەرگری، جاشێکیان وتی: ماتۆڕێک، ٢ کەسی بەسەرەوە بوو دەهاتن بەرەو ئێرە، منیش تەقەم لێکردنو گەڕانەوە

- نزیکەی سەعاتێک لەو ناوە بووین، بە مامۆستا هیمەتم وت: ئەو ماتۆڕە عەلی و ئەوان بوون ویستوویانە خەبەر بهێنن کە پێشمەرگە لەم ناوە نزیکە، وا دیارە هاتوون، ئێمە گەڕاینەوە بۆ ناحیەکە، جاشەکان ترسابوونو وریا ببوونەوە، مامۆستا هیمەت ئەو شەوە لە شوان مایەوە.

بۆ بەیانییەکەی یەک کەتیبەی مدەرەعات هاتن و بە چوار دەوری ناوچەی شوان دا ڕەبایەی خۆیان دامەزراند و هەموو ڕەبایەیەکیش مدەرەعەیەکیان لێدانا، لە ناحیەکەش هەموو شوێنە سەرەکییەکانیان گرت، منیش هەموو شوێنەکانم ژمارد ٢٠ مدەرەعە بوون، ئنجا داوای مستەشارەکانیان کرد بۆ کۆبوونەوە، مامۆستا هیمەت، وتی: حەمە ڕەئووف وەرە لەگەڵما بزانین ئەڵێن چی؟ تۆش ئاگادار بە، کە ئێمە ڕۆیشتین، تەنها مامۆستا هیمەتیان هێشت بڕواتە ژوورەوە، نزیکەی ٢ سەعاتی خایاند.

مامۆستا هیمەت وتی: لە کۆبوونەوەکە وتیان ئیخباریمان بۆ هاتووە کە ناحیەی شوان بەنیازن لەلایەن پێشمەرگەوە بیگرن و زیانێکی باش لە ناوچەکە بدەن ئێستاش حکومەت ئێمەی ناردووە بۆ چاودێری و بەرگری ئێرە.

کە ئەوەمان بیست خەممان لێهات، چۆن هەواڵ بەرین، ئەگەر پێشمەرگە بەو شێوەیە بێت زیانی زۆریان لێدەکەوێت.

ئەو شەوەش هیچ ڕووی نەدا، بەڵام ئەو کەتیبە سەربازییە هەتا بەیانی ئەوەندە تەڵقە تەنورەیان هەڵداوە بۆ ناوچەکە، ببو بە ڕۆژی ڕووناک، بۆ بەیانییەکەی عەلی سەیارەیەکی تایبەتی گرتبوو.

وتی: پێڕێ بە ماتۆڕ، لەگەڵ برادەرێکی تردا هاتین ڕەبایەکەی خوارەوە

تەقەیان لێکردین، بە پەلە گەڕاینەوە، وتی: تیپەکان کۆبوونەتەوە، هاتوونەتە نزیک شوان، بەنیازن ئەمشەو یان سبەی شەو بێن، وتمان:

- ئەو مدەرەعانە ئەبینی، زانیاری دراوەتە حکومەت کە پێشمەرگە بەنیازن ناوچەی شوان بگرن، مامۆستا هیمەت خۆی لە کۆبوونەوەکەدا بوو، وتمان. بەپەلە بگەڕێرەوە ئەم هەواڵە بەرەوە کە چوار دەوری شوان بەکەتیبەی مدەرەعە گیراوەو ژمارەیان ۲۰ مدەرەعەیەو لە ئامادەباشیدان.

دوای ۲ ڕۆژ عەلی بە نائومێدی هاتەوە وتی: بە کاک شوانو مامۆستا جمهورم وت کەتیبەی مدەڕەعات هاتووە بۆ ناوچەکەو لە کۆبوونەوەدا بە مستەشارەکانیان وتووە، خەبەر هاتووە کە هێزی پێشمەرگە بە نیازن ناحیەی شوان بگرن، کاک شوان کێشای بە ئەژنۆی خۆیا، وتی: خەتای خۆمان بوو ئەوەندە دوامان خست هەتا ڕژێم پێی زانی، ئەو خیانەتە لای ئێوەوەیە یان لە ناو ئێمەدا دەستی خیانەتی تێدایە، عەلی وتی، منیش پێموتن: ئەگەر دەستی خیانەت لەناو ئێمەدا بوایە تەڵەیان بۆ پێشمەرگە دەنایەوە هەتا زیانێکی گەورەی لێبکەوێ، نەک بەپەلە من بنێرنەوە ئاگادارتان بکەمەوە، ئەوە بزانە لای خۆتانەوەیە، بەڵام با ئەوەتان پێ بڵێم ئێمە ئەو ڕەنجەمان بەزایە چوو ماوەی ۲۰ ڕۆژ زیاترە خەریکی نەخشەدانان و هاتوچۆین، ئەوە ئەنجامەکەی بوو، وتی: کاک شوان و مامۆستا جمهور زۆر بە عاجزییەوە منیان بەڕێکرد، لە ئەنجامی ئەو هەموو پیلان و هاتووچۆیەدا دواییەکەی هیچ دەرچوو.

حاجی و کەمال چەکەکانیان دایەوە بە مامۆستا هیمەت، بە بێزارییەوە گەڕاینەوە، بەڵام من چەکەکەم لەگەڵ خۆم برد، بە منیان وت: تۆ بۆ چەکەکەت نادەیتەوە، منیش وتم: تازە ئەم چەکە هی خۆمە بزانن وا دەبێت یان نا.

ئنجا ڕۆیشتمەوە سەر دووکانەکەم، حاجی سادق کە پیاوێکی زۆر باش بوو دەیزانی من خەریکی چیم، یارمەتی زۆر دەدام، هەمدیسان دەستمکردەوە بە مریشکفرۆشی بۆ بژێوی ژیانی ڕۆژانە.

لەناو شاردا خەڵکێکی زۆر سوودی لە ژیانی خۆفرۆشی و جاشایەتی و کلکایەتی دەبینی و ژیانی ڕۆژانەی خۆی بەسەر شۆڕی پێدەبردەسەر، ئەویش جۆرە دزییەک بوو بە ئاشکرا، خەڵکانی تریان دەچەوساندەوە، بۆ نموونە شاهۆی بەلەدییە لەگەڵ چەند کەسێکی تردا بەناوی قەدەغەوە سوودێکی زۆریان دەبینی لە دەستی دوکاندارەکان، کە تەرازووی خەڵکیان دەگرت و عەرەبانەو مریشکو هەتا هی دوکانە بەقاڵەکانی ناوشارو عەرەبانەی حەماڵیو عەرەبانەی وشکەو میوەو چەندەها شتی تر، پاشان پارەیان لێدەسەندن یان بە شت پێیان دەگۆڕینەوە و دەستکەوتێکی باشیان هەبوو، چەندەها شتی لاوەکی ئەو ڕۆژگارە هەیە کە بیگێڕینەوە بەڵام بەمە تەواو نابێت، تەنها ئەم چالاکییەی عەلیو حاجی دەگێڕمەوە.

تەوارییەک فێر ببوو، هەموو ڕۆژێک لای ئێواران دەهات بۆ ژێر پردەکە بۆ لای مریشکفرۆشەکان، لەسەرەوە دەهاتە خوارەوە، ئەیووت: مریشک بەچەندە؟ نەخێر گرانەو بیانووی پێدەگرتیت یان پارەی لێدەسەندی ، یان دەیبردی گەڕی پێدەکردیت، ئەم تەوارییە بۆی ببوو بە پیشە هەموو ڕۆژێک لای ئێواران دەهات، ئەیووت: مریشک بە چەندەو لەهەر دوکانێک دینارێکی وەردەگرت، دینارێکی ئەو کاتەش زۆر بوو، ئێمەش ٣٠ دوکانێک دەبووین ئەو پارەیەی کۆدەکردەوەو دەڕۆیشت بۆ ئێوارە لەگەڵ چەند کەسێکی خوێڕی تردا سەری خۆیان گەرم دەکرد.

کردارەکانی ئەو تەوارییە خوێڕییە دای لە دڵم منیش بە عەلی و حاجیم وت: ئەم تەوارییە تەواو بێزاری کردوین، شتێکی لێبکەن، وتیان: ئیشێکی چاکە، هەم چەکێک دەستکەوتمان دەبێتو هەم تەوارییەکی خوێڕی لەناو دەبەین، ئێوارەیەک عەلی و حاجی هاتن لەولاوە ڕاوەستان، تەوارییەکەش لەو ناوەدا بۆ مڵ و مووشی دوکانەکان دەگەڕا، خەریک بوو درەنگی دەکرد گەیشتە لای من و دینارێکم دایە تەوارییەکە لەگۆشەی دوکانەکەی من پێچی کردەوە بۆ خوارەوە،

بەچاو ئیشارەتم بۆ عەلی و حاجی کرد، ئەوان ڕۆیشتن و منیش خێرا دەرابەی دوکانەکەم دادایەوەو بە حاجی سادقم وت: دوکانەکەت بپێچەرەوە، وتی: بۆ کاک ڕەئووف؟! وتم: خێرا کاک حاجی!!

حاجی سادق مریشکی سەربڕاوی دەفرۆشت، خەریکبووین مێزو شتەکان بەرینە ژوورەوە کاتێکم زانی تەواریەکە بە هاوار هاوار بەلامانا ڕایکرد بۆ سەر پردەکەو ئەیووت فریاکەون چەکەکەیان لێسەندم، هانای بۆ تەواریەکانی سەر پردەکە برد ئەوانیش بە ڕاکردن هاتنە خوارەوە بەرەو ڕووی ڕووداوەکە، حاجی سادق وتی: ئەمە چی بوو؟ کاک ڕەئووف! وتم: نازانم حاجی !

لەو لاوە تەوارییەکان، تەوارییەکەی تریان پێش خۆیان داو بە جنێودان هێنایانەوە، ئەیانوت: دەبڕۆ خوێڕی ئنجا پارە کۆبکەرەوە لەو خەڵکە، چەند جارمان پێوتیت وا مەکە، هەتا ئەوەت بەسەر هات.

بۆ شەوەکەی عەلی و حاجی هاتن بۆ ماڵمان، وتیان: ئەم دەستکەوتە بە هی تۆی دەزانین، وتم:

- بۆ نەتانکوشت، وتیان: چی بکوژین، هەر دەمانچەمان لێڕاکێشا چەکەکەی فڕێداو ڕایکرد، فریای ئەوە نەکەوتین بیکوژین، ئێمەش چەکەکەمان هەڵگرتەوەو بە گوزەری ئاسنگەرەکاندا دەرچووین.

لەدوای ئەوە کاکی تەواریمان نەبینیەوە بێتەوە بەوناوەدا.

* * *

مامۆستا هیمەت ڕۆژێ من و عەلی بانگ کرد، وتی: لەم ڕۆژانەدا کۆبوونەوەی ئەندامانی حیزبی بەعس بوو، هەموو ئەندامەکانی سلێمانیان بانگکرد بۆ کۆبوونەوە، کۆبوونەوەکە لەسەر پرسو ڕا بوو بەرانبەر بە کوردو پێشمەرگە. بەنیازن ئەنفالی کورد بکەن و هەموو دێهاتەکان کیمیاباران بکەن و پێشمەرگە نەهێڵن، ئەوەشی لەمەودوا بگیرێت لەناو شاردا کەسوکارەکەی لەگەڵدا دەگرن و هەموویان لەناو دەبەن و حسابی عەمیلی ئێرانیان بۆ دەکەن، لە کۆبوونەوەکەدا

باس لەوەکرا کە پێشمەرگە ئێستا بە پاڵپشتی ئێران شەڕ دەکەن، پێیانوتین هەر ئەندامە ڕای خۆی دەرببڕێت، زۆربەی ئەندامانی بەعس بە کوردەکانیشەوە لەگەڵ قسەی ڕژێمدا بوون بەرانبەر ئەنفالی کورد، وتی: ڕایبگەیەنن بەسەرکردایەتی.

لە پاشان من و عەلی لەگەڵ حاجی و کەمال و بەرهەم دانیشتنمان کرد.

من یەکەم جارم بوو لەگەڵ بەرهەم دابنیشم لە کۆبوونەوەکەدا باسمانکرد، حاجی وتی:منیش ئەوەم بیستووە کە کوردە خۆفرۆشەکان، یەکێک لەوانە عەبە کوێری زەراعە کە بە ڕەفیق عەبدوڵڵا حەسەن بەناوبانگە لە حزبی بەعسدا هەستاوە لەسەر پێشمەرگە قسەی کردووە: من ڕام وایە ئەو خائینانە هەمووی لەناو ببرێن بە خۆشمەوە کە کوردم، تەنها بۆ سەلامەتی حیزبی بەعس، لە کۆبوونەوەکەدا لەلایەن ئەندامانەوە چەپڵەیەکی زۆری بۆ لێدراوە، حاجی وتی: ئێستا من ئەوە ڕای خۆمە، دەبێت ئەو خۆفرۆشە لەناو ببرێت، با حیزبی بەعس بزانێ هیچ لە کورد ون نابێت، ئەوە تۆڵەی کوردە بەسەر ئەوو چەندەها خۆفرۆشی تریشەوە، وتی: من ئەگەر بە تەنها تەقەم لێکردبێت دەیکەم، بەرهەمیش وتی: منیش لەگەڵتام، کەمالیش هەمان قسەیکرد، وتیان: بەیەکەوە ئیشەکە دەکەین.

سەرەتای مانگی ٨ / ١٩٨٧ سەر لەبەیانی بۆ خۆفرۆش عەبدوڵڵا حەسەن لە کۆڵانەکەی پشتی چێشتخانەی شکارەوە بۆسەیان دانا، حاجی و بەرهەم تەقەیان لێکردوو ٩ فیشەکیان پێوەنا، کەمالیش وەکو حمایە لەگەڵیان بوو، سەیارە تەکسییەکەی فەرەیدونیشیان پێبوو، بەسەرکەوتوویی ئیشەکەیان ئەنجامداو بە تەکسییەکە ڕۆیشتن، بەڵام ئەو خۆفرۆشە (عەبدوڵڵا حەسەن) کۆتایی بە ژیانی پڕ شەرمەزاری نەهات و نەمرد، دوایش هەر ئەو مەسەلەیە بوو بە گەورەترین بەڵا بۆ مەفرەزەکەمان.

# دەستگیرکردنی هاوڕێیانی مەفرەزە

## - ٦٠ -

لە دوای تەقەکردن لەعەبدوڵڵا حەسەن، فەرەیدون دوای چەند ڕۆژێک پەیوەندی دەکات بە ئەمنی سلێمانییەوە ، ناوی چەند کەسێکی مەفرەزەکەمان دەڵێت بە بەڵگەی تەواوی ئەوەی کە تەقەشیان کردووە لە ڕەفیق عەبدوڵڵا حەسەن، کە بە تۆمارکردنی دەنگی حاجی و بەرهەم و کەمال لە ریکۆردەری ناو تەکسییەکەدا، پاشان کاسێتەکە دەداتە دەست کاربەدەستانی ئەمن، ئنجا بە پلانێکی داڕێژراوی ئەمنی سلێمانی حاجی و بەرهەم و کەمال کە فەرەیدونیشیان لەگەڵ دەبێت سەعات ٤ ی پاش نیوەڕۆ، ڕۆژی ١١ / ٨ / ١٩٨٧ لە گەڕەکی ئیسکان، فەرەیدون دەیانباتە کۆڵانێکەوەو ٢ سەیارەی قوات خاسە هەردوو سەری کۆڵانەکەیان لێدەگرن، ئەمانیش دەمانچەیان پێدەبێت، لەویادا هەموویان دەگرن و دەیانبەن بۆ ئەمنی سلێمانی، دوای لێکۆڵینەوە و بەڵگەی تەواو لەسەریان و بە شاهیدی فەرەیدوون لەبەردەمیاندا، ئنجا ڕەفیق عەبدوڵڵا دەهێنن هەر لەویادا حاجیو بەرهەم تۆمەتبار دەکات کە ئەوان تەقەیان لێکردووە.

پیاوانی ڕژێم نەئەشکەنجەیان دەدەن و نەقسەیان لەگەڵ دەکەن تەنها دەیانکەنە ژوورێکی ئینفرادی ئەمنە سوورەکەوە، پاشان دەکەونە خۆیان بۆ گرتنی هاوڕێیانی تری مەفرەزەکە بە هاوکاری فەرەیدونی خۆفرۆش و چەند خۆفرۆشێکی تر لە ڕۆژی ١٩ / ٨ / ١٩٨٧ تارقیش کەهاوڕێیەکی تری مەفرەزەی تۆڵە بوو دەستگیری دەکەن.

* * *

لە دوای دەستگیرکردنی ئەو هاوڕێیانە عەلی هات بۆ دوکان، وتی: هەر ئێستا وەرە لەگەڵما ئیشی گرنگم پێتە.

دەستم لە ئیش هەڵگرت ڕۆیشتین بۆ ماڵی حاجی، ماڵیان زۆر شڵەژابوون، دایکی وتی: تکایە زوو بڕۆن ئاگامان لێیە چاودێریمان دەکەن با ئێوەش نەگیرێن، تکاتان لێدەکەم لەئێستاوە خۆتان بشارنەوە، ئنجا من و عەلی ڕۆیشتین، وتم: ئەو کەسە تۆ دەناسێت؟ وتی: ئەی چۆن نامناسێت!، وتم: ئەی من؟، ئەی قابیلە ئێمە هەموو ڕۆژێک بەیەکەوە نەبووین، وتم: ئێستا چی بکەین؟

وتی با بڕۆین بۆ لای هاوڕێیەکی تر هەندێک قسە بکەین، ڕۆیشتین بۆ دوکانی ئاسنگەرێک، لەگەڵ خاوەنەکەی بەیەکی ناساندین، شۆڕشی مەلا خدر، برای (هێرشی مەلا خدر پێشمەرگەی دێرین)، شۆڕشیش شپرزە بوو، وتی: منیش خەمم لێ هاتووە کەدەستگیر بکرێم، عەلی وتی: ئێستا بۆ ئەوە هاتووم با ڕەئووف بتناسێت دوایی یەکتر بگرنەوە بۆ ئیشکردن، تۆش چەند کەست ناسی بە ڕەئووفی بناسێنە، ئەگەر نەشگیراین ئەوە دەستبەکار دەبین.

* * *

وازم لە ئیش هێنا، هەر لەگەڵ عەلیدا بووم، وتم: عەلی مامۆستا هیمەت ئاگادار کەین با دوایی گلەیی نەکات.

بەیەکەوە ڕۆیشتین بۆ ماڵی مامۆستا هیمەت ئەویشمان تێگەیاند، ئەویش کەمێک بیری کردەوە، وتی: چی بکەین؟ وتمان: هەر ئاگادار بە ئێمە چەند ڕۆژە خۆمان دەپارێزین، وتی: حەمە ڕەئووف ئەگەر دەزانن خەتەرییاتتان لەسەرە بڕۆن بۆ ناوچەی شوان، ماوەیەک لەوێ بن بزانن چی دەبێت.

وتم بە عەلی: ئەگەر دەزانی زۆر بێزاری، دەڕۆین بۆ شاخ، تا بزانین زروف چی لێدێت، وتی: دڵم خەبەری داوە من دەگیرێم بەڵام خەمی منداڵەکانمە، ئەوە ئاشتی لەم مانگەدا منداڵی دەبێت، ئەی چۆن دڵم بێت هەژاری کوڕم جێبهێڵم، ئنجا هیچ دەرەتانێک نەماوە، وتم: کاکە لەمڕۆ زووتر نییە بەیەکەوە

دەڕۆین، ئەم شەو دەڕۆینەوە بۆ ماڵی خۆمان، بۆ سبەینێ دەڕۆین بۆ بازاڕ تاقم مەخزەن و پێویستی دەکڕین، من چەکەکەی مامۆستا هیمەتم لایە، تۆش چەکێکی لێوەربگرە، لەوێوە دەڕۆین بۆ گۆپتەپەو عەسکەر، ئێمەش وەکو ئەو هەموو پێشمەرگەیە یان دەژین یان دەمرین، هەر چۆن بوو عەلی ڕازی بوو.
بۆ ڕۆژی دوایی ڕۆیشتین بۆ بازاڕ تاقم مەخزەنمان کڕی و هەندێک پێویستی شاخ و هەندێک پێویستی ماڵەوەمان دابین کرد، بڕیارماندا لەو ٢-٣ ڕۆژەدا بڕۆین، منیش دایکم و باوکم ماڵەوەم تێگەیاند کە من و عەلی دەڕۆین بۆ شاخ، هەرچەندە دەشزانین کە هیچ دەرەتانێک نەماوە بەڵام چار نییە، ئەوکاتە من ٢ کچم هەبوون یەکێکیان ٢ ساڵ و نیو ئەوتریان ٥ مانگ بوو، ئەو شەوە هەتا بەیانی خێزانم نەخەوت هەر دەگریاو ئەیووت: من چۆن ژیان بەسەر بەرم. حکومەت بەو دڕندەییە، ئەگەر بگیرێم تاوانم چییە؟!

بەڵام ئەوەی باشبوو، منو عەلی هەردووکمان لە قاتی دووەمی ماڵی باوکمان دا بووین کرێمان نەدەداو یارمەتی کەسوکارمان هەبوو، زۆر خەممان نەبوو، ڕۆژی ٢٨ / ٨ / ١٩٨٧ دوا بڕیارماندا، وتم:

- سەعات ٧ بەیانی وەرە بۆ ماڵی ئێمە، پێویستییەکان لەگەڵ خۆت بهێنەو بەیەکەوە دەڕۆین.

بەیانی زوو هەستام لەخەو، خۆم ڕێکخستو چەک و پێویستییەکانم ئامادەکرد چاوەڕێی عەلی بووم، سەعات ٧ نەهات، بوو بە ٨ نەهات، ٩ عەلی نەهات. دڵم گۆڕا، لە سەعات ١١ دا سەیارەیەک هاتە کۆڵانەکەمان لەبەر دەرگای ئێمە وەستا، ڕۆیشتم دەرگا بکەمەوە، وەستا جەباری برای عەلی و ئاشتی هاوسەری بوون، ڕەنگیان پەڕیبوو، وتیان: عەلی نەهات بۆ لای تۆ؟!

- وتم: نەخێر لەسەعات حەوتەوە من چاوەڕێی ئەو دەکەم.

وەستا جەبار وتی: عەلی دەستگیر کرا، بەیانی سەعات ٧ هات بۆ لای تۆ. بەڵام لە فولکەکەی لای ماڵی خۆمان (واتە فولکەی گەڕەکی خەبات)، پۆلیسێکی دراوسێمان چاوی لێدەبێت بە پاڵ دەیخەنە ناو سەیارەیەکی بەڕازیلی سوورەوەو

دەیبەن، وتی: یەکێکیان دەم و چاویشی پێچابوو، ئێمە وتمان: لەوانەیە تۆ بیت ماتبێتیت بەشوێنیدا، وتم: بۆی مەگەڕێن کەواتە عەلیش دەستگیر کرا، وەستا جەبار وتی: ئەی تۆ چی دەکەیت؟

- وتم: مادام عەلی و حاجی و ئەوان گیران منیش لەوان زیاتر نیم. وتی:

- تکات لێدەکەم ئاگات لە خۆت بێت، ماوەیەک خۆت بشارەوە.

دوای ئەوان منیش ڕۆیشتم شۆڕشی مەلا خدرم تێگەیاند، لەوێشەوە ڕۆیشتم بۆ لای ڕزگاری شێخ بەکر ئەویشم تێگەیاندو ئاگادارم کرد.

(من و ڕزگار هەمیشە پشت و پەنای یەکتر بووین و پەیوەندیمان بەیەکەوە هەبووە چ خەباتی ناوشارو چ برایەتی)، بە مامۆستا هیمەتم وت: عەلیش گیرا، مامۆستا هیمەت زۆری پێناخۆش بوو، وتی: حەمە ڕەئووف ئەوانە ترسیان نییە بۆ ئیعتراف، وتم: لەوانە مەترسە، ئێستا کێشە ئەوەیە، ئەو خۆفرۆشە بەدوامانەوەیە، مامۆستا وتی: ئەی تۆ چی دەکەیت؟ وتم:

- هیچم لەوان زیاتر نییە، وتی: بە قسەم بکە، بڕۆ سەرکردایەتی ئاگادار بکە، بزانن ئەوان چی ئەڵێن.

* * *

٣ ڕۆژ دوای گرتنی عەلی، بۆ بەیانییەکەی ڕۆیشتم بۆ گەراج و بە سەیارەی دووکان لە لای کەڵەوانان دابەزیم، لەوێوە بەرەو بناری پیرەمەگروون ڕۆیشتم بۆ گوندەکانی سۆتکەو پیسکەنی.

هەر گەیشتمە دەشتەکە، لە ڕەبایەیەکی نزیک کەڵەوانان بەر تەقەی (B.K.C) درام، بەڵام هەر ڕۆیشتم تا کەمێک دوور کەوتمەوە، زیاتر تەقەیان لێکردم دەنگی ویزەی گوللەکان بە پەنامدا دەڕۆیشت، ٢ کوڕی گەنجی شوان لەویادا گایەلیان دەلەوەڕاند، بانگیان کردم: کاکە ئەو تەقانە لە تۆ دەکەن ئەگەر نەگەڕێیتەوە دەتکوژن وەرەوە بۆ لای ئێمە لەولاوە بڕۆ، منیش گەڕامەوە بۆ لای ئەوان، وتیان: ئەو ڕەبایەیە بەڕاستی تەقە لە خەڵک ناکەن، ئەگەر مەبەستیان

بوایە دەیانکوشتی، بەڵام دەیانەوێت بگەڕێیتەوە، لەم چەمەی پێش ئێمەوە دەڕۆیتە ناو گوندی پیسکەنی، بە قسەی شوانەکانم کرد ڕۆیشتمەوە چەمەکەو لەوێوە ڕۆیشتم، ناو گوندەکە چۆڵبوو کەسی تیادا نەبوو، ئافرەتێک بە پەلە هات، وتی: کاکە خێرا برۆ، ئێستا بەر هاوەنمان دەدەن، لە ڕەبایەکانەوە بە دووربین چاودێری دەکەن، منیش لە مزگەوتەکە دەست و دەم و چاوم شت، بە ئافرەتەکەم، وت: دەمەوێت بڕۆم بۆ قزلەر.

وتی: هەر لەپشتی گوندەکەوە برۆ، بەو دۆڵەدا سەرکەوە دەگەیتە پشتی زێویێ، ملی ڕێگام گرت دۆڵەکە زۆر وشک و بێ ئاو و سەخت بوو، هەتا گەیشتمە سەر بەرزاییەک، دەیڕوانی بەسەر جادەی تاسلۆجەو کارگەی چیمەنتۆکەدا کە وێنەیەکی ئاوەدانی و پیشەسازی دەبەخشی بە ناوچەکە.

گوێم لە زەنگۆڵەی مەڕ بوو، سەیرمکرد ڕانە مەڕێک مۆڵیان داوە لەبن ئەشکەوتێکدا، ڕۆیشتم بۆ لایان ٢ شوان بوون، نانو چایەکم لای ئەوان خواردو ڕۆیشتم، سەیرمکرد کانی و ئاوێکی ڕوونو جوان لەسەر ئەو شاخە لە ناو ئەو بەردەلانەدا هەڵدەقولێت، کوڕێکی گەنج بە چەکێکی ژێرسەوە تەقە دەکات، لەسەر کانیەکە لامدا و خۆم فێنک کردەوە، کەوتمە قسەکردن لەگەڵیدا. وتی: چاوەڕێی گوندەکەمانین حکومەت بیڕوخێنێ ئیتر ئێمەش دادەبەزین، لەم ناوچەیە ژیانی تیادا نەماوە.

بەرەو قزلەر ڕۆیشتم، ئەو شاخانە کەش و هەوایەکی خۆش و دڵگیری هەبوو، من بەڕێگاوە هەر بیرم لە کوردستان دەکردەوە، بەو هەموو سروشتە جوانەوە خەریکە بەرەو وێرانبوون دەڕوات، بەسەر شاخەکاندا ڕۆیشتم چەند کاروانێکم پێگەیشت و چەند پێشمەرگەیەک پرسیارم لێکردن، وتیان: لێرەوە شۆڕ بەرەوە، بەو بەرەوە ماڵەکانی قزلەرە، وەکو ئەوان وتیان ڕۆیشتم تا گەیشتمە ناو ماڵەکانی قزلەر، لەوێش چەند خێزانێک بەسەردان هاتبوون لە شارەوە، خواردن و پێداویستیان هێنابوو بۆ پێشمەرگەو کەسوکاریان، لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەک نانم خواردو، هەڵگەڕام بە پشتی قزلەردا، بەودیوا شۆڕ بوومەوە بەرەو خوار بۆ

چۆخماخ، لەو دۆڵەدا پەیکەری پێشمەرگەیەک لەگەڵ منداڵێکدا دروست کرابوو، وێنەیەکی جوان و دڵڕفێنی دەبەخشی، لەناو گوندەکە دوکانێک خواردن و پسکیت و پێداویستی دانابوو چەند پێشمەرگەیەک دانیشتبوون، بەرزانی قالەی خەڵوز و زاهیر غەریب و شەماڵی بەهجەت کابان، دوای سڵاو و هەواڵپرسین پرسیاری فەرەیدون عەبدولقادرم کرد وتیان: ئێمە لەگەڵ کاک فەرەیدونین خۆشی لێرەیە، هەتا ئێوارە لەگەڵ بەرزان و ئەوان دانیشتم، من و بەرزان و زاهیر خوێندکاری یەک خوێندنگە بووین لە خوێندنگەی مەڵکەندی چەند ساڵ بەیەکەوە بووین زۆرمان یادگاری منالّی و خوێندنگە گێڕایەوە، ئنجا منو زاهیر رۆیشتین بۆ مقەرەکەی کاک فەرەیدون، زاهیر نانی ئێوارەی هێنا، نیسکێنە بوو، پاشان من رۆیشتم بۆ لای کاک فەرەیدون تا درەنگێک قسەمان کرد، وتی:

- ئێمە لە رێگای خۆمانەوە قسە لەگەڵ رژێم دەکەین، بزانین دیل بە دیل نایانگۆڕینەوە ئەگەر لەگەڵمان رێک بکەون هەریەکەیان ٥ ئەفسەریان دەدەینەوە، بەمەرجێک رازی ببن، بەڵام بڕوا ناکەم ئەوەندە رژێمەکە فاشییە، ئەفسەرو شتی بەخەیاڵدا نایەت ئەگەر هەمووشیان بکوژرێن.

وتم: ئاگاداربە من چەکێکی مامۆستا هیمەتم لایە بەنیاز نیم بیدەمەوە چونکە رۆژێک دێت پێویستمان پێی دەبێت لەناوشار، وتی: بۆ چەکێک ژیانی خۆت مەخەرە مەترسییەوە بیدەیتەوە باشترە، چونکە ئەمڕۆ هاوسەنگییەکە بەلای رژێمی بەعس و جاشەکاندایە، بەڵام من ملم نەداو وتم: نایدەمەوە.

کاک فەرەیدون ئاگای لە پەیوەندی مامۆستا هیمەت هەبوو، ئەیووت: من لە رێگایەکی ترەوە ئاگام لێیەتی، (خۆشم دەمزانی لە رێگای شەهید مەلا خالیدەوە بوو، چونکە پوورزاو خاڵۆزا بوون لەگەڵ مامۆستا هیمەت)، کاک فەرەیدون وتی: خۆت لە مامۆستا هیمەت دوور بخەرەوە، ئیتر پەیوەندیت با لەگەڵیدا نەمێنێت، ئەگەر وتیشی بڵێ من وازمهێناوە، وە هەرچی زانیاری گرنگی تریش هەبوو ئاگادارمان بکە.

بۆ رۆژی دوایی گەڕامەوە بۆ سلێمانی



ڕۆیشتم بۆ ماڵی عەلی هەواڵی ئەوە بەرم کە ڕۆیشتم بۆ لای فەرەیدون عەبدولقادر، ئاگادارم کردوون، بەڵام ماڵی عەلی تکای ئەوەیان لێکردم کە زوو بڕۆم دەیانوت چاودێریمان لەسەرە با تۆش نەگیرێیت.

بەڕاستی من ئەوکاتە هەر ماڵی عەلیو حاجیم دەزانی، ماڵی بەرهەم و تارقو کەمالم نەدەزانی تا سەردانیان بکەم، لەبەرئەوە هەر دەڕۆیشتم بۆ ماڵی ئەوان بۆ هەواڵ پرسینیان.

دوای ٢ هەفتە بەسەر گرتنی عەلیدا تێپەڕی، ڕۆیشتم بۆ ماڵیان، دایکی حاجیش لەوێبوو وتیان: باش بوو هاتی، ویستمان بێین بۆ ماڵی ئێوە، وتیان: کوڕە موستەشارێک لە هەیئەی کەرکوک ئازاد کراوەو هەواڵی بۆ هێناوین. تەلەفونی کردووە بۆ ماڵمان کە بڕۆین بۆ کەرکوک، ئێمەش ڕۆیشتین دۆزیمانەوەو قسەمان لەگەڵ کرد، عەلی پێی وتووە، حاجیو ئەوانیان بردووە بۆ بەغداد بۆ ئەمنی عامە، ئێستا منیش دەبەن بۆ لای ئەوان پێیان بڵێ:فەرەیدون ئێمەی بە گرت داوە.



٢٣ ڕۆژ بەسەر گرتنی عەلیدا تێپەڕی ٢٢ / ٩ / ١٩٨٧ ئاشتی هاوسەری عەلی منداڵی بوو، دایکێک بەو هەموو خەم و خەفەتەوە ژان گرتی و کچێک چاوی بە دنیا هەڵهانی بەبێ نازی باوک، منو هاوسەرەو دایکم ڕۆیشتین لە باتی خۆشیو شادی تەنها نزای ئەوەمان دەکرد بە باوکی شاد بێتەوە بەنازی دایکو باوک

گەورە بێت، دڵخۆشیمان دەدانەوە، چونکە ئەو منداڵە ئاگای لە مەینەتیەکانی ژیان نەبوو، بەبێ ناز گریانی دەستپێکرد، هەر چەندە لەوە پێش عەلی ئەیووت: ناوی دەنێم هەنسک با لەگەڵ هەزاری کوڕمدا ناوەکانیان ڕێکبکەون، بەڵام لەبەر ئەوەی هاتنە دنیای منداڵێکی بێتاوان تەنها فرمێسکی بۆ ڕژا، چونکە ئەو منداڵە هیچ خەندەیەکی خۆشی و شادی دایک و باوکی خۆی نەبینی، لەبەرئەوە ناومان نا فرمێسک.



هەفتەیەک بەسەر لە دایک بوونی فرمێسکدا تێپەڕی، شەوێک سیخوڕەکانی ڕژێم هاوڕێ دەستگیرکراوەکانی مەفرەزەی تۆڵە، عەلی و حاجی و کەمال و بەرهەم و تارق دەخەنە ناو سەیارەیەکی جامڕەشەوەو دەیانهێننەوە بۆ ماڵەکانیان، هەر کەسە ماڵی خۆیان دەستنیشان دەکات.

کە دەڕۆنە سەر ماڵی حاجی هەموویان دەگرن بە دایک و باوک و خوشک و براوە، بەڵام ڕەنگینی خوشکیان ئەوکاتە تەمەنی ٧ساڵان دەبێت و لە ماڵی مامی دەبێت لە شانەدەری، عومەری کوڕیشیان لە سەربانەوە هەڵدێت، باقی خێزانەکەیان دەگرن و دەڕۆنە سەر ماڵی عەلی، ئاشتی و هەردوو منداڵەکەی و وەستا جەباری برای عەلی و ماڵ و منداڵ هەموویان دەگرن و دەیانبەن، ئنجا ماڵی بەرهەم دایک و ئازادی برایان و خوشکێکی دەبەن، ماڵی کەمالیش دایک و باوکی دەگرن، ماڵی تارقیش تەنها دایکیان بەردەستدەکەوێت پیرەژنێکی بەساڵاچوو ئەویش دەگرن، دەیانبەن بۆ تەوارییەکەی سلێمانی، ئنجا دوای چەند ڕۆژێک ڕژێم تەوارییە کوردە خوێڕییەکانی ناردە سەر ماڵەکانیان، هەموو کەل و پەلی ناو ماڵیان بە تاڵان بردن، خانووەکانیان ڕووخاندن بە شۆفڵ، بەڵام ماڵی عەلیان نەڕووخان چونکە خانووی ماڵی باوکی بوو، ئیدی ماڵی حاجی و

ئەوانیان ڕووخاند، عەسرەکەی ڕۆیشتم بۆ ماڵی عەلی ئامینەی خوشکی بە تەنها لە ماڵ بوو، دەگریاو خۆی دەکوشت بۆ ئەو کارەساتە کەتێی کەوتبوون کە منی بینی دەستیکرد بە هاوار، هاوار، بۆ خاتری خوا کاک ڕەئووف بڕۆ تکات لێدەکەم، ئێستا تەوارییەکان ڕۆیشتن، چاودێریمان دەکەن با تۆش تووشی شتێک نەبیت، بە دڵێکی پڕەوە، وتم:

- نارۆم یانی ماڵی ئێوە بە جارێک ئاوا نغرۆ بوو بەدەست ڕژێمی بەعس و زۆڵە کوردەوە، ڕۆیشتمە سەرەوە بۆ ماڵەکەی عەلی سەیرمکرد هەرچی کەلوپەلی ناوماڵ هەبوو هەموویان تالان کردبوو، ئەو ماڵانەی تریش بەهەمان شێوە تەنها لەبەر ئەوەی کوڕیان شۆڕشگێڕ بوون بەخێزانی تیاچوون، هەموویان سەرگەردان بوون بە دەستی خۆفرۆشێک لە پێناوی مشتێ پارەدا.

* * *

دوای چەند ڕۆژێک وەستا جەبارو خێزانەکەی ئازادکران، چونکە هیچ پەیوەندییان نەبوو بەسەر ماڵی عەلییەوەو خێزانی جیا بوون، بەڵام ئاشتی و هەردوو منداڵەکەی عەلی و خێزانی ماڵی حاجی و ماڵی بەرهەم و کەمال و تارق لەسجندا مانەوە.

کاتێک ماڵی وەستا جەبار ئازاد کران، ڕۆیشتم بۆ لایان وەستا جەبار وتی: هەموومان سەرگەردان بووین، با تۆش وەکو ئێمەت لێنەیەت خۆت دەرمەخە تا زروفەکە کەمێک هێواش دەبێتەوە.

منیش لەبەر خاتری قسەی ئەو، بڕیارمدا خۆم دەرنەخەم، ڕۆیشتمەوە بۆ ماڵەوەو هاوسەرەکەم و منداڵەکانم و چەکەکەی مامۆستا هیمەت و کۆمەڵێک کتێب و هەندێ پێویستی و شتی ترم لەگەڵ خۆما برد، ڕۆیشتین بۆ عەربەت بۆ ماڵی خوشکم.

(ئەو کاتە ماڵی خوشکم لە کۆمەڵگای عەربەت بوون) وتم ئەگەر مەترسییەک

لەسەر منیش ببێت هەر لە عەربەتەوە ئەڕۆم بۆ قەراخ، ئەو ماوەیە لە ماڵی ئەوان دانیشتم هەر ٢ ڕۆژ جارێک خوشکەکەم یان کوڕەکەی یان زاواکەمانم دەناردن بۆ سلێمانی بۆ هەواڵپرسین.

دایکم پێی دەووتن کە هیچ هەواڵێکی ئەوتۆ نیە، دوای ٢ هەفتە منالّەکانم ناردەوە، خۆم هەر لە عەربەت مامەوە، ڕێکەوتی ٢٣ / ١٠ / ١٩٨٧ هاتمەوە بۆ ماڵەوە ڕۆیشتم بۆ ماڵی وەستا جەبار، وتیان: هیچ دەنگ و باسێک نییە، هەر ئەوەیە کە گیراون، ئنجا ڕۆیشتم بۆ ماڵی حاجی سادق مەوزوعەکەم تێگەیاند، وتم: سبەینێ دێمەوە بۆ دوکان بۆ ئیشی مریشکفرۆشی، حاجی سادق وتی: تۆ دوکانی خۆتە.

ماڵیان ئاوا بێت ئەوەندە هەڵوێستیان جوان بوو بەرانبەری من ئێستاش نەیانووت ئەم پیاوە تووشی ماڵوێرانیمان دەکات، دەتوانم بڵێم ئەگەر ماڵی حاجی سادق نەبوونایە من ئەوکاتە بەئاسانی نەدەژیام بۆ بژێوی ژیانی ڕۆژانەم.

## ٢٤ / ١٠ / ١٩٨٧
## ڕۆژی گولله بارانکردنی هاوڕێیان

- ٦١ -

بۆ ڕۆژی دوایی ڕۆیشتم بۆ مەیدانی مریشکفرۆشەکان بە نیازی ئیشکردن، سەعات ١٢ ی نیوەڕۆ هاوسەرەکەم هات بۆ دوکان بردمیە پەناوە بە گریانەوە، وتی: کاک نەوزادی زاوای عەلی هات بۆ ماڵمان وتی ڕەئووف ئاگادار بکە عەلی و حاجی و ئەوان گوللەبارانکران.

منیش ڕۆیشتم بە حاجی سادقم وت: کە مەسەلەکە تەواو خراپ بووە، برادەرەکانم ئێستا گوللەبارانکران، حاجی سادق بەڕاستی زۆری پێناخۆش بوو، وتی: کاکە تۆش ئاگات لە خۆت بێت.

منیش لەگەڵ هاوسەرم بە تەکسییەک ڕۆیشتین، ئەوم بردەوە بۆ ماڵەوەو خۆم ڕۆیشتم بۆ ماڵی عەلی، کاتێک ڕۆیشتم بۆ ماڵیان چی ببینم، ماڵ کشومات چەند خزم و کەسێکی خۆیان لە ژوورێکدا بەبێ دەنگ دانیشتبوون، چەند ژنێکی کەسوکاریان لە ژوورێکی تردا دەگرین کەس ناچێت بەلایانا، هەر کەسێکیش بهاتایە بە نهێنی دەهات، هەر لە ماڵە تەعزییە نەدەچوو، تەنها بەزەییم بە ئامینەی خوشکیدا دەهاتەوە دەم و چاوی خۆی هەموو ڕنیبوو، نەمدەزانی چی بکەم لەو ماڵەدا، سەرم نابوو بە دیواری ماڵەکەیانەوەو دەگریام، بیری ئەو ژیانە خۆشەی ڕۆژانی خوێندنگەم دەکردەوە لەگەڵ عەلی. دەمووت: ئەو ماڵە ئەوەیە کە هەموو ژیانیان پێکهاتبوو لە ڕێزو خۆشەویستی و گەورەو بچووکی، بەیەک هەناسە نغرۆ بوون، ماڵی حاجیش هەمان شێوە، وەرە ڕەنگینی منداڵ بێ دایک و باوک، عومەری مێردمنداڵی سەرگەردان بهێنە پێش چاو بێ ماڵ و بێ حاڵ و خانووی ڕووخاو.

ئنجا ماڵەکانی تر هەمووی سەرگەردان، هەر یەکێک لە ماڵێکدا خۆیان دەشاردەوە، هەر یەکە لە کونێکدا سەرگەردان، وەرە براکانیشیان گوللە باران بکرێت بەبەر چاوی جەماوەری شاری سلێمانییەوە، هێشتا تۆمەتی خراپە و عەمیل و پیاوی ئێرانیان بۆ دروستبکەن، لە خەباتو شۆڕش کردنەوە بکرێن بە هەڵگەڕاوەو دژی میللەت، بەڵام جگە لە خۆیان و خۆفرۆشان، کێ بڕوا بەم جەللادانە دەکات، (تیشکی ڕۆژ هەمیشە درەوشاوەیە راستی هەر دەردەکەوێت)

* * *




**شەهیدانی مەفرەزەی تۆڵە ڕۆژی ١٩٨٧/١٠/٢٤ گوللەبارانکران**

له پێشەوە باسمکرد، کاتێک تەقە کرا لە ڕەفیق عەبدوڵڵا دوای چەند ڕۆژێک فەرەیدون کە هەڵگەڕایەوە لە هاوڕێیانو دەستی تێکەڵکرد لەگەڵ ڕژێمی بەعسدا، ئەو هاوڕێ قارەمانانەی بە گرتندان، پاشان ماڵ و خێزانیان گیران و خانوویان ڕووخاندن، لە دائیرەی ئەمن کاتێک ئەم قارەمانانە دەبینن بەتایبەتی حاجی کە ٢ جار گیرا بوو، زۆربەی زۆری جەللادەکانی ئەمن دەیانناسی، هەڕەشەی مەرگییان لێ کردبوو، ئەگەر بۆ جاری سێیەم بگیرێت، بۆیە هەر پێنجیان بەبێ لێدان لە ژوورێکی ئینفرادی دایان دەنێن، تا ڕۆژی ٢٤ / ١٠ / ١٩٨٧ سەعات ١٠ ی سەر لەبەیانی دەیانهێننە دەرەوە، لە کوێدا تەقە لە عەبەی خۆفرۆش دەکرێت، لەو شوێنەدا هەر پێنجیان بە دارەوە دەبەستنەوەو شوێنەکەش خوار گەڕەکی ڕزگاری پشتی چێشتخانەی شکار، ئنجا ڕەفیق حیزبییەکانی سلێمانی، کارمەندانی دائیرەکان و خوێندکارانی چەند خوێندنگەیەک بەزۆر ڕاپێچیان دەکەن بۆ سەیرکردنی گوللەباران کردنیان، پێشەکی بە وتار خوێندنەوەی سەرانی ڕژێم دەستپێدەکەن.

کاتێک حاجی و ئەوان گوێیان لەو قسە ناحەقانە دەبێت، دەستدەکەن بە قسەکردن و سروود وتن و پیاهەڵدان بە شۆڕش و خەباتی گەلی کورددا.

پاشان سەرانی ڕژێم گوللەبارانیان دەکەن، خەڵکەکەش ناچار دەکەن کە چەپڵە لێبدەن بۆ کوشتنیان، پاش سەعاتێک تەرمەکانیان دەبەن بۆ پزیشکی دادوەری سلێمانیو بە دائیرەی شارەوانی ئەڵێن: بیانبەن بۆ گردی سەیوان بیان نێژن، بەڵام کەسوکاریان بەدوای هەموو پیلانەکانی ڕژێمەوە بوون.

بۆ شەوی دوایی دەڕۆن بۆ سەرقەبران و گۆڕەکانیان هەڵدەدەنەوە، تەرمەکانیان دەردەهێننەوەو دەیانشۆن و کفنیان دەکەن و بەڕێزەوە بەخاکیان دەسپێرنەوە.

* * *

هەفتەیەک دوای گوللەباران کردنی هاورێیان، ڕۆژی هەینی سەعات ۸ ی بەیانی ڕۆیشتم بۆ سەرچنار، کە لە دۆڵی هەنارانەوە بڕۆم بۆ چۆخماخ بۆ لای کاک فەرەیدون بۆ هەواڵی گوللەباران کردنی هاورێیان و پاشان ئێمە ئەو چەند کەسەی کە ماوین چی بکەین، منیش لەسەرچنارەوە ڕۆیشتم سەیرمکرد جێبێک دەڕۆی، نزیکەی ۵۰۰ م لەپێشمەوە دوور بوو، گەیشتمە کارگەی بەردی مەڕمەڕەکە، دەنگێک هات لە دوامەوە بانگی کردم، کاکە، کاکە ئاوڕم نەدایەوە؟ دەنگەکە زیادی کرد، کاکە لەگەڵ تۆمە، بۆ وەڵام نادەیتەوە! ئاوڕم دایەوە پیاوێکی باڵابەرزی لاوازبوو جلی کوردی و جامانە بەسەرەوە، وتی: کاکە تا ئێرە وەرە بزانم بۆ کوێ دەڕۆی، ڕۆیشتم بۆ لای، سڵاوم لێکردوو، وتی: بڕۆ ئەو ژوورە ئێستا دێم بۆ لات، با ۲ قسە بکەین، منیش ڕۆیشتم دانیشتم، ژوورەکە قەرەوێڵەیەکی خەوتنی تێدا بوو لەگەڵ هەندێک شت و مەکی حەرەسی.

کابرا کتێبی ڕۆمانی قەڵای دمدمی عەرەبی شەمۆی دانابوو، بەپێی دانانەکەی نیوەی خوێندبووەوە، لە دڵی خۆما وتم: ئەم پیاوە شتێک دەزانێت و ئیشێکی بە من هەیە و لە بەرژەوەندی منە وا بانگی کردم، پاش کەمێک هاتە ژوورەوەو بەخێرهاتنی کردم، وتی: یەک قسەت لەگەڵ دەکەم بەڵام ڕاستیم پێ بڵێ: بۆ کوێ دەڕۆی وا ملی ڕێگات گرتۆتە بەر؟ بانگیشت دەکەم وەڵام نادەیتەوە.

-ئەوەی ڕاستی بێت ئەڕۆم بۆ دۆڵە ڕووت بۆ سەردان.

-جا باشە دێهات ماوە تا بڕۆیت بۆ سەردان، کەواتە ڕاستت پێ نەوتم، دەزانی بۆچی بانگم کردیت، ئەو سەیارە جێبەی پێشتەوە بینی؟ ئەوانە مەفرەزەی تەوارییین، دەڕۆن بۆ کەمین بۆ دۆڵی هەناران، ئەوە عومەری برای بەکری فاتەیە هەر کەسێک بگرن چاک و خراپ دەیکەن بە دیاری دەستی خۆیان بۆ ئەم حکومەتە، یان لای خۆیان دایدەنێن تا پارەیەکی چەوری پێوەردەگرن، ئەگەر پارەی نەدا ئەوە تەسلیمی حکومەتی دەکەن، منیش بە غەدرم زانی کە تۆم بینی بانگت نەکەم، چونکە تۆ گەنجێکیت، دەبێت یان فیرار بیت یان بۆ لای پێشمەرگە دەڕۆی، بۆیە بانگم کردی ئەگەر زۆر زەروور نیت بگەڕێرەوە، یان

چاوەڕێ بکە تا ئەوان دەگەڕێنەوە، وتم:

- ئەوانە کەی دەگەڕێنەوە ؟

- ئەگەر خەڵکیان بەردەستبکەوێت، ئەوە دیاری خۆیان دەستکەوتووەو دەگەڕێنەوە، ئەگەر کەسیشیان دەستنەکەوێت درەنگ دەگەڕێنەوە.

- باشە خاڵە گیان، ئەوە چاکەو پیاوەتی و دڵسۆزی خۆتە بۆ ئەم میللەتە، بە قسەت دەکەم.

- بڕوا بکە ئەو ڕۆژەی من حەرەس بم، ئەوە پیشەمە لە پەنجەرەکەوە هەر سەیر دەکەم، ئەگەر کەسێک بێرەدا بڕوات پێی ئەڵێم با تووشی کێشە نەبێت. وتم:

- ئەی لەگەڵ کتێب خوێندنەوەدا چۆنی ؟

- وەڵڵاهی سەرە تەقێیەک دەکەم، کۆلکە خوێندەوارییەکم هەیە، بێتاقەتی کتێبی مناڵەکان دەهێنم، بۆ خۆم دەیخوێنمەوە لەم ژوورەدا.

- ئەم کتێبەت بەلاوە چۆنە؟ ئەوەی تێیگەیشتبیت.

- وەڵڵاهی هەر باسی قارەمانیەتی و کەساسی کوردو خیانەت و زۆرداری میللەتان دەکات بەسەر کوردەوە، ئێمە بەشمان هەر وا بووە.

زۆر سوپاسم کردو ماڵئاوایم لێکردوو گەڕامەوە، ئیتر نەڕۆیشتمەوە بۆ لای کاک فەرەیدون تا مانگی ٨ ی ١٩٨٨ لە قەندیل، کە لە دوایدا باسی دەکەم.

ئەم بیرەوەرییەم بۆیە باسکرد لەبەر ٢ شت ئەوەی من بینیم هەردووکیان هەر کورد بوون، ئەوەیان جاش و خۆفرۆش و خیانەتکار، بۆ پارە دەڕۆیشتنە سەر ڕێی خەڵک، ئەم پیاوەش لە پێناوی سەلامەتی هاوڵاتییەک کە دەست ئەو خۆفرۆشانە نەکەوێت، بەبێ بەرانبەر خەڵکی بانگ دەکردو دەیگێڕایەوە، هەزارەها کوردی ئاوا خۆ فرۆش هەبوون سەری کوردیان دەبڕی و دەیان فرۆشتەوە لە پێناوی پارەدا، هەزارە کوردیش هەبوون سەری خۆیان دادەنا لە پێناوی سەربەرزی میللەتەکەمان.

* * *

له دوای ئەو کارەساتە، منو ٣ هاوڕێی تر کە بەردەستی ڕژێمی بەعس نەکەوتین، پەیوەندیمان بەیەکەوە کردەوە، ئنجا من بۆ بژێوی ژیانی خۆم ڕۆیشتمەوە سەر ئیشەکەم وەکو باسمکرد دوکانەکەم لای خوارەوە، یەکەم دوکانی بەرانبەر بە قادرمەکانی پردەکەی سلێمانی بوو، بەتەنیشت جادەی ژێرپردەکەوە، نازانم مامۆستا هیمەت شوێنی منی چۆن دەزانی، ئایا پێیان وتبوو یان خۆم پێم وتبوو، ڕۆژێک هاتە خوارەوە بۆ ژێر پردەکە، بە سەیارەیەکی سۆپەری شین خۆی سەیارەکەی لێ دەخوڕیو ٤ کەسی تریشی لەگەڵ بوون ئەوانیشم دەناسی، بەشێوەیەک هات زۆر بەلامەوە ناخۆشبوو، دانەبەزیو لە سەیارەکەوە بانگی کردم، منیش ڕۆیشتم بۆ لای، وتی: حەمە ڕەئووف دەنگ و باست؟

- باشم، خەریکی ئیشی خۆمم.
- کاکە سەرێکم لێبدە لەماڵەوەو بەبێ چەکەکەش نەیەیت.
- چاوەڕێت دەکەم، ئەوەی کە پێم وتیت !

دوای ٢ ڕۆژ ڕۆیشتم بۆماڵیان، وتی: حەمە ڕەئووف کوا چەکەکە ؟

- تەسلیم بە پێشمەرگەم کرد.
- حەمە ڕەئووف تۆ هەمیشە لەناو پێشمەرگەدایت، پێیەکت لێرەو پێیەکت لەوێ، چۆن چەک دەبەیت و نایهێنیتەوە.
- مامۆستا تەسلیم بەمەڵبەندم کرد، ئیتر باسی مەکە، ئەگەر زۆر حەز دەکەیت وەریبگریتەوە جواب بنێرە با بۆت بگەڕێننەوە تۆش وەکو من پەیوەندیت هەیە؟
- حەمە ڕەئووف وا نابێت، من ئەو چەکەم دەوێتەوە.

- مامۆستا وتم: ئەو چەکە ڕۆیشت.

- ئەگەر لای خۆتە، پێم بڵێ، با بزانم؟!

- چۆنم پێ وتی هەر ئاوایە، حەزیش ناکەم نێوانمان تێکبچێت بۆ چەکێک، چونکە خۆت دەزانیت نێوانمان چۆنە؟

ئیتر نە ئەو قسەو نە من قسە، باسی چەکەکەی نەکردەوە، منیش لە دوای ئەوە، چەکەکەم بە ٨ مەخزەنەوە برد بۆماڵی کاکم، وتم ئەم چەکە چەکی مامۆستا هیمەتە بۆم هەڵبگرە هەتا ڕۆژی خۆی بزانین دنیا چی لێدێت، ڕۆژێک دێت پێویستمان پێی دەبێت.

کاکم بە مەسەلەی ئێمەی دەزانی، وتی: ئەگەر بە قسەم دەکەیت با نێوانی تۆ و مامۆستا هیمەت تێک نەچێت بۆ چەکێک بۆی بگەڕێنەرەوە.

- وتم: کاکە ئەو هەموو شتێک دەزانێت، نێوانی من و ئەو بەوە تێک ناچێت خەمی ئەوەت نەبێت.

- ئێستا چی لێبکەم؟

- تۆ خانووەکەت گەورەیە، بیشارەوە بۆم تا ڕۆژی خۆی.

چەکەکەم لە ماڵی کاکم دانا، ئیتر مامۆستا هیمەتم نەبینییەوە.

لەم بیرەوەرییەدا دەمەوێت کۆتایی بە باسی مامۆستا هیمەت بهێنم، هەفتەیەک بوو ڕاپەڕین کرا بوو، برادەرێک پێی وتم: مامۆستا هیمەت گیراوە، وا لە ئامادەیی پیشەسازی کوڕان، منیش ڕۆیشتم ئەوکاتە حاکم قادر سەرپەرشتی سجنەکانی دەکرد، هەواڵی مامۆستا هیمەتم لێپرسی، وتی: بەڵێ لای ئێمەیە، وتم: مامۆستا هیمەت پەیوەندی بەمنەوە هەبووە لە خوێندنگەوە هەتا موستەشاری، چاکەی بۆمان هەبووەو خراپەی نەبووە لەگەڵماندا، دەبێت یارمەتی بدەین، وتی: خەمت نەبێت، مادام تۆ قسەی لەسەر دەکەی، دوایی خۆم ئیشی باشی بۆ دەکەم، چونکە تۆ باوەڕ پێکراوی خۆمانیت بەخۆڕایی قسە ناکەیت لەسەری، دوای ئەوە مامۆستا هیمەت ئازاد کرا، بەڵام من نەمبینی تا کاتی کۆڕەوەکە.

لەچوارتا ڕۆژێک لەگەڵ چەند خزمێکم هاتینە خوارەوە بۆ قەلاچوالان، سەیر

دەکەم مامۆستا هیمەت سەیارەیەکی مارسیدسی پێیەو خێزانەکەیی‌و خوشکی خێزانەکەیی و ئاوەڵزاواکەی دانیشتوون، کە منی بینی هەستاو باوەشی پیاد کردم و ماچی کردم، منیش دەستم کرد بە پێکەنین، وتم: ئەمەش چەکەکەی تۆیە!

وتی: من زانیم لای خۆتەو قسەم نەکرد.

لە دوای ڕاپەڕین یەکجاری تر مامۆستام بینی بە سەیارە گەیاندمی، بۆ شوێنێک زۆرمان قسەکرد، هەتا ئەم دواییە لە ئەلمانیاوە هاتبوومەوە بۆ سلێمانی حەمە جەزای پورزایم بینی هەواڵی مامۆستام لێپرسی، وتی: ئێستا بە ماڵ و منداڵەوە لە دانیمارک دەژی، ژمارەی تەلەفۆنەکەیم وەرگرت کە ڕۆیشتمەوە بۆ ئەڵمانیا تەلەفۆنم بۆ کرد، وتم: دەنگم دەناسیت؟ وتی: ئەگەر من دەنگی حەمە ڕەئووف نەناسم کەس ناناسم، وتم: بە نیازم سەفەرێک بکەم بۆ دانیمارک ئەگەر بتوانم سەرت لێدەدەم، وتی:

- من ئاواتم ئەوەیە لە وڵاتێکی غەریبیدا یەکتر ببینینەوە، دوای ماوەیەک سەفەرم ڕێکخست ڕۆیشتم بۆ نەرویج، ماوەی ١٠ ڕۆژێک لەوێ بووم، پاشان هاتمەوە بۆ سوید ئنجا هاتمەوە بۆ دانیمارک، لەوێوە ڕۆیشتم بۆ شاری تێهتێست بۆ ماڵی مامۆستا هیمەت ٤ ڕۆژ لە ماڵیان بووم، ڕێزێکی زۆریان لێگرتم و کۆمەڵێک وێنەشمان بەیەکەوە گرت.





مامۆستا هیمەت کەریم فەتاح - ڕەئووف شێخ جەمیل- دانیمارک- شاری تێهتێست ساڵی ٢٠٠٢



مامۆستا هیمەت کەریم فەتاح - ڕەئووف شێخ جەمیل- دانیمارک- شاری تێهتێست ساڵی ٢٠٠٢

## ١ /١ / ١٩٨٨ یەکەم ڕۆژی ساڵی نوێ ڕۆژی بەخاکسپاردنی تەرمی شەهیدان کەماڵی موهەندیس‌و حەمە شوکر

- ٦٢ -

لە وڵاتانی جیهاندا سەری ساڵی نوێ، مانای خێرو خۆشی‌و پیرۆزکردنی ساڵێکی نوێ لە ژیانی داهاتوودا، لە وڵاتی ڕژێمی خوێناوی عێراقیشدا مژدەی خوێنی شەهیدان و لە سێدارە دانە بە کۆمەڵانی خەڵکی وڵات بە تایبەتی گەلی کورد.

لە ڕۆژی ٣١ / ١٢ / ١٩٨٧ ڕژێمی خوێناوی بەعس لە دوای ٢ ساڵ ئەشکەنجەو ئازاردان، ٢ قارەمانی کورد دەخاتە پای سێدارەو دەیانخنکێنێت، کەسوکاریان ئاگادار دەکات و تەرمەکانیان بە خەڵاتی سەری ساڵی نوێ دەنێرێنەوە بۆ شاری سلێمانی، شاری هەڵمەتو قوربانی.

ئەو ٢ شەهیدە لەیەکەم ڕۆژی ساڵی نوێدا مێژووی قارەمانێتی‌و ئازایەتی‌و کۆڵنەدانی خۆیان نەخشان، بە دەستی چەند خۆفرۆشێک پیلانیان بۆ دارێژراو لە دوای ٢ ساڵ نەبەردی‌و کۆڵنەدان، گیانی پاکیان بەخشی بە خاکی کوردستان.

جگە لەو هەموو بەڵگەو شتانەی پێیان گیرا، هێشتا ئەوان پێکەنینیان دەهات بە دوژمن.

گرنگی خەباتی کاک کەمال لەوەدا بوو، یەکێکی تر بوایە لە جیاتی ئەو دەستی دەگرت بە کڵاوەکەی سەری خۆیەوەو کاری ئەندازیاری خۆی دەکرد، بەڵام ئەو لە هەموو شتێک بوورابوو لە پێناوی ئازادی‌و سەرفرازی گەلەکەیدا.

هێشتا برینی شەهید حاجی‌و ئەوان سارێژ نەبوو بوو لە دڵی خەڵکی شاری

سلێمانیدا خەمی گەورەی شەهید کەمال و شەهید حەمە شوکریش هاتە سەری نەک هەر ئەوان، لەو ڕۆژەدا چەند شەهیدێکی تریش لە سێدارەدرانو گیانیان بەخشی بە خاکی کوردستان.

دوای ٢ مانگ و ٦ ڕۆژ بەسەر گوللەبارانکردنی هاوڕێیانی مەفرەزەی تۆڵەدا، کەمالی موهەندیس و حەمەشوکریش لەسێدارەدران، لەگەڵ حوکمی لە سێدارەدانی ئەوانا مەلا ناصر حوکمی هەتا هەتایی زیندانی بەسەردا دراو پاشان بە لێبوردنی گشتی ساڵی ١٩٨٨ کاتی وەستانی جەنگی ئێران و عێراق ئنجا ئازاد کرا، مەلا ناسر پورزای شەهید حەمەشوکرەو پەیوەندییان بەیەکەوە هەبوو.

❊ ❊ ❊

١٩٨٨/٣/١، ٦ مانگ تێپەڕی بەسەر شەهیدکرانی ئەو قارەمانانەدا، بەڵام کەسوکارو خێزانی ئەو شەهیدانە هەر گیرابوون لە تەوارییەکەی سلێمانی. کچی تازەبوی تەمەن ٧ مانگانی شەهید عەلی وەکو چۆلەکەیەکی ناو قەفەس لە زینداندا گەورە دەبێت بەو سەرمای زستانە بەبێ پێخەف و شیری گەرم بێلاوانەوەی بەسۆزی دایک و بێنازی باوک تەمەن دەباتەسەر، لەناو زیندانی بێ ئاگرو پەنجەرەی بێ شووشە، بۆیە منداڵێکی هەمیشە نەخۆش و لاوازی لێدەردەچێتو ژیانی بەرەو ڕووی مردن دەبێتەوە، هەتا دایکی فریای دەکەوێتو دەپارێتەوە لە ئەمنە بێویژدانەکان دەینێرن بۆ نەخۆشخانەی منداڵان و چەند تەوارییەکی عەرەبیش دەنێرن بۆ چاودێری کردنی ئاشتیو هەژاری ٢ ساڵان و فرمێسکی تەمەن ٧ مانگ.

ئەوکاتە نەخۆشخانەی منداڵان لە چوارباخ بوو، ژوورێکی تایبەت جیادەکەنەوە بۆ ئاشتی و مناڵەکان و تەوارییەکان، تەنانەت بۆ تەوالێتیش بەدوایەوەن. ئاشتی لە نەخۆشخانە ژنە کارگوزاری نەخۆشخانەکە دەناسێت پێی دەڵێت: بە کەسوکاری بڵێت کە ئاشتی لە نەخۆشخانەی منداڵانەو بە نهێنی بێن بۆ لای، با تەوارییەکان نەزانن، پاش ئەوەی ژنە کارگوزاری نەخۆشخانەکە هەواڵ دەبات بۆ کەس و کاری ماڵی ئاشتی، پاشان کە ئامینەی خوشکی شەهید عەلی دەڕوات بۆ لای ژنە کارگوزارەکە لە نەخۆشخانە، بە ئامینە دەڵێت بڕوات بۆ تەوالێتەکان قسەی لەگەڵدا بکات، ئنجا ئاشتی بەناوی تەوالێتەوە دەڕوات بۆ لای ئامینە. هەر فریای چەند قسەیەک دەکەون، پاشان ئامینە لەناو کەسوکاریدا بڵاوی دەکاتەوە کە ئاشتی لە نەخۆشخانەی منداڵانە، خاڵێکی شەهید عەلی هات بۆ لای من بۆ دوکان، پێی وتم:

- کە ئاشتی و کچەکەی لەنەخۆشخانەی منداڵانو چەند تەوارییەکی عەرەب حەرەسن بەلایەوە، بەڵکو شتێکی بۆ بکەن، منیش دەستم لە ئیش هەڵگرتوو،

ڕۆیشتم بۆ لای ڕزگاری ئاسنگەر پێموت: ئەویش ئامادەیی خۆی دەربڕی.

پاشان ڕۆیشتم بۆ لای ئامینە تێمگەیاند کە ئێمە ئامادەین ئاشتی بفرێنین، خۆشم ۲ - ۳ جار ڕۆیشتم بۆ ناو نەخۆشخانەکە بۆ چاودێری، پاشان ئامینە ڕۆیشتەوە بۆ نەخۆشخانە بۆ لای ئاشتی کەهاتەوە، وتی: کاک ڕەئووف بەو حاڵەی کە بینیومە، هەتا هاتووە بۆ تەوالێتەکان بۆ لام، قسەم لەگەڵ کرد وتی: بە کاک ڕەئووف و ئەوان بڵێ با خۆیان توشی کێشە نەکەن، چونکە ٤ تەواری عەرەب بەلامەوە حەرەسن، ۳ مانگی تر حوکمەکەم تەواو دەبێت ۱ / ٦ ئازاد دەکرێم، با ئەوانیش و من و منداڵەکانیش توشی کێشە نەبین.

ئێمەش پاشگەز بووینەوە لەو ئیشە.

* * *

۱/ ٦ /۱۹۸۸ ئاشتیو منداڵەکانیو دایکی شەهید تارق (پورە ئاسکە) ئازاد کران، واتە دوای ۹ مانگ بەندیو ناسۆرییەکانی ژیانی بەندینخانەو دوای شەهید کرانی هاوڕێیان ئنجا ئەمان ئازاد کران، کاتێک ئازادکران هەرچی پێداویستی خۆیان و کەسوکاری ماڵی حاجیو بەرهەم و کەمال هەیە لەگەڵ خۆیان هێنابویانە دەرەوە، کەسوکاری ئەوانیش سەردانی ئاشتی و دایکی تارق دەکەن بۆیان ڕوون دەبێتەوە کە کەسوکاری ئەمان لە مانگی ۱۲ دا جیاکراونەتەوەو بۆ شوێنێکی نادیار براون و هیچ دەنگو باسێکیان نامێنێت، بەڵام من بە وردی قسەم لەگەڵ ئاشتی خان کرد، هەموو شتێکم بۆ ڕوون بووەوەو هاتمەسەر ئەو بڕوایە کە ئەو کۆمەڵە خێزانە نەماون، لەوانەیە ئەو پرسیارە بکرێت بۆچی تەنها ئەو ۳ خێزانە لەناو بران، ئەم ۲ خێزانەی تر حوکمی ۹ مانگ دران، چونکە شەهیدان حاجی و بەرهەم و کەمال هەڵسان بە کوشتنی ڕەفیق عەبدوڵڵا لەبەر ئەوەی ئەوان لەلای پیاوانی ڕژێم تاوانێکی گەورەیان ئەنجام دابوو بۆیە ئەو ۳ شەهیدە خێزانەکانیشیان لەناو بران، شەهید عەلی و تارق لەو چالاکییەدا بەشدار نەبوون تەنها خۆیان شەهید کران، خێزانەکانیان لە دوای ۹ مانگ بەندی ئنجا ئازادکران.

کاتێک ئاشتی و منداڵەکانی هاتنە دەرەوە لە سجن خاوەنی یەک بەتانی و یەک کەوچکە چا نەبوون، هەمدیسان لەسفرەوە دەستپێکردەوە بەڵام ئەو هیوایەی هەبوو وەستا جەباری برای شەهید عەلی زۆر باش بوو بۆیان، لەگەڵ ماڵی باوکی ئاشتی خۆی، کە هەمیشە دەستیان پێوەی بوو، تەنانەت تا چەند ساڵی دوای ئەو کارەساتە هەر لەگەڵ ماڵی باوکی دەژیا، پاشان وەستا جەبار دەستیگرت بەسەر هەردوو منداڵەکەیدا، (هەژارو فرمێسک) هەتا گەورەی کردن و خوێندنی پێ تەواو کردن، بێنازی نەکردن، ئێستا هەردووکیان خێزانیان پێکهێناوەو خاوەنی منداڵی خۆیانن.

* * *

لە مانگی ٩ی ساڵی ١٩٨٩ لەسەر داواو کۆبوونەوەی خێزانی شەهیدان پاکیزەی خوشکی شەهید بەرهەم بە داواکارییەکەوە ڕۆیشت بۆ ئەمنی سلێمانی بۆ هەواڵی خێزانەکانیان، بەڵام داواکارییەکەی وەڵام نەدرایەوەو بێ هیوا بوون. ئەو خێزانانە هەر بە نیازی بینینەوەیان بوون هەموویان توشی نەخۆشی دەرونی ببوون، کە نەیاندەزانی چییان بەسەر هاتووە، ماون یان کراوون بەژێر گڵەوە. بە هیچ شێوەیەک دەنگو باسیان نەبوو، بەڵام ڕاستییەکەی لەتەوارییەکەی سلێمانی لە ٢٢/ ١٢ / ١٩٨٧ ئەو ٣ خێزانەیان جیا کردونەتەوەو کەس نەیزانی چییان لێکردن، هەتا ئێستاش تەرمەکانیان نادیارن، هیچ ڕێکخراو و لایەنێک بۆیان نەدۆزراونەتەوە، ئایا بەر ئەنفال، یان بەر گۆڕی بە کۆمەڵ کەوتن لە دەوروبەری سلێمانیدا، دوایی لەڕاپەڕینا لە بەڵگەنامەکانی ئەمنەکە کە دەستمان کەوت ئەو زانیاریانەی تیایە.

وەکو لە پێشەوە باسمکرد شەهید عەلی پێش ئەوەی دەستگیر بکرێت، شۆڕشی ئاسنگەری بە من ناساند، شۆڕشیش نەوزادی ئاسنگەری بە من ناساند، نەوزاد کەسێکی دڵسۆزو دڵپاک بوو، ئەویش پەیوەندی هەبوو بە شەهید حاجیو بەرهەم وئەوانەوە، بەر ئەو شاڵاوی گرتنە نەکەوت، بۆیە ئێمەش پەیوەندیمان بەیەکەوە کردەوە، من لەمسەریشەوە پەیوەندیم لەگەڵ ڕزگاری ئاسنگەر هەبوو هاوینی ١٩٨٨ لەگەڵ نەوزاد بڕیارماندا بڕۆین بۆ قەندیل پەیوەندی بکەینەوە بە مەکتەبی سیاسییەوە، ڕژێمی بەعس پێش وەستانی جەنگی عێراق- ئێران ئەنفالی دەستپێکرد، دێهاتەکانی خاپوور کردو خەڵکی سڤیلی ناوچەکانیشی ئەنفال کردن و شاری هەڵەبجەی کیمیاباران کرد، سەرکردایەتی یەکێتی لە سەرگەڵوو بەرگەڵوو بەجارێک وێرانکرا، هێزی پێشمەرگەی ناچار کرد بڕۆن بۆ ناوچە سەختەکان، ئەوکاتە هێزی پێشمەرگە لە چیای قەندیل بەرەنگاری ڕژێمیان دەکرد.

١٦/ ٨/ ١٩٨٨ من و نەوزاد ڕۆیشتین بەرەو شارۆچکەی سەنگەسەر، دەوری سەعات ٩ گەیشتین، نەماندەزانی چۆن بڕۆین بۆ قەندیل، لەناو سەنگەسەردا خەڵکەکەی وا وروژابوو هەر مەپرسە، خەڵکی ئەو دێهاتانە زۆربەی داگیرابوون، یاخود بڵێین ژیانیان لێتێکچوو بوو، ناچار هەموویان ڕوویانکردبووە شارەکان، دەستی ناپاکی ڕژێم وا کەوتبووە ناو خەڵکەوە کەس باوەڕی بە کەس نەدەکرد، وتم:

- نەوزاد من بەهۆی خوێندنم لە خوێندنگەی کشتوکاڵی کاتی خۆی گەنجی زۆری ئەم ناوچەیەمان لەگەڵدا بوون، بزانم کەس نابینم، کەمێک سووڕاینەوە هاوڕێیەکی خوێندکارم بینییەوە ناوی فاخر بوو، هات بەرەو ڕووم، فاخر لە خوێندنگە بە جموجۆڵی منی دەزانی بۆیە هەر لەوێدا وتی:

- خێره هاتووی بۆ ئەم ناوه ئەڵێی ئیشی ئەولات هەیه، منیش نەمدەزانی چی بڵێم دوای کەمێک قسەکردن، باسەکەم کردەوه بەڵام بەشێوەیەکی تر، وتم:

- پێویستیمان بە سەیارەیەک هەیه بۆ قەندیل، ئەم برادەرەم کەمێک کێشەی هەیه دەیەوێت بڕوات بۆ دیوی ئێران، ئەگەر هاوکاریمان بکەیت زۆر سوپاست دەکەین.

فاخر وتی: وەرن لەم کەبابخانەیه دابنیشن تاکو نان دەخۆن، بزانم سەیارەیەکتان بۆ پەیدا بکەم، چونکه زۆر زەحمەت دەستدەکەوێت، ئێستا قەندیل ناوچەیەکی قاچاغه لای حکومەت، فاخر ڕۆیشت، پاش ۲۰ دەقیقه هاتەوه وتی: بڕوا بکەن سەیاره دەستناکەوێت، پیاویش ناوێرێت بە هەموو کەس بڵێت.

فاخر چاکەی لەگەڵدا کردین، بەڵام هەر ئەوەندەی دەسەڵات هەبوو.

نەوزاد وتی: من خزمێکم هەیه لە دائیرەی نفوس بابڕۆین بۆ لای ئەو بەهۆی دائیرەوه خەڵک دەناسێت، ڕۆیشتین بۆ لای ئەو برادەره بە گەرمی پێشوازی لێکردین، ئنجا ئەو ڕۆیشت بۆ هەواڵی سەیاره، پاش کەمێک هاتەوەو سەیارەیەکی بەرازیلی هێناو بەڕێیکردین، سایەقەکەو یەکێکی تر لە پێشەوه، ئێمەش لە دواوه دانیشتین بە سەعاتێک زیاتر گەیشتینە شوێنێک وەکو مەرز وابوو، کڕین‌و فرۆشتنی خۆراک و ئارد و شتیان لێدەکرد، قاچاخچی ئێرانی دەهاتن دەیانکڕی، خەڵکی ئێران و ئەم دیوو و ئەو دیوو و جاش هەمووی تێکەڵ ببوون، وتیان دەبێ ئەو ڕێگایه بگرن تا دەگەنه سووره دێ.

منو نەوزاد ملی ڕێگامان گرتەبەر، ۳ سەعاتێک ڕۆیشتین کەسمان نەبینی، ئەو شاخه سەختانه هەوای فێنک، بەو مانگی هەشته هەستت بە گەرما نەدەکرد، هەتا گەیشتین بە چڕی دارستان و باخی چنار و ئاوی زۆر بە هاژه دەهاته خوارەوه، پاشان گەیشتین بە ئاوەدانی، بەسەر پردێکی داردا ڕۆیشتین گوێمان لە دەنگی ئافرەتێک بوو لەناو هیلاکی و شەکەتی خۆی هەر هاوار هاواری بوو، سەیرمانکرد چوار منداڵی بچوکی خستۆته ناو شەڵتەی ئێسترێکەوەو پیاوێکی قاچاخچیی ئێرانی لەگەڵدایەو بەرەو ئەو مەرزه دەڕوات کە ئێمەی لێهاتبووین،

منداڵەکان هەر دەگریان، ژنەکە پێڵاوی بە پێوە نەمابوو. پرسیارمان لێکرد وتی: خەڵکی هەڵەبجەم دەمەوێت بگەڕێمەوە بۆ سلێمانی، بەڵام دوایی بۆمان ڕوون بوەوە خێزانی پێشمەرگە بوون بەرەو شار دەڕۆیشتنەوە.

پاشان گەیشتین بە کۆمەڵێک پێشمەرگە ڕۆیشتین بۆ لایان، وتیان: ئێرە بنکەی باڵانبۆیە کارتان چییە؟ هیچمان پێنەووتن، وتمان: لەبەری پیرەمەگروونەوە هاتووین، ئەندامی م. س کێی لێیە لەمناوە، وتیان: کاک قادری حاجی عەلی، وتمان: دەڕۆین بۆ لای ئەو.

نامەیەکیان نووسیو پێشمەرگەیەکیان بەدواخستین، لەسەروو گوندی سورەدێ کۆمەڵێک پێشمەرگە چەند خێمەیەکیان هەڵدا بوو، ڕۆیشتین بۆ خێمەیەک، کاک قادر لەناو خێمەکەدا دانیشتبوو، هاتە دەرەوە یەکترمان بینی و بەیەکەوە دانیشتین، ئنجا پێشمەرگەکە نامەکەی دا بە کاک قادرو ڕۆیشت، کەوتینە قسەو هەواڵپرسین و دەنگو باسی شار، سەعات زیاتر دانیشتین تا پشوویەکماندا، وتمان: کاک قادر ئێمە پێویستمان بە کاک فەرەیدون هەیە، قسەی لەگەڵدا بکەین، وتی: کاک فەرەیدون لە دۆڵی باڵایانە، ئێستا بڕۆن بەڵکو چاوتان پێی بکەوێتو قسەی لەگەڵ بکەن، چونکە وەزعیان باش نییەو لەگەڵ کاک نەوشیروان موئامەرەیان لەسەرە تاکو نەڕۆیشتوون، دوایی بە هیلاک دەڕۆن تا دەیدۆزنەوە، لای کاک قادر ڕۆیشتین، بۆ ئێوارەکەی گەیشتینە گوندەکانی قرناقاو پشتئاشان، خەریکبوو تاریک دادەهات و بارانیش دەباری، ناو گوندەکەش چۆڵبوو، کەسێکی وای تێدا نەبوو، داڵدەمان بدات.

کۆمەڵێک پێشمەرگە هاتنە ناو گوندەکە، هەرچی پێداویستی هەبوو پێیان بوو مەنجەڵ و قاپ و قاچاغ و برنج و ڕۆن و بامێ، دەتووت بۆ سەیران هاتوون، پرسیارمان کرد؟ وتیان: تیپی ٣٧ ی شاربازێڕین، بە نەوزادم، وت: ئەم تیپە خەڵکیان لێدەناسم، سەیرمکرد فەرهادە ڕەشیان لەگەڵە، پاش هەواڵپرسین بەیەکەوە دانیشتین، بەو ئێوارە درەنگە دەستیانکرد بە چێشتلێنان، نازانم چۆن ئەوەندە خێرا ٢ مەنجەڵ برنجو شلەیان پێگەیاند، فەرهادیش بەشی ئێمەی هێناو

بەیەکەوە نانمان خوارد، بۆ شەوەکەی بارانێکی زۆر باری هیچ شوێنێک نەبوو خۆمانی تێدا بگرین، ناچار لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەک ڕۆیشتینە ژوورێکەوە. ئەوەندە هیلاک بووین هەر لەسەر زەوییەکە خەومان لێکەوت تا بەیانی، ڕۆژی دوایی پێشمەرگەکان ڕۆیشتنو من و نەوزادیش هاتینە ناو گوندەکە ویستمان برۆین، ئاکۆی حەمە شوکر هات بەرەو ڕووم تاقم تفەنگی پێبوو، ڕیشێکی زۆری هەبوو، باوەشمانکرد بەیەکدا ئەوەندەمان ماچی یەکتر کرد لە ژمارە نەدەهات.

ئاکۆی حەمە شکور لە پێشەوە باسمکردووە، وتم: ئاواتم ئەوە بوو یەکتر ببینینەوە وا لێرەدا یەکترمان بینییەوە، وتی: بۆ کوێ دەڕۆن؟!

وتمان: بۆ دۆڵی باڵایان، وتی: منیش ئەڕۆمەوە بۆ ئەوێ، ئاکۆ قیناعی پێبوو بۆ کیمیاوی ئەیووت ترسی تەیارەمان هەیە کیمیاوی دەڕێژێ.

لە بەیانی تا ئێوارە بەڕێوە بووین ئنجا گەیشتینە دۆڵی باڵایان، ڕۆیشتینە ڕەشماڵێک پیاوێکی کامڵی لێدانیشتبوو، بەخێرهاتنی کردین، پاشان بانگی کرد مەعسومە وەرە، چەن جارێک دووبارەی کردەوە ئەرێ لۆ نایەی مەعسومە؟ چاو جغارە بێنە، منیش لەدڵی خۆما وتم ئاخۆ چ پیرەژنێک بێت دەستی گیراوەو نایە، کاتێک سەرم هەڵبڕی کچێک هات نازانم چۆن باسی بکەم، باڵا بەرزێکی جوان کراسی کوردی لەبەرداو شەرواڵ لەپێدا، ئەوەندە جوان بوو سەرسام بووم پێی، بەخێرهاتنی کردین و چاو جگەرەی هێنا، هەر بەوە سەرسام بووم لەبناری قەندیل و ئەو شاخە سەختەدا ئەو کچە لەناو ئەو ڕەشماڵەدا چیدەکرد لەگەڵ دایک و باوکیدا، (پەخشانەکەی هێمنی شاعیر هەواری خاڵێم بیرکەوتەوە بەدەنگە بەسۆزەکەی مامڵێی خۆشخوان)، کاتێک کەهەستاین وتم ئاکۆ ئەوە چیبوو سێو بوو یا گڵۆپ؟! ئاکۆ دەستیکرد بەپێکەنین، وتی من شوێنی ئاوات دەبەم بۆ سۆمای چاوی تۆ، ڕۆیشتینە گوندی زەنگەڵی کۆمەڵێک پێشمەرگەی لێبوو، پێشمەرگەیەک عەینەکی لە چاودا بوو، جلی پاکو خاوێن، منیش بە گاڵتەوە وتم: لێرە دیسکۆش هەیە؟ دەستیانکرد بە پێکەنین.

پێشمەرگەکە (لوقمان چاوڕەش بوو)، بۆ شەوەکەی هەموومان لەماڵێکدا بووین، جەمال حاجی مامەندیش لەوێ بوو، کەوەختی خۆی لە خوێندنگەی ناوەندی بەیەکەوە بووین، بە قسەی خۆش تا درەنگێ ئەو شەوەمان بەڕێکرد، بۆ ڕۆژی دوایی ئێمە هەواڵی کاک فەرەیدونمان زانی وتیان ڕۆیشتووە بۆ دوندی قەندیل، بۆ بەیانی لەگەڵ ئاکۆ زۆر قسەم کرد، وتی:

- هێزی پێشمەرگە بە نیازن بڕۆن بۆ دیوی ئێران، من دێمەوە بۆ ناو شار و پەیوەندی دەکەمەوە بە ئێوەوە، ئنجا ١٠٠ دیناری دامێ، وتی: بیگەیەنە بە دەستی ئاسۆی برام ئەویش وەک دیارییەکی من بیکات بەجل بۆ باوکم، لای ئاکۆمان جێهێشت، لەولاوە بەرزانی قالەی خەڵوز وەستابوو، بەرزان کە منی بینی هات بۆ لام یەکترمان ماچ کرد، وتی: هەر ئێرە مابوو بیدۆزیتەوە، بە خوا ئەو سەرە سەری خۆت نییە کردمان بەپێکەنین، وتم: بەنیازین بڕۆین بۆ لای کاک فەرەیدون، وتی: ٢ ئێستر بگرن و لەگەڵ من وەرن.

' بەرزان خۆی لەگەڵ کاک فەرەیدون بوو، لە ماڵە دەوارنشینەکان کەرێک و ئێسترێکمان بەکرێ گرت یەکی بە ٢٥ دینار، من سواری ئێسترەکە بووم و نەوزادیش سواری کەرەکە، شاخەکە هەمووی بەفر بوو ئنجا بەفرەکەش توابووەوە و ببوو بە قوڕاوێک نەبێتەوە، کەرەکە لەناو زۆری بەفرو قوڕەکە نەدەڕۆیشت، نەوزاد هەر دەیبۆڵاند، کاروانەکە ٨ وڵاخ سوار بووین، لەڕێگا پێشمەرگەیەکمان لەگەڵ بوو، چەکی پێنەبوو، دەیووت: من بریندارم ئازارم هەیەو سەرمامە، بەڵکو پاڵتۆیەکم بۆ پەیدا بکەن، (پێشمەرگەکە مەلا فەرمان بوو لە شارەوە بەنهێنی گەڕابوەوە بۆ قەندیل) ئەویش دەیویست چاوی بە کاک نەوشیروان بکەوێت.

مانگی ٨ قەندیل ئەوەندە سارد بوو خەریکبوو لە سەرمانا ڕەق ببینەوە، ئێمە هەر بەکراس و چۆغەوە بووین، تا گەیشتینە بەرزاییەکانی قەندیل، لەوێ بوو بە تەمو تۆمان، کەس کەسی نەدەبینی، گەیشتینە خێمەیەک کە تازە خەریکبوون هەڵیان دەدا، پێشمەرگەیەکی زۆر لەو ناوە بوون خەریکی دامەزراندنی جیهازو

هەڵدانی خێمەو جێگیرکردنی خۆیان بوون، سەیرمکرد ئازادەڕەش لەوێیە، کە منی بینی هات بۆ لام، دوای هەواڵپرسین وتی: خێر؟ وتم: خۆت نازانی بۆچی هاتووین پێکەنی، وتی: ئەم ناوەشت دۆزییەوە؟

کە سەرم بردە ناو خێمەکەوە سەیرمکرد کاک نەوشیروان دوو بەتانی گەورەی داوە بە خۆیداو خەوتووە، ئەوەندە سارد بوو پێشمەرگەکان نەیاندەتوانی تەلی جیهازەکە دابنێن، پاشان پێشمەرگەیەک هات، وتی: کێتان دەوێت؟ ئەگەر کاک نەوشیروانتان دەوێت با هەڵیبسێنم قسەی لەگەڵ بکەن، وتمان: کاک فەرەیدون. وتی: کاک فەرەیدون ئێستا ڕۆیشتەوە بۆ سوورەدێ، (پێشمەرگەکەش سمکۆی لای نەوشیروان) بوو، ئنجا من و نەوزاد و بەرزان و کامیلی برای کەمال سابیری هونەرمەندو فایەق ناوێک، ئەو ٥ کەسە ئەوێمان جێهێشت و ڕزگارمان بوو لە بەفری قەندیل، بەرەو خوار بە ناو ماڵە دەوار نیشینەکانا شۆڕبووینەوە بۆ سوورەدێ، ئەوەندە سروشتی ئەو ناوە جوان بوو وێنەی نەبوو، ئەو ماڵە دەوار نشینانە ئەو هەموو ئەسپ و مەڕو ماڵاتە ئەو کچە جوانانە لەناو بێریدا ئەو سروشتەی لەویادا بینیم لە هیچ شوێنێک نەمبینیوە، تا گەیشتینە گوندی سوورە دێ تەواو تاریکی کرد، خۆمانکرد بە ناو بارەگاکانی حیزبی دیموکراتی ئێراندا. چەکیان لێڕاکێشاین کێن؟ پێشمەرگەی یەکێتین، ڕۆیشتینە نزیکیانەوە خۆمان ناساند، ئنجا نانی ئێوارەیان بۆ هێناین، گۆشتی قوتویان سوور کردبوەوە لەگەڵ شوتیدا، دوای نانخواردن ڕۆیشتین بۆ گوندی سوورەدێ بۆ ماڵی مەلای گوندەکە لەوێ خەوتین، بۆ بەیانییەکەی نانمان خواردو ڕۆیشتینەوە بۆ پشتی سورەدێ بۆ لای کاک قادر.

کۆمەڵێک پێشمەرگەی لێبوو، هەمووی خەڵکی سلێمانی بوون، ڕۆیشتینەوە بۆ خێمەکە کاک قادرو ئازاد هەورامی و فەرەیدون و بەهادین نوری حیزبی شیوعی و شێخ دارای حەفید ئەو چەند کەسە لەوێ بوون، دوای پشوودان، من و نەوزادو کاک فەرەیدونو ئازاد هەورامی ڕۆیشتینە دەرەوەی خێمەکە، دەستمانکرد بە قسەکردن دەربارەی وەزعی ناوشارو دەستی خیانەتی ڕژێم

لەناو خەڵکدا، پاشان هاتینە سەر شەهیدکرانی هاوڕێیان کەمالی موهەندیس و حەمەشوکرو هاوڕێیانی مەفرەزەی تۆڵەو کەسوکاریان، کە چیبیان بەسەر هاتووە، قسەمان زۆر کرد کە لێرەدا هەمووی ناگێڕدرێتەوە، کاک فەرەیدون وتی: ئێمەش ئەوەندەمان نەماوە چاوەڕێین سەرما بێت، نیازمان وایە بڕۆین بەو دیوودا و قەندیلیش چۆڵ بکەین، خۆتان دەزانن کەس بەم شێوەیە ناژی، ئەگەر بە قسەی من دەکەن بەشوێنی خۆتاندا بگەڕێنەوەو ئیش مەکەن دانیشن باشترە، چونکە وەزعی شۆڕشەکە ئەوەیە کە دەیبینن، لەگەڵ چەند قسەیەکی تردا کە پێویست ناکات بینووسم، پاشان کاک ئازاد هەورامی وتی: ماڵت ئاوا بێت کاک فەرەیدون، هەر بەجارێک هیچت نەهێشتەوە، ئەڵێی کوردستان کاول بوو، کوردت هەر نەهێشت، کاکە یەکجار وا نییە ! تۆ دەزانی ئەمانە لەکوێوە هاتوون؟ چۆن دەبێت بەو شێوەیە بە دەستی بەتاڵ بڕۆنەوە، ئێمە بە نیازین کۆڵنەدەین و شەڕی پارتیزانی بکەینەوە چ لە ناوچە چۆڵکراوەکان و چ لەناوشارەکاندا، خۆت ئەزانی پێویستمان بەم هاوڕێیانە دەبێت لەناوشاردا، پاشان فەرەیدون قسەکانی گۆڕیی‌و وتی: ئێوە دەتوانن لەناوشارەوە ئازووقەو پێداویستی پێشمەرگە ببەن بۆ دێهاتە ڕووخاوەکانی دەووروبەری شارو بیگەیەننە دەستی پیشمەرگە پارتیزانەکان، وتمان: هەموو شتێک دەتوانین، چەند ساڵە بۆ توانیومانە ئێستا بۆ ناتوانین، بە منی وت : ناونیشانی خۆتم بدەرێ، منیش ناونیشانی خۆمم دایە، وتی: کەسی خۆمان دەنێرین بۆ لات.

پاشان داوای یارمەتی شۆڕشمان کرد، بۆ خێزانەکانی ئەو ٥ شەهیدە، کاک فەرەیدون ٥٠٠ دیناری داینێ، وتی: وەزعمان زۆر خراپە بۆ پارە، یەک فەردە ئارد بە ١٠ دینارە تا ئێرە ١١٠ دینار دەکەوێت لەسەرمان، بەس بە ٢٥ دینار لەو گوندانە بۆمان دەکەن بە نان ، کرێی وڵاخ بە ٥٠ دینار دەیهێنن، هەندێک باسی باری ئابووری پێشمەرگەی کرد، پاشان ڕۆیشتینەوە بۆ ناو خێمەکە، وتیان: دەعوەتی ئێمەن، دەبێت لەگەڵمان نان بخۆن.

سفرە ڕاخرا یەک سینی گەورە هات، پڕ لە برنجو یەک گیسکی کوڵاو بە

ساغی لەسەر برنجەکە دانرابوو لەگەڵ شلەی بامێ، من سەرم لەوە سوورِدەما لەو شوێنەو لەناو ئەو داروبـەردەدا ئەو پێشمەرگانە ئەو خواردنەیان چۆن دروستکردبوو.

بۆ نیوەرۆکەی بە نیازی گەڕانەوە بووین، داوای وەرەقەیەکمان کرد بۆ نەوزاد کە بڕوات بۆ ئێران، چونکە ئیشێکی تایبەتی هەبوو. ئەوانیش نامەیەکیان بۆ نوسی بۆ هەڵۆی ئەحمەد کوردە لە گوندی گوێزێ.

پاشان بەرەو سوورە دێ گەڕاینەوە، شەوەکەی لەوێ ماینەوە.

بۆ بەیانییەکەی نەوزاد ڕۆیشت بەرەو ئێران و منیش بۆ سلێمانی، بە هەمان ڕێگای جاری پێشوودا گەڕامەوە، لە ڕێگا دەنگی تەقەی دۆشکە دەهات، گەیشتم بە کۆمەڵێک کاروانچی سواری ئێسترێک بووم، هەتا دەڕۆیشتین تەقەکان نزیک دەبوەوە، وتیان نابێت بگەڕێینەوە، دەبێت هەر بڕۆین، تا گەیشتینە نزیکەوە بۆ ناو مەرزەکە، ئنجا وردە، وردە تەقە نەما، زۆربەی خەڵکەکە جاش بوون. هەر دابەزیم خۆم کرد بە ناو سەیارەیەکی لاند کرۆزەردا، دەهاتەوە بۆ ڕانیە. لەوێشەوە هاتمەوە بۆ سلێمانی، کاتێک گەشتمەوە بۆ ماڵەوە ٥ ڕۆژم پێچوو بوو.

لەدوای ئەوە هەر چاوەڕوانی فەرەیدون بووین بۆ پەیوەندیکردنەوە، کەسێک بنێرێ، چاوەڕوانییەکەی ئێمەش بوو بەچاوەڕوانیەکەی گۆدۆو هەر نەهات.

* * *

دوای چەند ڕۆژێک ڕۆیشتم بۆ ماڵی برادەرێک، کەسێک هات بۆ ماڵیان. دەستیکرد بە قسەکردن، وتی: جاشی خەفیفەم تازە لە قەندیل گەڕاومەتەوە. وتی: جاش ئەو ناوچانەی هەموو گرت.

وتم: کوێ و کوێ ؟ وتی: ئێمە تا گوندی سورەدێ ڕۆیشتین، فەوجەکانی تریش لە ناوچەکانی ترەوە تا دۆڵی بالآیان، منیش قسەم لێدەرهێناو وتم: سورەدێ دوورە؟

وتی: بەڵێ شەڕێکی سەخت کرا لەو ناوچانە، تەنانەت لە قەندیل ئازاد

مەورامیش شەهیدکرا، بەڕاستتە؟ دڵنیایت، بەڵێ دڵنیام.

دوایی لە چەند لایەکی ترەوە بیستم کە ١٠ ڕۆژ دوای هاتنەوەی ئێمە کاک ئازادیش شەهید کرا، ئەوەندەی خەفەتم بۆ کاک ئازاد خوارد مەگەر ئەوەندە خەفەتم بۆ شەهید کەمالی موهەندیس خواردبێت، شەهید ئازاد هەورامی لە سورداش ساڵی ١٩٨٤ ناسیم کەسێکی زۆر دڵسۆز بوو، ئەو جارەش لە قەندیل چەند سەعاتێک بەیەکەوە بووین، بەڕاستی نموونەی ڕەوشت بەرزی و خۆڕاگریو هەڵوێستی مەردانە بوو، ئەوەندە پێشمەرگەو لێپرسراوێکی پاک و بەویژدان بوو نموونەی نابێتەوە، ئێستاش ئەڵێم ٢ کەسم بینیوە لەو شۆڕشەدا یەک هەڵوێست بوون، شەهیدان کەمالی موهەندیس و ئازاد هەورامی، هەزار سڵاو لە یادیان و لە گۆڕیان.



ئاکۆی حەمەشوکر    لوقمان چاوڕەش

جەنگی عێراق و ئێران وەستا، ئەوەندەی تر نەهامەتی هێنا بەسەر میللەتەکەمانا.
لە ٩/٢٠ لە ماڵەوە بووم ئێوارە باوکم هاتەوە هێشتا خۆی نەگۆڕی بوو.
وتی: ڕەئووف گوێ بگرە دەنگ و باس هەیە ئەڵێن تەسریحات هاتووە بەهۆی وەستانی جەنگی عێراقەوە خەڵک خۆی تەسلیم دەکاتەوە، تۆش وەکو ئەو خەڵکە بڕۆ خۆت تەسلیم بکەرەوە لە مەعەسکەر سەلام، بەڵکو تەسرح ببیت و ڕزگارت بێت لەم بەڵای فیرارییە، زۆری لەگەڵ وتم: منیش بە دەنگی بەرز وتم نایکەم، ئیتر باوکم دەنگی نەکرد، هەتا کاتی خەوتنیش قسەی لەگەڵ نەکردم.
بۆ بەیانی من تووشی سکئێشە بووم، ڕۆیشتمە خوارەوە بۆ لای باوکم و دایکم.
وتم: لە شەوێوە سکم ئێشێت، دایکیشم وتی: وەڵڵا باوکیشت دەڵێت گیانم زۆر دێشێت و هەڵنەستاوە، وتم: چۆن؟ باوکم تا ئێستا هەڵنەستاوە، دایکم وتی: وەڵڵا بێتاقەتە، کە سەیرمکرد ڕەنگی ڕەش هەڵگەڕاوە، ڕۆیشتم بۆ ماڵێکی دراوسێمان تەلەفۆنم کرد بۆ ماڵی کاکم، پاش کەمێک کاکم بە سەیارەوە هات بۆ ماڵمان، هەردووکمانی برد بۆ نەخۆشخانە کە فەحسیان بۆ کردین، یەک حەبیان دا بە من، بەڵام باوکمیان هێشتەوە، منیش لەلای مامەوە، بۆ ئێوارە داوای خوێنیان لێکردین، وتیان تەندروستی باش نییە، بۆ شەوەکەی گواستیانەوە بۆ بوژاندنەوەی دڵ لە نەخۆشخانەی جامعەکە، چەند ڕۆژێکیان هێشتەوە، کەمێک باش بوو قسەو شتی دەکرد. کورد بەرقەراری ٧٣٦ — ٧٣٧ کەوت، بێ ئەوەی عەسکەری بکا تەسریح ببێ، منیش ڕۆیشتم خۆم تەسلیمکرد لە مەعەسکەر سەلام بۆ تەسریح بوون.

ڕۆیشتمەوە بۆ لای باوکم، وتم: ئەوە خۆم تەسلیمکرد بۆ تەسریح بوون، وتی: جا لەدوای چی، خۆ منت کوشت، هەر ئەوەندەی وت، کاکم و ئەوان سەیرێکی منیان کرد، کاکم وتی: باوکم بۆ وا دەڵێت، ئنجا کاکم و ئەوان دابارینە سەرم.

وتیان: ئاخۆ چیت وتووه؟، دوای هەفتەیەک باوکم دەرچوو لە نەخۆشخانە، بردمانەوە بۆ ماڵەوە، خزم و کەسوکار و بەرو دراوسێ و دراوسێ دوکانەکانی باوکم هەموویان هاتن، تا چەند ڕۆژێک قەرەباڵغی ڕووی تێکردین.

باوکم وتی: باشبووم، ئەڵێم بڕۆمەوە بۆ دوکان، ئەوکاتە دوکانی باوکم هەر داخرا بوو، بۆ بەیانییەکەی ڕۆیشت بۆ دوکان، لەولاوە هاتەوە، وتی: نەمتوانی بڕۆم، هەمدیسان لە ماڵەوە هیلاک بوەوە، ئێمەش بردمانەوە بۆ نەخۆشخانە، ٣ ڕۆژی تر لەوێ بوو، حاڵی زۆر خراپبوو، ئێمەش براکان و کەسوکار هەر بەلایەوە بووین، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ تەندروستی خراپتر دەبوو، تا ڕۆژی ٦ / ١٠ / ١٩٨٨ سەعات ١٠ ی بەیانی کۆچی دوایی کرد.

ئێستاش ئەڵێم هۆکارەکەی من نەبووم، بەڵکو ئەوبارو زرووفە نا هەموارانە بوون کە بەسەر میللەتەکەماندا دەهات، دەتوانم بڵێم دایکو باوکی زۆر گەنجی ئەم شارە هەمووی توشی نەخۆشی بوون لە تاوی منداڵەکانیان، دایک و باوکی زۆر کەس لە زیندان مردن، زۆر کەس سەریان نایەوە بەخەم و پەژارەی کەسوکارو منداڵەکانیانەوە، ئەمە هەمووی لە ئەنجامی زوڵم و زۆری ڕژێمەکان بوونو ژێر دەستەیی میللەتی کورد.

هاوڕێیەتی من و هوشیار دەگەڕێتەوە بۆ ساڵانی ١٩٧٤ — ١٩٧٥ کە هەمیشە بەیەکەوە بووین، لە پێش ساڵانی ١٩٨٠ هوشیار ڕۆیشت بۆ شاخ و پەیوەندی کرد بە کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانەوە، لە ساڵی ١٩٨٢ گەڕایەوە بۆ ناوشار پەیوەندی کردەوە بە ڕێکخراوی سلێمانییەوە.

من و هوشیار نهێنیمان لە یەکتر نەدەشاردەوە، لە ١٩٨٨ بەدواوە من بەهۆی ئیشی دووکان، ئەویش کارمەندی پەروەردەی سلێمانی بەشی دارتاشی کە بەرانبەر مزگەوتی گەورە بوو، بەهۆی ئەوەوە زیاتر لە یەکتر نزیک بووینەوە (پێش ئەوەی عەلی و حاجی شەهید بین هەندێ جار بەیەکەوە دەمانخواردەوەو سەرمان گەرم دەکرد).

دوای ئەوان من و هوشیار جارناجارێک ٢-٣ بیرەیەکمان دەخواردەوە. هەر جارەی دەڕۆیشتین بۆ نادییەک، ساڵانی ٨٨ - ٨٩ نادییەکان زۆربەی زۆری کەسانی سەر بە حکومەتو جاشو تەوارییەکان دادەنیشتن، ڕۆژێک لای ئێوارەیەکی درەنگ من و هوشیار خۆمان کرد بە بارەکەی کوێستانا لەسەرشەقامی مەولەوی، بارەکە یەک دەرگای هەبوو بەڕووی شەقامەکەدا، کە دەڕۆیشتینە ناوەوە ژێر زەمینێکی گەورە هەموو تەرتیباتێکی نادی بۆ کرابوو، شوێنێکی دڵگیرو خۆشبوو.

لەگەڵ هوشیار ڕۆشتینە ژوورەوە، سەیرمانکرد شوێن نەماوە دابنیشین لە ناوەڕاستی هۆڵەکە ٥-٦ مێز لەیەکدرابوون، هەرچی سەرسەرییو تەوارییەکانی ناوشار هەبوو لەوێ کۆبوبونەوەو مێزیان ڕازاندبووەوە بە گۆرانی وتنو قسەی هیچ و پووچ، یەکێک لەوانە خەسە خرەی چوارباخ بوو قسەی بۆ دەکردن. باقی مێزەکانی تریش هەمووی گیرابوون کەمێک وەستاین، لەبەرئەوەی تاریکبوو باش شوێنەکانمان نەدەبینی هەر چاومان دەگێڕا، سەیرمانکرد مێزێکی ٤ کەسی تەنها یەک نەفەری لەسەرەو ٣ جێگاکەی تر چۆڵن، بە هوشیارم وت: بابڕۆین بۆ ئەو مێزە بزانین نەگیراوە، ڕۆیشتینە نزیکەوە سەلاممان لێکرد بە عەرەبی وەڵامی داینەوە، هوشیار عەرەبی باشدەزانی، وتی: دەتوانین دانیشین، بە

گەرمی وتی: فەرموون.

ئێمەش دانیشتین، بانگی بۆیەکەی کرد، پێش ئەوەی ئێمە داوا بکەین کاکی عەرەب دەستپێشکەری کردوو، وتی: چی دەخۆنەوە، وتمان: ئێمە هەر بیرە دەخۆینەوە، وتی: یەکی ٢ بیرەیان بۆ بهێنە، بۆیەکە بیرەی هێنا بەدەم خواردنەوەوە وتی:  یەک پرسیارتان لێدەکەم؟ چۆن بوو هاتنە سەر ئەم مێزە بۆ لای من؟، هوشیار وەڵامی دایەوە: شوێن نەبوو، وتمان بابڕۆینە لای ئەو برادەرە، هوشیار وتی: ئەی باشە چۆنە تۆ تەنهایتو کەست لەگەڵدا نیە؟، وتی: ئەمڕۆ هەر خۆم هاتم چاوم دەگێڕا یەکێک بێت، ببێت بە هاوڕێم بەیەکەوە دابنیشین، کە سەیریان دەکرد عەرەبم کەس نەدەهات، دەستی ڕاکێشا بۆ تەوارییەکان وتی: ٢- ٣ لەوانە ویستیان بێن، قبوڵم نەکرد، وتی: چونکە ئەوانە باش دەناسم چەند خوێڕین هەمووی پیاوی ئەمن و تەوارییەکەن، دوایی خۆی ناساند بە ئێمە، وتی: من ملازم ئەوەلی ئەمنم لە سلێمانی، نازانم کەس نایەت لای من دابنیشێت، ئێمەش وتمان: خەڵک بەجۆرێک سەیرت دەکات، تەنانەت ئێستاش وا سەیری ئێمەش دەکەن دەزانن ئێمەش برادەرتین، وتمان: ناحەقی خەڵک مەگرە ئەوەندەیان شتی ناشیرین بینیوە بۆیە کەسیش نایەتە لای تۆوە، ئەگینا ئەو خەڵکە هەمووی خراپ نیەو هەمووشی ترسنۆک نیە، هەیە ئێستا ڕقی لێت دەبێتەوە، یان لەبەر خاتری قسەی خەڵک نایەتە لاتەوە، هەیە وا دەزانن ئەوانیش سەر بە حکومەتن بۆیە لەگەڵ تۆ دانیشتون، هەمووی ئەو هۆکارانەیە خەڵک وا بیر دەکەنەوە.

وتی: بڕوا بکەن چەند ساڵە لێرەم دەزانین کێ خراپە و کێ ئازایەو کێ باشە، دەتوانم سوێند بخۆم ئەوەتەی لەم شارەدام خیانەتم لە کەس نەکردووە، بەڵام ئێستا ئەم شارە ئەوەندەی کوردە خائینەکەیی و جاش و تەوارییەکەی خراپە، بڕوا بکەن ئێمەی عەرەب ئەوەندە خراپ نین، چونکە هەمووی کورد ئیخباری کورد دەکات و  کورد ناوی کورد دەهێنێت لە پێناوی پارەدا، ئەگەر ئێمە بە قسەی کورد بکەین دەبێت شەوی هەزار کەس لەم شارەدا بگرین و بکوژین، بەڵام وامان لێهاتووە کە یەکێک بە گرت دەدەن، پێیان دەڵێین: بە بەڵگەی ناتەواوەوە

ئەو کەسە بگرین و هیچی لەسەر نەبێت دوایی تۆ تاوانبار دەکەین، وتی: بڕوا بکەن هیچ ناشارمەوەو خەیاڵیش نیم و ناشتان ناسم، بەڵام ئێستا ئەگەر یەکێک ئیعتراف نەکات لە ئەمن یان لە تەوارییەکە، دەیاندەنە دەست کوردەکان. ئەوان ئیعترافی پێدەکەن، لەبەر خاتری ٢ دینار ئەشکەنجەی وای دەدەن ئێمە وای لێناکەین، کاتێک ماڵێک دەگیرێت بە کوردەکان دەڵێین بیانهێنن، بە یەک دەقیقە دەیاندۆزنەوەو تەسلیمی دەکەن، دوایی دەڕۆن ماڵەکانیان تالان دەکەن بۆ خۆیان ئەوەندە نەفسییەتیان نزمە.

کاتمان کرد بە ٨ ی شەو، بیرەکانمان تەواو کرد، کاکی ئەمن یەکی ٢ بیرەی تری بانگ کرد، ئێمە حەزمان نەدەکرد هەڵسین، ئەویش بەهەمان شێوە دەستمان کردەوە بەقسەکردن، وتمان: تۆ هەر باسی خراپەی کوردت کرد. ئەی باسی ئەو کەسانەی کە وەکو شێرن لەناو گرتووخانەکاندا بەبێ ئیعتراف ماونەتەوە لە ژێر ئازارو ئەشکەنجەدا دەناڵێنن.

وتی: ئێستاش ئەڵێم کەسانی وای لێیە، دەبێت کورد شانازییان پێوە بکات. خێزانی وا خۆڕاگر لەو زیندانانەدان بڕوا بکەن مرۆڤ دڵی بۆیان دەبێت بە ئاو. بەڵام چی بکەین دەسەڵاتمان نییە.

لەسەر قسەکانی ڕۆیشت وتی: ڕۆژێکیان هەواڵمان بۆ هات لە گوندی موغاغ لای دوکان پێشمەرگەی لێیە، ئێمە چەند پیکابێک ڕۆیشتین لەگەڵ تەوارییە کوردەکان کە پێکهاتبوون لە جاشەکانی نەجۆ و عەلە لووت ماسی، چونکە ئەوان خۆیان داوایان دەکرد بێن لەگەڵمان، لەبەر تالانکردنی گوندەکان.

کاتێک ڕۆیشتینە سەر گوندەکە بوو بە تەقە، پاش سەعاتێک مقاوەمە. پێشمەرگەکان ڕۆیشتن تەوارییە کوردەکانیش دایان بەسەر گوندەکەدا دەستیانکرد بەتالانی، سەیرمکرد شتێکی سپی ڕادەکات، وتم: خوایە ئەم شتە سپییە چیە؟. کاتێک نزیکبووەوە سەیر دەکەم عەلە لووت ماسییە، سەلاجەیەکی ناوە بە کۆڵییەوەو ڕادەکات، ئەڵێت: ئەم سەلاجەیە خۆم گرتوومە کەس دەستکاری نەکات، ئێمەش وتمان ئێوەمان بۆ تالانی هێناوە.

- یەکێکی تر هات قووڵینەیەک بەسەر سەریەوە بوو سەیرمکرد لەناو قوڵینەکەدا

قەلێک بەسەر هێلکەوە نیشتووە، وتم: داینێ، هەرچی وتی خۆم گرتوومە، پێم داناو لەگەڵ خۆم هێنامەوە بۆماڵەوە، پاشان بە ئیجازە ڕۆیشتمەوە بۆ شاری موسەننا چونکە ماڵمان لەوێیە، وتی: بڕوا بکەن ١٦ هێلکەی لە ژێردا بوو، ئێستا هەمووی بەچکەیەو خەریکن گەورە دەبن، بەس وەڵڵاهی لە دەست تالآنیو مردن ڕزگارم کردن.

کاتمان کرد بە ١٠ ی شەو ئێمە وتمان: هەڵدەستین، ئەویش وتی: منیش هەڵدەستم، پاشان بۆیەکەی بانگکرد، ئێمە نەمانهێشت پارە بدات، بەڵام ئەو سوێندی خواردو پارەی ئێمەشی داو وتی: ئێوە میوانی منن.

تەنها پێم خۆش بوو ئەم باسە بیگێڕمەوە کە ئەو ڕۆژگارە کەسانی چەند دەروون نزم هەبوو لەم شارەدا دەردی کاکی عەرەب وتی: ئەگەر ئێوە شارەزا نەبن و بە ئێمە نەڵێن ئێمە زۆر شت نازانین، کەسانی دەروون نزم ڕێنیشاندەر بوون، ئەگینا ئەوانە هیچیان نەدەزانی لەوکاتەدا مەسەلەی شەهید کەمالی موهەندیسو حاجی و ئەوانم بیر کەوتەوە، کە تەنها کوردەکەی خۆمان بە گرتیدان و شاهید بوون بەسەریانەوە تا کاتی کوشتنیان.



ڕەئووف شێخ جەمیل هوشیاری دارتاش

دوای وەستانی شەڕی ئێران – عێراق ڕژێمی بەعس دەستیکرد بە ئەنفال و کیمیاباران بۆ لەناو بردنی گەلی کوردو هێزی پێشمەرگە، ئنجا پێویستی زۆری بە سوپا نەما، بۆیە هەندێکی لە سوپا ماندووەکەی تەسریح کرد، لەو بڕیارەشدا گەلی کوردی بەرکەوت، هێزی پێشمەرگەش کاتێک کە ڕۆیشتنە ئێران زۆربەیان خۆیان تەسلیم کردەوە بە ڕژێم، چونکە ژیانی ئێرانیان پێ قبوڵ نەدەکرا زۆری لەبەر نەبوونی نەیتوانی، زۆریشی لەبەر بێ جێگەو ڕێگەیی بۆی نەڕۆیشتە سەر. وابزانم سەرانی کوردیش وتبوویان: ١٠٠٠ پێشمەرگەمان بەسە، بۆیە زۆربەی پێشمەرگە خۆیان تەسلیم کردەوەو چەندەها پێشمەرگەی قارەمانی وەکو ئاکۆو نموونەی ئەو تەسلیم بوونەوە.

بەڵام ڕژێمی بەعس بەوەوە نەوەستا، لەدوای ماوەیەکی کەم نەیهێشت گەلی عێراق پشوو بدەن، دەستیکردەوە بە بانگهێشتی گەنجان بۆ خزمەتی سەربازی. میللەتی کوردیش بێبەش نەبوو لەو ڕەحمەتە.

پاشان ڕژێم هەمووی کردەوە بە سەرباز لەناو جەیشە شەق و شڕەکەیدا. ئەمجارەیان ڕژێمی بەعس زۆر ماندوو بوو، چ لەهێز چ لە چەکی سەربازییەوە. چونکە چی چەکی هەبوو شەڕی ٨ ساڵەی ئێران و کوردی پێکرابوو.

سوپایەکی ماندوو لە مانگی ١٩٩٠/٨ دا، یەکێک بە یەکێک دەڵێت (بزن نەگبەتی بیگرێت نانی شوانی دەخوات)، هەڵیکووتایە سەر وڵاتی کوێتو داگیری کرد ئەویش تەنها بە مەبەستی دزینی سەروەت و سامانی ئەو وڵاتە بوو، لە ماوەیەکی کەمدا تاڵانی کردو زۆری خەڵکەکەشی کوشت و بڕ کردو هەرچی سامانی وڵاتی کوێت هەبوو هەمووی ڕاکێشایە ناو خاکی عێراق، ئنجا کەوتە هەڕەشە لە وڵاتانی سعودیەو دەوروبەری، ئەمە بووە هۆی سەرسام بوونی وڵاتانی زلهێزی ئەوروپاو ئەمریکاو هەموو جیهانی هەژاند، ئەمریکای زلهێزیش کەوتە خۆی و یەکەمجار ئابڵووقەی ئابووری خستە سەر عێراق، چەندجار ئینزاری کرد کە لە کوێت بگەڕێتەوە بەڵام سودی نەبوو، بۆیە کەوتە خۆیو بەهێزی ئاسمانی و زەوی کەوتە لێدانی سوپای عێراق لە ١٩٩١/١/١٥ بە

ڕەسمی لە عێراق دراو نیوەی سوپاکەی تەفرو تونا کرد، ئەوەی مابوو بەسەر شۆڕی گەڕانەوە.

ئنجا هێزی پێشمەرگەی (ی. ن. ک) کە چەندەها مەفرەزەی پارتیزانیان هەبوو لەناوچە چۆڵکراوو قەدەغەکراوەکانی کوردستاندا کەوتنە خۆیان بۆ ڕاپەڕین، لەناوشارەکانیشدا خەریکی ڕێکخستنەوە بوون، کۆمەلانی خەڵکی کوردستان لە شارەکان بە ئاشکرا قسەیان دەکرد کەس ترسی نەمابوو، چونکە گەنجانی کورد بە گشتی هەمووی سەربازی هەڵاتوو بوون، سوپای عێراقیش دەسەڵاتێکی ئەوتۆی نەمابوو لەناوشارە کوردەکاندا، وەکو وتم: عێراق زۆربەی زۆری سوپاکەی لە دەست چوو بوو، هێزی پێشمەرگەش ئێسگەکەیان بە ئاشکرا بانگەوازی دەکرد بۆ کۆمەڵانی خەڵک.

ئێمەش وەکو گەنجانی ئەوکاتە، ئاگامان لە دەنگ و باس بوو، پەیوەندیمان بەیەکەوە کـردەوە، من و هۆشیار و ئاکۆ چەند جارێک لەماڵی خۆمان کۆبوونەوەمان کرد بۆ خۆ ئامادەکردن بۆ ڕاپەڕین، زۆر بە جدی کەوتبووینە خۆمان، چۆنیەتی بەرنامە بۆ دروستکردنەوەی هێزی ناوشار، شاری سلێمانیش لە گەنج و پیر لە هەموو لایەکەوە خەریک بوون.

پیاوانی ڕژێم بەهەموو شێوەیەک هەڕەشەیان دەکرد، بەشەو نەیاندەوێرا سەر بکێشنە دەرەوە بە ڕۆژیش لەناو بازاڕو شوێنە گشتییەکان نەبێت، هیچ دەسەڵاتێکیان نەمابوو، ئێستگەی دەنگی گەلی کوردستانیش ڕۆژانە بانگەوازی دەکرد بۆ کۆمەڵانی خەڵک کە ڕاپەڕین بەڕێوەیە، من و ئاکۆ و هوشیار دارتاش بۆ جارێکی تر کۆبوونەوەمان کرد.

ئاکۆ وتی: من چەکی خۆمم هەیە.

منیش چەکی خۆمم هەبوو، بڕیارماندا ئەگەر ڕاپەڕین دەستیپێکرد، بۆ بەیانییەکەی لە ماڵی ئێمە هەرسێکمان بەیەکەوە بڕۆین بەرەو مۆڵگاکانی ڕژێم، ٣/١ بە هیوای برام وت: دەبێت بڕۆم ئەو چەکە بهێنم لە ماڵی کاکم، تۆ سەیارەت پێیە بەڵکو یارمەتیم بدەیت، وتی: چەکی چی؟ وتم: چەکی خۆمە

دەیهێنم بۆ ماڵەوە.

(هیوای برام ئەوکاتە نەیدەزانی من چەکی ڕژێمم لایەو لە ماڵی کاکم دامناوە).

- وتی: جا تۆ لەو بڕوایەدایت ئەم حکومەتە ئەوەندە بە ئاسانی بڕوخێتو خۆی بدات بە دەستەوە، وتم: زۆر بە ئاسانی، چونکە ئەمە ڕاپەڕینی خەڵکە، خەڵک ئەوەندە بۆ ئازادی تینون هەموو گیانفیداییەکیان تیادایە، وتم ئێستا وەرە لەگەڵما با بڕۆین، وتی: هەموو سەرجادەو بانەکان بە قوات خاسەو جەیشی شەعبی گیراون، ئێستا تۆ چەکێکی قاچاخ بە ناو ئەو هەموو جەیش و جاشەدا لە هەوارە بەرزەوە دەهێنیتەوە بۆ ماڵەوە.

وتم: براکەم وەرە لەگەڵما ترسی ناوێت، هەر چۆنێک بوو ڕازیم کرد، کات ٣ ی پاش نیوەڕۆ ڕۆیشتین، سەیارەیەکی ڕینۆی پێبوو سەیارەکەمان بردە ژورەوە بۆ ماڵی کاکم، مەخزەن و تاقم و چەکەکەم لە ماڵی کاکم هێنایە دەرەوە، خستمە سندوقی سەیارەکەوە، ٢ مەخزەنم ئامادەکردو چەکەکەم هێنایە سەر پێ و ئەمنم کرد، سەری سندوقی سەیارەکەم دادایەوە.

وتم: بە کۆڵانەکانا لای دارۆغا دەڕۆینە خوارەوە بۆ لای شەقامی ئیبراهیم پاشا لای ناوەندی ژین کۆمەڵێک جەیشی شەعبی لێوەستاون، ئەگەر ڕایانگرتینو تەفتیشیان کردین من ئەڕۆم سەری سندوقەکە هەڵدەدەمەوە دەکێشم بە سەیارەکەداو تۆ بە خێرایی بڕۆ، منیش چەکەکەم ئامادەیە یان تەسلیمیان دەکەم یان دەیانکوژم یان ئەوان من دەکوژن، ڕۆیشتین لەسەرشەقامەکە هیچ نەبوو بەسەلامەتی گەیشتینە ماڵەوە، لەبەردەرگا سەیارەکەمان وەستان، لە ماڵەوە گوونیەیەکم هێناو چەک و مەخزەنم کردە ناوی و بردمنە سەرەوە، کارەکەمان سەریگرت.

ئەو چەکەش کلاشینکۆفەکەی مامۆستا هیمەتی کەریم فەتاح بوو کە لەساڵی ١٩٨٧ نەمدایەوەو لەدوای ٤ ساڵ قسەکەم هاتەدی و بەکەڵکی ڕۆژی خۆی هات.

## ٧ / ٣ /١٩٩١ یەکەم ڕۆژی ڕاپەڕین

- ٦٨ -

شەوی ٣/٧ ئاسمان هەور گرتبووی، شار بۆنی خوێنی لێدەهات، جەماوەر چاوەڕێی ڕاپەڕینیان دەکرد، چونکە لە شاری ڕانیە ٣/٥ ڕاپەڕین کرا، کۆمەڵانی خەڵک سەرکەوتنیان بە دەستهێنا، ورەیەکی بەرز هەبوو لەناو خەڵکدا، چاوەڕێی هێزی پێشمەرگە بوون بێنە ناوشارەوە، کۆمەڵانی خەڵکیش وەکو هێزی بێشومار لەگەڵیان بن، بەیانی شار زۆر کشو مات بوو، بەڵام خەڵک پێشمەرگەی دیبوو لە دەرەوەی شەقامی شەستی وردە، وردە دەنگو باس بڵاوبووەوە، سەعات ٨ی بەیانی ئاکۆ هات بۆ لام، وتی: ئامادەیت؟

- وتم: من ئامادەم، لەو کاتەدا دەنگی تەقەو، دەنگی ئاڕ بی جی پەیدابوو، من و هاوسەرەکەم قسەمان لەگەڵ ئاکۆ دەکرد، ئاکۆ کوڕێکی تری لەگەڵدا بوو ناوی ناسر بوو، وتم: بڕۆ چەکەکەت بهێنە بەڵکو هوشیاریش بێت، بەخێرایی ڕۆی، وتی: ئێستا دێمەوە، شار دەنگی تێکەوت جموجۆڵ پەیدا بوو، گەنجانی شەقامەکان کردیان بە هاوار، هاوارو سروود وتن، من هەر چاوەڕێی هاوڕێیان بووم ئێستا نا ئێستا دێن، هەر نەبوون، نەشمدەتوانی بڕۆم، لەبەر ئەوان وتم: با لەیەک نەپچڕێین، بوو بە سەعات ١٠ ئاکۆ نەهاتەوە بۆ لام و وشیاریش دیار نەبوو، پاشان لەگەڵ مامۆستا کەریمی هاوڕێم ڕۆیشتین بۆ لای سەراوە، ئەو ناوە هەمووی پاککرابووەوە، سەرا هەمووی وێران ببوو، لاشەی شەماڵی خۆفرۆشیان هەڵواسیبوو بە فولکەی موروری سەراوە، لەوێوە ڕۆیشتین هەتا لای سلێمانی پالاس هێشتا تەقە مابوو لەوناوەدا، خەڵک هەمووی بەرەو ئەمنە سوورەکە دەڕۆیشتن.

دوای نیوەڕۆ لایەقی کاک نامیق وێڵەدەری هات بۆ لام بە دڵگیرییەوە هەواڵی ئاکۆی پێدام کە شەهید کراوە.

وتی: ئەوەندە دڵی گەرم بوو لەگەڵ چەند هاورێیەکی تر ڕۆیشت بۆ لای سەراوەو شەڕی سەرا تەواو بوو، بەرەو حامیە ڕۆیشتن لە کانێسکان تەقەیان لێکردوو شەهیدیان کرد، لەگەڵ لایەق ڕۆیشتم بۆ ماڵیان، (لایەق لەپێشەوە باسمکردووە لە ساڵی ١٩٨٣ لەیەک شانەدا لەگەڵ ئاکۆ لەلای من بوون).

کە ڕۆیشتم بۆ ماڵیان تەعزییان لە ماڵەوە بۆ دانابوو، براکانیو خزم و کەسی وەستا بوون، دنیا وا خرۆشابوو کەس فریای تەعزییەو مزگەوت نەدەکەوت، کاک لەتیف و سامان و ئاسۆ و ئەوان ورەیان بەرز بوو، دەیانوت: یەکەم چەپکە گوڵ بۆ ڕاپەڕین براکەی ئێمە بوو، مێژوویەکی گەشی بۆ خۆی تۆمارکرد.

بۆ ڕۆژی دوایی هوشیار هات بۆ لام، هەواڵی ئاکۆم پێووت کە شەهیدکراوە. لە خەفەتا قسەی بۆ نەکرا.

بەیەکەوە ڕۆیشتین بۆ ماڵی ئاکۆ بۆ سەرەخۆشی، ئیتر ئەو ٣ ڕۆژە هەر سەرقاڵی تەعزییە بووین.

لە ٧ ڕۆژانەیدا مەراسیمێکی گەورەمان دەستپێکرد لە شەقامی ئیبراهیم پاشاوە بۆ گردی شەهیدان بە شیعر خوێندنەوەو هوتاف کێشان.

شیعرەکان (نەرمین خانی هاوسەری شێخ جەمالی موزیع دەیخوێندەوە)، کاکە ئاکۆی جوانەمەرگ لە تەمەنی٢٠ ساڵیدا پاش ئەو هەموو تێکۆشان و ئەشکەنجەو سجن و پێشمەرگایەتییە لە ماوەی ٨ ساڵی خەباتیدا گیانی پاکی بەخشی بە ڕاپەڕینو خاکی کوردستان، ئەویش بووە گوڵێکی سوور لە گردی شەهیدان .

هەموو ساڵێک لە یادی ڕاپەڕیندا ئەو گوڵە سوورە سەر دەردەهێنێت و لەگەڵ گوڵی خوێناوی گردی شەهیدان سەیری شاری سلێمانی دەکەن و بەسەربەرزییەوە سروودی ئێمە نامرین ئەڵێنەوە.



رۆژی ١٠/٣/١٩٩١ سێ ڕۆژانەی سەرقەبرانی شەهید ئاکۆی حەمە شوکر



رۆژی ١٠/٣/١٩٩١ سێ ڕۆژانەی سەرقەبرانی شەهید ئاکۆی حەمە شوکر

رایەل و جاش نا شەعبیەکی دڕندەی فاشستەکان بوو .

( ٤ ) لە کوتای مانگی مایسی ئەمسالدا بڕیاری گەل و یاسای شورش لە ناو شاری سلەیمانی بە سەر خو فروش روو رەش (قالەی حەمە ملا نادر) دراو ئیعدام کرا، ناوبراوی خائن ئەلقە لەگوێەکی سەر بە قەسابخانەی ئەمنی سلەیمانی بوو کە دەستی هەبوو لە بەگرتن دان و شەهید کردنی چەند پیشمەرگەیەکی پالەوان .

( ٥ ) لە روژی ١ /حوزەیرانی / ١٩٨١ لە ناو شاری سلەیمانی بڕیاری گەل و یاسای شورش بەسەر تاوانباری خائن (حسین فارس) دراو ئیعدام کرا بە سزای رەوای خیانەت گەیشت، ناوبراو جاسوسیکی سەر بە رژیمی فاشست بوو کە چەند جاریک نیرد رابوو بو دەرەوەی وولات بو ئەنجامدانی کاری فاشستانە دژ بە روڵە نیشتمان پەروەرەکانی گەلانی عیراق .

( ٦ ) لە روژی ١٠ /حوزەیرانی / ١٩٨١ بڕیاری گەل و یاسای شورش لەناو شاری سلەیمانی دا درا بە سەر خائن (وطبان) و ئیعدام کرا، ناوبراوی خوفروش بەرپرسی بەری بە نیو ( دار الوطنیە للنشرو التوزیع و الاعلان ) بوو شوینی ئیشەکەی کرد بوو بە مولگای بلاوکردنەوەی بیری گلاوی فاشستەکان .

( ٧ ) لە روژی ١٠ / حوزەیراندا بڕیاری گەل و یاسای شورش لە ناو شاری سلەیمانی دا بەسەر خوفروشی تاوانبار (عبد الجبار سماك ) دراو ئیعدام کرا، ناوبراو ماموستای کولیجی کشتوکال بوو لە زانکوی سلەیمانی، لیپرسراوی (قاطع الجامعه)ی جاشی ناشەعبیەکان بوو ئەندامیکی چالاکی فاشستەکان بوو کە زور دژی گەلی کورد مان و شورشە رزگاری خوازەکەی بوو .

" ٣٨ "

بەلگەنامەی بەسزاگەیاندنی (قالەی حەمەی مەلا نادر) لەلایەن گەل و شۆڕشەوە کەلەهەواڵنامەی کوردستانی عیراقدا بلاوکراوەتەوە

# بەڵگەنامەی ئازادکردنی
# ئاکۆ محەمەد عەبدوڵلا ناسراو بە ئاکۆی حەمە شوکر و
# لەگەڵ چەند هاوڕێیەکیدا لە ئەمنی سلێمانی لەکاتی
# راپەڕیندا لەئەمنە سوورەکە دەستکەوتووە

| الاسم | الحالة | السبب |
|---|---|---|
| ٢٣ عمر صالح محمد امين | موقوف (رهن التحقيق) في امن اربيل | عثر بحوزته على رمانه يدوية |
| ٢٤ جوهر رسول احمد | " " " " " | " " " " " |
| ٢٥ رشيد محمد علي | موقوفين (رهن التحقيق) في امن الناميم | قبض عليهم لكتابتهم شعا معاديه • |
| ٢٦ نورالدين محمد صالح | | |
| ٢٧ كامران جبار سعيد | | |
| ٢٨ سعيد احمد رحيم | | |
| ٢٩ اسماعيل احمد حسن | | |
| ٣٠ ياسين احمد عبدل | | |
| ٣١ محمد احمد حسن | | |
| ٣٢ محمد بابا محمد رشيد | | |
| ٣٣ ازاد محمود حمه صالح | | |
| ٣٤ وهبه محمد امين سعيد | | |
| ٣٥ فاضل عبدالله كريم | | |
| ٣٦ محمد خضر خوشناو | | |
| ٣٧ عبدالعزيز مصطفى رشيد | | |
| ٣٨ • صباح عباس محمد | | |
| ٣٩ • الله [illegible] حسن | | |
| ٤٠ • فتاح علي اسماعيل | موقوف رهن التحقيق لدى امن اربيل | قبض عليه كونه من عناصر الاتحاد • |
| ٤١ • محمد عبدالله ابو بكر | موقوف رهن التحقيق لدى امن نينوى | لتعاونه مع عناصر الا[illegible] |



# بەڵگەنامەی چۆنیەتی دەستگیرکردنی
# شەهید حاجی هاوڕێکانی کە لەرۆژی ڕاپەڕیندا
# لەئەمنە سوورەکە دەستکەوتووە

// من يقاتل بشرف يستحق المجد //

الجمهورية العراقية
وزارة الداخلية
مديرية الأمن العامة
مديرية امن منطقة الحكم الذاتي
القسم الثاني

//سري للغاية وشخصي//

العدد ٢١٢٨٧
التاريخ ٢٢/٩/١٩٨٧

الى / مديرية امن محافظة السليمانية

م/ ارسال متهمين موقوفين

نشير كم الى كتاب منظومة استخبارات المنطقة الشرقية المرقم ش٢/ق١/ ١٥٠ قادسية صدام ٢٠٧٢ في ٢٢/ايلول/١٩٨٧ نرسل اليكم المتهمين الموقوفين المدرجة اسمائهم ادناه مع نسخة مصورة من المطالعة الصادرة من المنظومة اعلاه المعنونة الى الرفيق المناضل مسؤول قيادة مكتب تنظيم الشمال ونسخة صورة من كتاب قيادة مكتب تنظيم الشمال السري للغاية والشخصي المرقم ٥٨٧٠ في ١٧/ايلول ١٩٨٧ مع كافة الاوراق التحقيقية الخاصة بهم والامانات العائدة لهم وحسب القوائم المرفقة طيا .. يرجى الاطلاع واتخاذ مايلزم على ضوء ماورد بكتاب المنظومة اعلاه .. واعلامنا .. مع التقدير ..

عميد الامن
م م ع لمنطقة الحكم الذاتي

اسماء المتهمين /

١- المتهم طارق قادر محمد
٢- = جلال عبد الله محمد
٣- = كمال محمود فرج
٤- = برهم عمر سعيد
٥- = علي حمه رحيم
٦- المعفى عنه الذي عوقب فريدون عارف حسين

نسخة منه الى /

مديرية الامن العامة / ش٢ طيا صورة كتاب المنظومة اعلاه مع نسخة صورة من المطالعة ونسخة من كتاب قيادة مكتب تنظيم الشمال

رائد رحيم
اجراء اللازم حسب الهامش
... وتنفيذ توجيهات مكتب تنظيم الشمال
... علامة

حزب البعث العربي الاشتراكي
القطر العراقي
قيادة مكتب تنظيم الشمال
العدد / ... في مكتب السكرتارية
.../ ٩ / ١٩٨٧

امة عربية واحدة
ذات رسالة خالدة
( سري للغاية وشخصي )

الى : منظومة استخبارات المنطقة الشرقية

تحية رفاقية :

الموضوع : شبكة تنظيمات داخلية

كتابكم ... في ١٤ ايلول ١٩٨٧

١) حصلت الموافقة على المقترحات الواردة بكتابكم اعلاه وتحجز اموال المجرمين وتهدم دورهم بعد تنفيذ حكم الاعدام بهم .

٢) يستفاد من المتهم فريدون عارف حسين من خلال احدى الاجهزة الامنية .

٣) يقدم الرفيق المناضل علي حسن المجيد مسؤول مكتب تنظيم الشمال الشكر والتقدير الى مدير المنظومة الشرقية والى كل من عاونه في هذه المهمة .

يرجى الاطلاع واتخاذ ما يلزم واعلامنا .... مع التقدير .

طاهر توفيق
سكرتير لجنة شؤون الشمال

ع/...



منظومة استخبارات المنطقة الشرقية

ش / ٢
العدد / ٩
التاريخ ١٤ ايلول ٨٧

الى / الرفيق المناضل مسؤول قيادة مكتب تنظيم الشمال المحترم
الموضوع / شبكة تنظيمات داخلية

تحية وتقدير ...

سيدي :

١. خلال شهري حزيران وتموز من هذا العام صعد المخربون من عمليات الاغتيال داخل مدينة السليمانية وكان احد الضحايا من منتسبينا ومن خلال التركيز وتكثيف الجهود في رصد نشاط المخربين ومتابعتهم في هذا الاتجاه تمكنا من خلال متعاونينا الوصول الى احدى هذه الشبكات واختراقها والقاء القبض على افرادها الكليه اسمائهم واعترافاتهم المؤشرة ازائهم :-

آ - المتهم هلال عبد الله محمد

عمل منذ عام ١٩٨٣ ضمن التنظيمات الداخلية لعملاء ايران الموقف في نفس العام لرفيق سبقه بشهر لدى امن السليمانية، في عام ١٩٨٧ اشترك في عمليتي اختطاف مواطنين بتوقعه للسلاح وتسليمهم الى مقر المفرز الاول في بلكجار في قره داغ، اشترك في عملية اغتيال الرفيق عبد الله وكان احد الذين اطلقوا النار عليه / الرفيق عبد الله يعمل بصفة موظف في دائرة زراعة السليمانية وبدرجة عضو في تنظيمات حزبنا القائد ومن القومية الكردية وهو عنصر مخلص

( ١ - ٥ )

سري للغاية وشخصي

## ئەركی پیرۆزی ماموستا لە شۆڕشی نوێخوازی گەلدا

ئاشكرایە ماموستایانی شۆڕشگێڕو نیشتمان پەروەر هەردەم ڕۆلێكی تایبەتی و جێگایەكی دیاریان لە خەباتی ڕەوای گەلەكەیاندا هەبووە و هەمیشەش وەك ڕوناكبیرێكی شۆڕشگێڕ بوونەتە پردی پەیوەندی بیری زانستانەو پێشكەوتن خوازانە بو جەماوەرانی چەوساوەو زەحمەتكێش هێگەلەوەی لە خوێندنگاكانا بوونەتە مەشخەڵی ڕوشنكەرەوەی ڕێی تاریكی ژیانی نەخوێندەواری و بنچاغەی ئەوەیە كی ڕوناكبیرو دوا ڕۆژێكی گەش و پرشنگدار • بۆیە دەبێت ماموستا هەردەم وەك ڕێپیشاندەرێك و وەك تێكوشەرێكی ڕێی سەختی خەباتەهەولی هوشیار كردنەوەو تێگەیاندنی خوێندكاران بە ڕێبازی ڕاستی شۆڕشگێڕانە بدات • بەتایبەتی لەم قوناغەی ئێستای شۆڕشی نوێخوازی گەلەكەمان بە ڕابەرایەتی (ی ن ك) • دیارە لەم هەل و مەرجەی خەباتدا ئەركی سەرشانی ماموستایانی دلسۆزو نیشتمان پەروەر بەهاتر و گرانتر دەبێت لە سازدان و پێگەیاندنی خوێندكارو ڕوناكبیرە شۆڕشگێڕەكانی گەلدا •

هەربۆیە پێویستە ماموستایان بە چاكی هەست بەو ئەركە پیرۆزانەیان بكەن كەلە ژیانی ڕۆژانەیاندا لەسەر شانیانە و چاكتر خۆیان بو ئەنجام دانی ئامادە بكەن و توندتر هاوخەباتی خوێندكارە شۆڕشگێڕەكان بكەن و چاكتر لە دژی ڕژێمە ڕەفتار فاشستەكەی بەعسدا هانیان بدەن و باشتر ڕێی ڕاستی خەباتیان بو ڕوون بكەنەوەو ڕۆلی پر هانازیان لە هێنانەدی مافە پیشەیی و دیموكراتیەكانی خۆیان بو دیاری بكەن •

ماموستایانی تێكوشەر

گەر سەرنجێكی لەرابردوی خەباتی پر هانازی ماموستایان بدەین بە ئاشكرا ڕۆلی گرنگ و مێژوییان لە هاوكاری كردنی خەباتی گەلدا لە هەموو بوارێكدا بەدی دەكەین • نمونەی ئەم ڕاستیانەش لە خوێنی گەشی ماموستایان (احمد عبداللە • احمد ڕەشوانی • انور دارتاش • یاسین • اسماعیل • حەمە بورو جعفر و حەمە امین بولا • عزیز محمود • جمال عزیز • ئازاد یوسف • ستوبەر • جمیل ڕەنجبەر • بەرزان عثمان و دەیان ماموستای تر ) بەدی دەكەین • كەلە پێناوی هێنانەدی مافە پیشەیی و نەتەوایەتیەكاندا گیانی خۆیان بەگەل و نیشتمان بەخشی و تا ئێستاش بەردەوام دەیان ماموستای ئەبەزو كولنەدەر لە سەنگەرەكانی پێشەوەی شۆڕشی نوێخوازی گەلەكەماندا شان بە شانی پێشمەرگە قارەمانەكان لە ڕیزی پێشەوە بەرگری لە مافی ڕەوای گەلە زوڵملێكراوەكەیان دەكەن •

ماموستایانی ئەبەزو تێكوشەر

ئێستاش بە ئاشكرا هەست بەو ڕاستیە دەكرێت كە ڕژێمە ڕەفتار فاشست و ڕەگەز پەرستەكەی بەغدا چون گەرەكیەتی مافە پیشەیی و دیموكراتیەكانمان زەوت بكات و بەشارەزوو ویستی خوی پەروەردەو فێركردن لە كوردستاندا بكاتە كێلگەی بە عەرەب و بەعسی كردن و پاسوس و سیخوری لی بەرهەم بهێنێ • دەیان هەزار نمونەی ئەم ڕاستیەش دیارو ئاشكرایە لامان • ئەوەتا بەرنامەكانی پەروەردەو خوێندن هیچ باسێكی زانستانەو هیچ ڕوویەكی ڕاستی خەباتی گەلانی عیراقی تێدا بەدی ناكرێت • جگەلە پیاهەڵدانی حزبە فاشستەكەی بەعس و سەروكە خوێن ڕێژەكەیان • دەسكەوتە درو و ڕزگەشەكەیان نەبێت •

لەلایەكی تریشەوە هەموو توانای خوی بو بەعسی كردنی ڕیزەكانی ماموستایان و خوێندكاران تەرخان كردوە و چەندەها پلانی نابەجێیان بو ئەم مەبەستە كێشاوە • سەرەرای ئەمانەش خوێندنگاكانی كردو تە لیبەندی سەركوت كەرەوەی هەلچوونی خوێندكارە شۆڕشگێرەكان و لە هەموو خوێندنگایەكدا یەكی یان چەند جاسوس و منیتێكی لە دەزگا جاسوسیەكانی بو تەرخان كردوە تا چاودێری جموجولی ماموستایان و خوێندكارە شۆڕشگێرەكان بكەن هەرنا بەرین ترین شێوەی ڕەفتاریان لەگەلدا دەكەن و هەر ئازادیی و سەربەستیەكیان بو پەرەپێدانی ماموستا و خوێندكاران نەهێشتوتەوە و سەرجەم سەربەستیە پیشەیی و نەتەوایەتیەكانیان لی زەوت كردوون • بۆیە ئێمەش لێرەدا بە پێویستی دەزانین بانگەوازی خومان بگەیەنینە هەموو ماموستا و خوێندكارە شۆڕشگێرو نیشتمان پەروەرەكان كە نارەزایی خۆیان لە دژی ڕەفتاری نامروڤانەی ئەم ڕژێمە داگیركەرە دەرببڕن و خۆیان سازو ئامادە بكەن بو خەبات و لە دەوری ئالای پیرۆزی یەكێتی ماموستایانی كوردستان بە ڕابەرایەتی ( ی ن ك ) كوببنەوەو هەموو پێكەوە دەست داوای مافی پیشەیی خومان و بەرنامەیەكی خوێندنی زانستانەو گەلی بكەین و خەباتی شۆڕشگێرانەی بو بكەین •

با هەر هەڵكاوە بێت ئالای پیرۆزی خەباتی ماموستایان

مردن و سەرشوری بو ڕژێمە داگیركەرو كونەپەرستەكان

## وزە و توانای زۆر و زەبەندی گەل
## زەبروزەنگی فاشیانەی داگیرکەران و نۆکەرانی تێکدەشکێنێ

رژێمە فاشیستەکان لە کاتێکدا هەست بە بوونی جولانەوەیەکی شۆڕشگێرانە لە وولاتە ژێردەستەکانیاندا دەکەن پێیان وایە بە رەفتاری فاشیانە و کوشتن و برین و کاول کردن بزوتنەوەکە لە ناودەبەن و جولانەوەکە سەرکوت دەکەن ! .

بەلام مێژووی خەباتی کرێکاران و گەلانی زۆر لێکراوانی دونیا ئەو راستیەیان سەلماندوە کە زەبر و زەنگی رژێمە فاشیستەکان نەک هەر کار لە لاوازکردنی بزوتنەوەکە ناکات و جەماوەری شۆرشگێری لێ ناترسێنێتەوە ، بەلکە بە پێچەوانەوە کەف و کوڵی شۆرشگێری خەلکی زیاتر زوولە هەلچون و پەرژبونەوە دەکات و خەلکی چاکتر لە دەوری بزوتنەوەکە کودەکاتەوە و باوەڕیان بە سەرکەتن بەتین تر دەکات .

شۆرشی رزگاری نیشتمانی گەلی کوردیشمان کە ئەلقەی نەپساوی تری خەباتی گەلانی زۆرلێکراوانی دونیایە لە بەگژاچون و تێکشکاندنی رژێمە فاشی و داگیرکەرەکانی کوردوستان و نوکەر و ئەلقە لەگوێکانی .

هەر بویەش توپباران کردنی شاری قەلادزەی خوێنساوی لە لایەن جاشەکانی (جود) رەزمەندەگانی موسولمانی عیراق و شەهیدکردنی دەیان منداڵ و لاوو پیر و پەک کەوتەی گوندی چیمەنی شەهیدان و گوللە باران کردنی خەلکی راپەریوی شارە قارەمانەکەی سلیمانی و شەهید کردنی دەیان تێکوشەری وەک ( هاوری عبدالله ) و گرتن و لەسێدارەدانی سەدان قارەمانی تر لەلایەن رژێمی داگیرکەری عیراقەوە . زیاتر جەماوەرانی زەحمەتکێش لە دەوری ئالاکەمان کودەکاتەوە و ئاویتەی پوتەی خەبات و تێکوشانیان دەکات .

ئەی جەماوەرانی شۆرشگێری کوردوستان

تولەی توپباران کردنی شاری قلادزە وشەهیدکردنی منداڵ و ئافرەت و پەککەوتەی گوندی چیمەنی شەهیدان و گوللە باران کردنی جەماوەری راپەریوی کوردوستان هەر بە خەباتی نەپساوو نەفەس درێژی ئیوە دەسەنری .

دەبا رێ و تورەیی و یارەزاییمان بەرووی داگیرکەران و نوکەر و ئەلقە لەگوێکانیاندا بتەقێنینەوە خەباتی جەماوەریمان لە دژی رەفتاری فاشیانەیان توندتر بکەین و پلان و نەخشە گلاوەکانیان چاکتر تێک بشکێنین و لەبەردەم ئیرادەی گەلدا چوکیان پێ دا بدەین ..

پتەوتر بێ خەباتی کرێکاران و گەلانی زۆرلێکراوی دنیا

کومەلەی رەنجدەرانی کوردستان
ریکخراوی سلیمانی

## (( تەڵوع کردن هاوکاری کردنە لە درێژەدان بە فەرمان ڕەوایی بەعسی فاشی لە عێراقدا ))

هاوولاتیانی خۆشەویست

ئاشکرایە پیلانەکانی ڕژێمە داگیرکەرەکانی کوردوستان و نۆکەر و ئەلقە لەگوێکانیان وزنجیرە یەکی پێکەوە گرێدراوە . ئەوەتا لە کاتێکدا هەردوو ڕژێمی ڕەگەز پەرستی عێراق و ئێران پیلانی گواستنەوەی شەرە کاول کاریەکەیان بۆ کوردوستان دەکێشن ، لایەنە ئیسلامی و خۆفرۆشەکانی داو بەرەی ( جود ) ی هەوادارانیان بە شانازیەوە ئەرکی جێ بەجێ کردنی لە ئەستۆ دەگرن و کوردوستان دەسوتێنن و دانیشتواناکەی شەهید دەکەن .

دیارە پیلانی گواستنەوەی شەر بۆ کوردوستان هەر بە مەبەستی زیاتر کاول کردنی ناوچەکەی زیاتر تالاندنی کوردوستان لە ئاگری ئەو شەڕە تا خاپوربوونەوە ، هەر بۆیە ڕژێمە گەندەڵەکەی بەعسدا ئەلقەیەکی تری ئەو پیلانەی لە ژێر ناوی بەرگری کردن لە خاك و نیشتمان دیاری کرد و بڕیاری بە زۆر ( تطوع ) کردنی لە کوردوستاندا دەرکرد ...... بەڵام با ڕژێم و دارو دەستەکەی چاك ئەو ڕاستیە بزانن کە کۆمەلانی خەلکی کوردوستان سەنگەری پارێزگاری لە خاك و نەتەوەیان لە ناو هێزی پێشمەرگەی کوردوستاندا وەدی دەکەن . ئەو ڕاستیە دەزانن کە ڕژێمە ڕەگەز پەرستەکەی بەعسدا چون ڕۆژانە دەیان گوندی کوردوستان دەسوتێنی و منال و لاوو پیریان پێکەوە شەهید دەکا ، ئەو ڕاستیە دەزانن کە ڕژێم دەیەوی ڕۆڵەکانیان بکاتە سوتەمەنی شەڕە فاشیە دوراوەکەی و بیانکاتە سەنگەری پاراستن و درێژەدان بە فەرمانڕەواییەکەی خۆی ..

دە ئێستا ئەی کرێکاران ، جوتیاران ، کاسبکاران ، ڕووناکبیرو خوێندکارە شۆڕشگێڕەکان ، ئەی گەنجین و لاوێ و ئافرەتە دلسۆزو نیشتمانپەروەرەکانی کوردوستان ، ڕێگا مەدەن ئەو خوێنڕێژانە بتانکەنە سەنگەری پاراستنی کورسی هەلۆسی فەرمانڕەواییان هوار مەدەن بۆ ڕۆڵەکانتان بخەنە گەرووی فاشیە دوراوەکەیانەوە .

هەر چون هەڵوێستی شۆڕشگێڕانەتان لە پوچەل کردنەوە و لەباربردنی پیلانەکانیدا دیاری کردووە هەر چون بە خەباتی جەماوەریتان لە ڕاپەڕینە پڕ شکۆکانی بەهاری ١٩٨٢ دا چۆکتان پێ دادان و ناوا کاریەکانتان پێ جێ بەجێ کردن و هەر چون بەو پەری گیانی لە خۆبوردنەوە پیلانی هەڵبژاردنە ساختەکەی ئەنجومەنی جاشەکانتان ڕیسوا کرد و مەزنترین سەروەریتان تۆمار کرد هەر بەو گیانە شۆڕشگێڕانەیەوە دژی بڕیاری بەزۆر ( تطوع ) کردن بوەستن و چەکی پارێزگاری کردن لە ڕژێم لە شان نەکەن ..

ئەی جەماوەری هەژار و کۆلنەدەر

- پارێزگاری خاك و نیشتمانەکەمان هەر لە لولەی تفەنگەکانی هێزی پێشمەرگەی کورد و ئێستادا بەدی دەکری ، مافی خوراوی نەتەوەکەمان بە گۆڕ کردنی داگیرکەرانی کوردوستان دەسەنرێتەوە . هێنانە دی مافی چارەنوسی گەلەکەمان هەر بە ڕوخاندنی ڕژێمی ڕەفتار فاشی بەعسدا و هێنانە سەرکاری حوکمێکی ئیئتلافی دیموکرات بۆ عێراق وەدەست دێ ..

بۆیە پێویستی سەرشانی هەموو کوردێکی دلسۆز و نیشتمانپەروەرە بە توندی دژی داگیرکەران و نۆکەرانی خەبات بکات ..

هەر سەرکەوتوبی شۆڕشی ڕزگاری نیشتمانی کوردوستان
سەرشۆڕی و نەمان بۆ داگیرکەران و نۆکەرو ئەلقە لە گوێکانی

یەکێتی نیشتمانی کوردوستان
کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردوستان
ڕێکخراوی سلێمانی
ساڵی / ١٩٨٣

٤٥

کـــورەك

رێکخراوی سلێمانی

ئەی کرێکاران و گەلانی زۆرلێکراوی جیهان یەکگرن

بەرەو ئەمە پەیدانی کۆمەڵەو یەکگرتنی هێزە رزگاریخوازەکانی گەلەکەمان

لە پێناوی سەرخستنی شۆڕشی رزگاری نیشتمانی کوردستاندا

بۆ / گشت کەرت و پۆل و شانە تێکۆشەرەکانی سنووری چالاکیمان

سلاوێکی شۆڕشگێرانە

هیوادارین هەردەم سەرگەرمی خەباتی بێ ووچان بن .

هاوڕێیانی تێکۆشەر

لەم تەعمیمەماندا تەواوی پوختەی گفتوگۆمان لەگەڵ رژێمی بەغدا بۆ روون دەکەینەوە . تا ئاگادار تان دەکەین لە سەر چونیەتی سەرەتای دەست پێکردنی گفتوگۆ و مرحلەی ئیستاتان بۆ روون دەکەینەوە بەپێی ئەو نووسراوانەی تا ٥ / ١٢ / ١٩٨٣ وە لە ناوەندی بەرێزەوە پێمان گەیشتوە .

رژێمی بەغدا ئەم ساڵ بە درێژی چەند جارێک ناراستەوخۆ بە هۆی لیپرسراوانی ( حدکا ) وە لە وانە د . قاسملو . وە راستەوخۆ بە هۆی هەندێ خەڵکی سەربەخۆی پەیوەندی بە سەرکردایەتیەوە کرد بۆ دەست کردن بە گفتوگۆ و ناردنی وەفدی رەسمی بۆ بەغدا . یا هاتنی وەفدی رەسمی ئەوان بۆ کوردستان وە ئەندی نەرمی و نەرمەی زیاتر لە هەلوێست و قسەکانیاندا بوە لە چاو جارانیدا بەلام لەلایەن سەرکردایەتیمانەوە رەفزکراوە لەو هەل و مەرجەدا .

بەلام لە ناوەراستی مانگی تشرینی دووەمدا و پاش هەڵسەنگاندنی هەل و مەرجی نوێی کوردستان و ناوچە بەگشتی و هەروەها کاولکاری عیراق و ئێران رەچاو کردنی باری عورفی کوردستانی [illegible]. هەڵسەنگاندنی هەمو لایەنەی باری ئیستای کوردستان لەلایەن ئەندامانی سەرکردایەتیمانەوە بریار درا دەرگای گفتوگۆ لەگەڵ رژێم دا بخرێ ....

ئیدی لە دەوروبەری ٣٠ / ١١ / دا رژێم [illegible] د . قاسملو [illegible] دوبارە داوای گفتوگۆی کرد لەگەڵمان دا . سەرکردایەتیش ئامادەیی خویان نیشان دا و هەر لەگەڵ ئەو [illegible] هاوڕێ فریدون لە ٢٢ / ١١ دا بەری کراو چەند خاڵێکی سەرەتایی بۆ کردنەوەی دەرگای گفتوگۆ کردن درایە . لە کوتایی مانگی تشرینی دووەمدا هاوڕێ فریدون گەڕایەوە و ئامادەیی رژێمی راگەیاند بۆ دەستکردن بە گفتوگۆ . لە هەمان کاتدا داوای ناردنی وەفدیان کردبوو هەروەها لە ٨/ ١٢ دا وەفدیکی گەورە بە سەرپەرشتی هەڤاڵ مام جەلالی بەرێز کە پێکهاتبون لە هاوڕێیان ( فریدون . سەلاح موختار . ملازم عمر . سعد کریم . قادری حاجی علی رێکەوت عثمان و هەڤالان د . خدر و هەوکەتی حاجی مشیر ) بەری کران بو بەغدا . تا لەوێ بتوانن هاو ورەیک و بزانن رژێمی بەغدا چی ئەستەمینی . ئەوکاتە لە قوناغی دوایی نرداو پێش بریندەوەی دوا بریار کوبونەوەی فراوانی کادیرانی سیاسی و عەسکەری ( ی . ن . ک ) دەکرێ و دوا بریار لەو روەوە دەدرێ .

رێکخراومان لەم روەوە هەنگاو بە هەنگاو ئاگادارتان دەکاتەوە و گفتوگۆکەی بە هاوڕێیان رادەگەیەنی [illegible] .

بە هەمو ئەندامان و پاڵپوراوان و لایەنگران و دوستان و دڵسوزانمان رادەگەیەنین کە پێویستە لەم هەل و مەرجەی ئیستادا لە کاتێکدا دەرگای گفتوگۆ کردن کراوەیە لەگەڵ رژێم توندتر پارێزگاری پاراستنی نهێنیەکان و [illegible] بکەن و ژێر زەمینی بکەن و نەهێلن گیانی خو دەرخستن و بەرەڵایی و کەم تەرخەمی بەهەرمانەدا زاڵ ببێ . پێویستە مەرکەزیەت و دیسپلینی رێکخستن چاکتر جێ بەجێ بکرێت و ئیلتزامی پێوە بکەن .

پێویستە هەواڵ و بریارەکانی رێکخستن بگەنە سەرپاوەی لیدوان و لیکولینەوەو وەرگرتنی هەلوێست لە هەروەوە داخوازیەین هەر بەشتدار و بوچون و هەڵسەنگاندنێ هەیە لەم روەوە ئاگادارمان بکەنەوە .

بو پێشـــــەوە

رێکخراوی سلێمانی
١٩٨٣ / ١٢ / ٨

ئەی جەماوەری هێژا و بەشەرەفی شارە خۆڕاگرەکەی سلێمانی ،

لەم بارودۆخەدا لە کاتێکدا ئێوەی هێژا و قارەمان جارێکی تریش بە خۆپیشاندان و هاتنە سەر شەقامەکان و بەرزکردنەوەی دروشم بە ژیانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان و هێزی پێشمەرگەی قارەمان و یادکردنەوە و ڕێزلێنانی شەهیدە هەرگیز نەمرەکان ، پشتگیری خۆتان لە شۆڕش و یەکێتیمان نوێ کردەوە ، هەر وەک لە دژوارترین کاتیشدا بە خۆپیشاندان و مانگرتن پشتگیریتان لە داواڕەواکانی بەو پەڕی قارەمانییەوە کردوە ، ئێستاش لە بارودۆخێکی نوێدا کە هێنانەدی ئامانجەکانی گەلەکەمان چارەسەری هێمنانەی بە خۆوە گرتوە پێویستە پشتگیریەکەتان شێوەیەکی ڕێک و پێک و گونجاو لەگەڵ ئەم بارودۆخەدا بە خۆوە بگری و بوار نەدرێت لایەنە تێکدەر و گێرە شێوێنەکان نەخشە گڵاوەکانیان لە تێکدانی یەکێتی ڕیزەکانی گەلدا بهێننەدی .

هەر بۆیە پێویستە ئەم دەست و نەستە پیرۆزەتان لە پاستی لەبەرپرسراوێتی و لە **جوارچێوەی بڕیارەکانی سەرکردایەتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان نەچێتە دەرەوە** وە هەولدەن بە پێڕەوی ئەو ڕێنماییانە بکەن و ئەو دروشمە گونجاو و لەبارانە بەرز بکەنەوە کە یەکێتی ڕیزەکانی گەل دەپارێزێت ، وە لە ڕێکخستنەکانی ( ی . ن . ك ) وە پێتان ڕادەگەیەنرێت داخوازیتان بەوپەڕی جوامێرانەو بەرووتەوە دوور لە هەرەشە کردنە سەر هیچ لایەن و دەستە و تاقمێك و بەو پەڕی هێمنیەوە هەست و نەستی شۆڕشگێڕانەی خۆتان دەربکەن .

سەرکەوتن هەر بۆ هێزی زەوەندەی گەلە ،

یەکێتی نیشتمانی کوردستان
١٢ / کانونی یەکەمی / ١٩٨٢

ئەی کرێکاران و گەلانی زۆرلێکراوی جیهان یەکگرن

کورەك

ڕێکخراوی سلێمانی

بەرەوگەشەپێدانی کۆمەڵەو یەکخستنی هێزە ڕزگاریخوازەکانی گەلەکەمان لە پێناوی سەرخستنی شۆڕشی ڕزگاری نیشتمانی کوردستاندا

بۆگشت کەرت و پۆل و شانە تێکۆشەرەکانی سنووری چالاکیمان

سڵاوێکی شۆڕشگێڕانە

هیوادارین هەردەم سەرگەرمی خەباتی بێ وچان بن .

هاوڕێیانی تێکۆشەر

لە نامەیی پێشووتردا لە چونیەتی و مەرحەلەی گفتوگومان لەگەڵ دەوڵەتدا ئاگادارمان کردن دەست پێدانی ئەوەمان کردبوو کە وەفدێکی یەکێتیمان بۆ بۆئەم مەبەستە چوتە بەغدا .
ئەو وەفدەمان لە چونیاندا چاویان بە لێپرسراوانی دەوڵەت کەوتبوو لێدوانی تەواویان لەسەر ( خطوطی عام ) لەگەڵدا کردبوون ، چوار ڕێبووەیەکی خاڵە سەرەکی و داواسەرەکیەکانیان لەگەڵدا باس کردبوون کە خۆی لە ( سەربەستی، مافی نەتەوایەتی و ڕوشنبیری و کۆمەڵایەتی و ئیداری و دیاری کردنی سنووری ناوچەی کوردستان و چەند خاڵێکی سەرەکی تریدا گرتبووەوە ) لێپرسراوانی دەوڵەت ( مبدئیاً ) لەسەر ئەو خاوەنە هاماتەرازی بوون ، دیارە هەریەکە لەو خاوەنە هاماتەش پێویستی بە شی کردنەوە و لێدوان و توێژینەوەیەکە ئەویش پێویستی بە چەندین کۆبوونەوەو چاوپێکەوتنی ترە .
بۆئەم مەبەستەش وەفدەکەی یەکێتیمان ناوچەی دوکانی دیاری کرد . ڕێکەوتن لەسەرئەوەی لە ٢٢/ ١٢ دا کۆبوونەوەکان لە ناوچەی دوکان دەست پێ بکرێت .

هاوڕێیانی هێژا

لەم ڕۆژانەی پێشوودا جەماوەری قارەمانی شارەکەمان جارێکی تریش پشتگیری خۆیان لە شۆڕش و یەکێتی نوێ کردەوە هەست و نەستی پیرۆزی خۆیان لە شێوەی خۆپیشاندانێکدا نیشاندا ، لە بارودۆخێکی نوێی پێشکەوتندا وەلەم بارودۆخەدا هاوڕێیان پێویستە بە هێمنانەو لێزانانە ئەرك و پێویستییەکانی سەرشانیان بەڕێوە بەرن ، تا بوار نەبێ بۆ لایەنە تێکدەر و گێرەشێوێنەکان کە نەخشە گڵاوەکانیان لە تێکدانی ڕیزەکانی گەلدا جێ بەجێ بکەن بۆیە پێویستە :-

١) جەماوەر ئاگادار بکرێت بە هیچ شێوەیەك هیرش نەکەنە سەر هیچ لایەن و دەستەو تاقمێك و هەست و نەستی پیرۆزی شۆڕشگێری خۆیان هێمنانە دەرببڕن .
٢) ئەندامان و پاڵپشتان و لایەنگران و دۆستان بە هیچ شێوەیەك ڕاستەوخۆ لەم کاتەدا بەشداری خۆپیشاندانەکان نەکەن ، بە هیچ شێوەیەك خۆیان ئاشکرا ناکەن .
٣) پێویستە ڕۆژانە زانیاری گشتی بۆ ڕیزەکانی سەرو بنێرن .
٤) پێویستە هەردەم ئامادەی بڕیاری نوێ بن .

ئیتر بۆ پێشەوە

کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان
٣٠ / ١٢ / ١٩٨٣

ماموستایانی کوردستان ئەمجارەش مەسخەرەی
هەڵبژێرەی " نەقابەی کارتۆنیی ماموستایان بۆچەڵ دەکەنەوە "

لەم ڕۆژانەدا دەزگای کارتۆنی میری بەناوی " نەقابەی ماموستایان " ئاگادارییەکی بڵاوکردەوە لە ڕۆژی ٥ / ١ / ١٩٨٤ هەڵبژاردنی دەستەی تازەی دەکات . ئەمە بەشێوەیەکی کت و پڕو پێش کاتی ئاسایی هەڵبژاردن . وەدوور لە زەمینەیەکی ئازاد و لەبار کە بەشێوەیەکی دیموکراتیانە جەماوەری ماموستایان دەرفەتی دەربڕینی خواستی سەربەست و ئازادی خۆی هەبێ . کەبەشێکی هەموو ماموستایان ئەزانیت بریتیە لە سەپاندنی لیستەی تەنیای کاسەلیسان و خۆفرۆشان وە بۆ داپۆشینی ئاوانی تۆزێک شانۆگەری هەڵبژێرەی بۆ ساز دەکەن کەلە ڕاستیا ئەم جۆرە هەڵبژاردنە لای میللەتیە کارەساتێکی گاڵتەجار و پڕمەسخەرە لەقەڵەم ئەدرێت .

ئەی جەماوەری ماموستایانی کوردستانی هێژا و کۆڵنەدەر

ئاشکرایە کەمافی پێکهێنانی دەزگای پیشەیی دیموکراتی و ئازادی ماموستایانی کوردستان مافی ئاسایی و دانەبراوە لە مافە نەتەوەیی و دیموکراتیەکانی گەلی کوردمان . وە واقعی زەوتکرانی مافە نەتەوەییەکانمان هۆی سەرەکی بوە کە خەباتی ماموستایانمان زۆربەی مێژووی خەباتی بەشێوەی ڕێک خراوێکی نهێنی ( یەکێتی ماموستایانی کوردستان ) لە کوری خەباتی شۆڕشگێڕانەی گەلی کوردمانا بوە . وەلاپەرەکانی مێژووی بەخوێنی چەندەها شەهیدی نەمری تۆمار کردوە کە مایەی شانازی هەمو ماموستایان و جەماوەری گەلی کوردمانن .

هەروەها ئاشکرایە کە ڕویەکی گرنگی زەوتکردنی مافی ئازادی کاری یەکیتی مان داسەپاندنی نەقابەی کارتۆنی دائاشراوی میری بوە کە هەمیشە لەری دەستەیەک کاسەلیسی بودەڵەو خۆفرۆشەوە کە ئەرکی ڕووزەردی تزویری خواستی ئازاد و سەربەستی ماموستایانیان گرتوتە ئەستو . ئەو نەقابە زەردەی وەک ڕووی لەشی باڵەوانەکانی لە سایەی دا هەموو ماف و دەسکەوتێکی پیشەیی و نەتەوەیی و ڕوشنبیری و پەروەردەیی دۆڕا .

هەر لەسەپاندنی بەرنامەی دواکەوتووی خوێندن بە ناوەڕۆکی بۆچەڵ و نەگونجاو شوفینی بەسەر قوتابخانەکانی کوردستاندا هەر لە ڕاگویزانی زانکۆی سلێمانی تا گەیشتە ڕادەی ئەدەمغە کردنی خوێندن بە زمانی کوردی . ئەم کارەسات و ڕوداوە پڕ ستەمانەی بەسەر گەلی کوردماندا هات تەنیا هەڵویستی نەقابەی کارتۆنی ڕووزەرد وەری گرتبێت کاسەلیسی و پڕوسکەی ستایش بەرز کردنەوە بووە .

ماموستایانی هوشیار و بەشەرەف

یەکیتی ماموستایانی کوردستان میراتگری خەباتی نەپساوی پڕ شانازی ماموستایانی کوردستان داواتان لی دەکات کە لەئاستی بەربەرستیاریدا بن وەبەر بەرچی پلان و تزویر کردنی خواستی ئازاد و سەربەستیتان بدەنەوە بە ناوکاری نەکردن و ڕیسوا کردنی ئەو شانۆگەریە ساختەیە ، وە ئیمە یەکیتی ماموستایانی کوردستان بە ناوی ماموستایانی کوردستانەوە بە توندی ئەم کردارە ناوانبار دەکەین ، وەداوای سەربەستی ئازادی کاری

تکایە ←

یەکێتی مامۆستایانی کوردستان دەکەین کە نوێنەری ڕاستەقینەو جێی باوەڕی مامۆستایانە . هەروەها داوای خۆش کردنی زەمینەو بارو دۆخی دیموکراتی دەکەین بۆ ئەنجام دانی هەڵبژاردن . کە هەرگیز لە سایەی ئەم بارو دۆخەی ئێستادا و لەژێر باڵی دەزگا تۆقێنەر و سەداپڵۆسێنەرەکاندا بە ئازادی ناکرێت .

هەروەها بە توندی سەرزەنشتی کاسەلیسی و پوتە پیوانی دەزگای کارتۆنی مەری ڕادەگەیەنین کە هەڵی خۆ ڕاستکردنەوە لەدەست ئەدەن و خۆیان ئەکەنەوە بە ئالەتی تزویری خواستی سەربەستو ئازادی مامۆستایانی کوردستان و خۆیان ڕزگار کەن لەو چارەنووسە ڕەش و پڕ ڕوو زەردەی چاوە ڕوانیان دەکات سەرەڕای نەفرەت و سزای سەختی گەل .

سەرفەرازی بۆ نۆکەران و خوڵقێنەران

سەروەری بۆ شەهیدانی ڕێگای ڕزگاری کوردستان

هەر شەکاوە بێت ئاڵای خەباتی یەکێتی مامۆستایانی کوردستان

یەکێتی مامۆستایانی کوردستان

سکرتاریەت

سەرەتای / کانونی دووەمی / ١٩٨٨

(( ئەی کرێکاران و گەلانی زۆرلێکراوی دونیا یەکگرن ))

ئیمڕۆ لە کوردستانی داگیرکراو و دابەشکراودا لە کوردستانی کلیە ئەشتو ڕەیەریودا
لەگەڵ شاڵاوی کاول کردن و ویران کردندا کرێکاران و زەحمەتکێشانی کوردستان لە ھەل
و مەرجێکی سەخت و دژواردا شان بەشانی ھەموو کرێکارانی جیھان یادی ئەوەی حەوت
ساڵەی ڕاپەڕینی دلێرانەی شاری شیکاگوی ئەمریکا دەکەنەوە کە لە یەکی ئایاری ساڵی
١٨٨٦ نیو ملیون کرێکار ڕژانە سەر شەقامەکانی شارو دەستیان لە کار ھەڵگیرت و
خۆپیشاندانیان سازکرد دژی باری گرانی چەوسانەوەی سەرمایەدارەکان... داوایان کەم
کردنەوەی سەعاتی کارکردنیان کرد بۆ ھەشت سەعات و خۆش کردنی باری گوزەرانیان
سەرمایەدارە چەوسێنەرەکان ئەمەیان بە تاوان لەقەڵەم داو قەسابخانەیان بۆ کرێکارە
شۆڕشگێرەکان دامەزراندو بە ئاگرو ئاسنو فرتو فێل و پیلان ڕابەرەکانیان دەستگیر کراندو
دادگایەکی ساختەیان سازکردو لە ئەنجامدا ( ئوگوست سپێز ) و ( ئەلبێرت پارسۆنز )و
( ئەدۆلف فیشەر ) و ( جۆرج ئەنگڵ ) چوار سەرکردەی ڕابەرەکەیان لە سێدارەدا .
ساڵی ١٨٨٩ لە کۆنگرەی یەکەمی ئینتەرناسیونالیستی دووەم دا لەسەر پێشنیاری ئەڵمانیا،
بڕیاردرا یەکی ئایار بکرێ بە ڕۆژی سەروەری و شاھەنگ گێڕان و خۆپیشاندانی ھەموو
کرێکارانی دونیا .

ئەی کرێکاران و ڕەنجدەرانی کوردستان و عێراق
xxxxxxxxxxxxxxxxxxxxxxxxxxxxxxxxxxxxxxxxxxxxxxx

لەم ڕۆژە پیرۆزەدا یادی ڕاپەڕین و مانگرتنە مەزنەکەی گاوورباغی کرێکارانی کارگەی
نەوتی کەرکوکی ساڵی ١٩٤٦ بکەنەوە .
ڕاپەڕین و مانگرتنی ساڵی ٩٣٠ – ١٩٣١ کرێکارانی ھێلی شەمەندەفەرتان لە یاد بێ .
یادی شۆڕشی ١٩٢٠ دژی داگیرکەری ئینگلیز نوێ کەنەوە .
ڕژێمی دیکتاتۆری فاشی بەعسدا لەناو بەرن ئەو ڕژێمەی لەسەر بناغەی چەوساندنەوەو
خوێن مژین دامەزراوە ... ئەو ڕژێمەی خوێنی سەدان کرێکاری بە ناحەق ڕژاندوە .

ئەی کرێکاران و ڕەنجدەرانی کوردستان
xxxxxxxxxxxxxxxxxxxxxxxxxxxxxxxxxxxxxxxxxxxxxxx

ئەیان ( سپێز و پارسۆنز و فیشەر و ئەنگڵ ) شان لە قەسابخانەی موسڵ و بەغدا
لە سێدارە دراون بۆ ناشە بەردو ئەوەن نەماوە ڕۆلەیەکی قارەمانی گیانبازتان
تێدا شەھید نەکرابێ ... بەئاگا بن و لە دەوری ئالای کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی
کوردستان کۆبنەوە بۆ بەدی ھێنانی پارتی پێشڕەوی چینی کرێکاری کوردستان .
بیری مارکسیزم – لینینیزم چرای ڕوشنکەرەوەی ڕێگای خەباتتان بێ بۆ وەرگرتنی
ماڵە زەوت کراوەکانتان .

بژی خەباتی کرێکاران و گەلانی زۆرلێکراوی جیھان
بژی یەکی ئایار ڕۆژی ھاوکاری و ڕاپەڕینی کرێکارانی جیھان
بژی ئینتەرناسیونالیستی پرولیتاریا

کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان
ڕێکخراوی ٢/ دوو
١ / ئایاری / ١٩٨٣

( لەپێناوی هونەرێکی کوردی رەسەنی هاوچەرخ و پێشکەوتنخوازدا )

هونەرمەندانی تێکۆشەر

لای هەموان ئاشکرایە رژێمە رەفتار تاڵەکەی بەغدا چۆن هەوڵی شێواندن و سڕینەوەی شوێنەواری مێژوو جوگرافیا و کلتور و کەلەپووری نەتەوایەتیەکەمان ئەدات. دەیان پیلانی نایە جێی بۆ ئەم مەبەستە کێشاوە، بەتایبەتی ئەدەب و هونەری رەسەنی کوردیمان هیچ کات لەو پیلانە زەهراویانەی رژێم بێ بەری نەکراون، چەندین نەخشەی نامرۆڤانەیان بۆ هەڵخەڵەتاندن و لە خشتە بردنی هونەرمەندان و شێواندنی شێوازی ئەدەب و هونەری رەسەنی کوردی کێشاوە، ..........

بەڵام هەرچەن هەڵوێستی شۆڕشگێرانەی گەلەکەمان سەرجەم پیلان و نەخشەکانی رژێمی رەگەزپەرستی لە هەموو بوارێکدا تێکشکاندوە، هێز بەو هەوەیەش هەڵوێستی جوامێرانە و دلێرانەی هونەرمەندان و دڵسۆز و نیشتمان پەروەرەکان لەم بوارەشدا هەموو پیلانەکانیانی گۆڕ کردوە و زیرانە هونەرە خاوێنەکەی کوردیان پاراستوە.

ئەی هونەرمەندانی دڵسۆز و نیشتمان پەروەر

رژێمە بیرۆکراتیە راستڕەوەکەی بەغدا جارێکی تریش بۆ هەمان مەبەستی گڵاوی خۆی و بۆ هەڵخەڵەتاندنی هونەرمەندانی کورد و راکێشانیان بۆ پیاهەڵدانی قاسمەی دڕاو و سەرۆکە خوێنڕێژەکەی پیلانێکی نوێتری لە ژێر پەردەی ( تکریم ) کردن و رێزلێناندا کەوتە دابەش کردنی ژمارەی بەسەر هەندێ لە هونەرمەندانی کورددا ١٠٠٠٠ بەڵام با ناڕوونبەختە خۆشباوەڕەکەی رژێمی تاگرو فاشی بەغدا چاک ئەو راستیە بزانن کە هونەرمەندان و رووناکبیرانی کوردستان هەمیشە بەڵێنی دڵسۆزی و وەفاداری خۆیان بۆ پاراستنی هونەری رەسەنی کوردی نوێ دەکەنەوە و زیرانەش ئەم نەخشەو پیلانە زەهراوییەکانی دوژمنان و داگیرکەران پووچەڵ دەکەنەوە.

ئەی هونەرمەندانی دڵسۆز و بەهرەمەندی کوردستان

یەکێتی هونەرمەندانی کوردستان داواتان لێ دەکات لەسەر هەڵوێستی شۆڕشگێرانەتان سوورین و یەکدڵ و یەکگیان بۆ پووچەڵ کردنەوەی ئەم نەخشەو پیلانە ترسناکانەی رژێمی رەگەزپەرستی بەغدا تێبکۆشن، نەفرەتیش لەو هونەرمەندە خۆفرۆش و هەڵخەڵەتاوانە دەکەین کە لە پێناوی مەسرەفی پارەی پیسی دوژمنانی گەل دا ویژدانی هونەری و نیشتمانیان دەفرۆشن و دەبنە بەکرێگیراو و ئەڵقاوی خیانەتکاری و رێگای راستی هونەری و پیرۆزی هونەری رەسەنی کوردی وون دەکەن ..

بەهێزتربێ هەڵوێستی جوامێرانەی هونەرمەندانی کوردستان
سەرشۆڕی و نەمان بۆ دوژمنان و داگیرکەران

یەکێتی هونەرمەندانی کوردستان
ئایاری / ١٩٨[illegible]

# نەورۆز دەگەڕێتەوە رۆژی تێکۆشانی
# جەماوەری و چیوەتی بەخۆ شستەکان دادەدەن

جەماوەرانی بەشەرەف

هەموو سالێك لەم رۆژەدا بانەیەکوانی کوردستان پادی؛ وسەرکەوتنی مەزنی بەدەکەنەوە کە کرێکاران و زەحمەتکێشانی کوردستان لە ئەنجامی ئەو راپەڕینە کارەمانەیاندا بەرابەرا بەدی کاوەی ئاسنگەرو رەنجدەر بە دەستیان هێنا بە تێکۆشانی جەماوەرانە قەلای زۆرداریان رمانــدو کۆتاییان بە حوکمی خوێن مژو چەوسێنەری زوحاك هێنا و مەشخەلی ئازادی، و سەربەستیان لە چیا سەرکەشەکانی کوردستانەوە بەرزکردەوە و رۆژێکی نوێیان بۆ خۆیان و نەوەکانی دوا رۆژ هێنا بەدی .

جەماوەرانی تێکۆشەر

ئێستاش رژێمە رەگەزپەرست و رەفتار فاشیستەکەی بەعسدا زیاتر لە حوکمی خوێن و تاوانــی زوحاك کەوتوتە مژینی خوێنی گەلانی عێراق ، لەوەتا لە ئەنجامی سەپاندنی شەڕی کاول کاریاندا و لە پێناوی خواستە وپێستەکانی خۆیدا رۆژانە سەدان رۆڵەو هەزاران هەزار دیناری عێراقی دەداتە گەرووی ئەژدەهاکی فاشیستی دوراوەکەیدا ، لەسەرئەنجامی بەفیرودان و پەخش کردنی سامانی وولاتەکەدا رۆژ لە دوای رۆژ باری ئابووری روەو رمان دەچێ تا وا زوون دەچێ باری ژیان و گوزەرانی جەماوەر رۆژ لە دوای رۆژ گرانترو دژوارتر دەبێت ، دارودەستە خوێنڕێژە رەگەزپەرستەکەی سەرکوتکەری فەرمانرەوایش لە پێناوی درێژەدان بە حوکمی خۆیدا و هەول دان بۆ پڕکردنەوەی کەلێنە ئابوورییەکانیان کەوتونەتە فرۆشتنی کارگەو کارخانەو کەلو پەلی دائیرەو دەزگاو بانەزراوەکان و دەرکردنی کرێکاران و لە کارخستنی فەرمانبەران و کەم کردنەوەی موچەو رۆژانەیان و باربوکردن و باج وەرگرتنێکی لە رادەبەدەر لە گشت چین و دەستە چەوساوەکان و هەروەها بەرزکردنەوەی نرخی کەل و پەل و پێداویستییەکانی ژیانی کۆمەڵانی خەڵك بە شێوەیەك کە گوزەرانی جەماوەری رەنجدەران و زەحمەتکێشان لە ئاستێکی زۆر نزم و مەترسیداریە ، ئەمانەو چەندین دیاردەی تری کردەوەی دارودەستە خوێنڕێژە رەگەزپەرستەکەی سەدام تکریتی هەندەی تر باری ژیانیان لە بەردەم خەڵکی ناوچەکەدا تال و گران کردوە .

جەماوەرانی کوڵنەدەر

سەرباری هەموو ئەمانە ئەم رژێمە رەگەز پەرست و رەفتار فاشیستەکەی سەدام بەردەوام لــــە کوردستاندا بە ئاگرو ئاسن مامەڵەی تێکۆشەران دەکات و هەر بەوورە لەسەر سیاسەتی رەگەز پەرستانەی خۆی لە کوردستاندا ، لەوەتا لەلایەك بەردەوامە لە دەرکردن و لەکارخستنی کرێکارانی کوردستان و راگوێزانیان بۆ خواروی عێراق و لەلایەکی ترییەوە دەستی کردوتەوە بە بەزۆر بەعسی کردنی مامۆستایان و روناکبیرانی گەلەکەمان بەمەبەستی ئەدواندن و تواندنەوەی مێژو و ئەدەب و روناکبیری کورد . لە بواری خوێندنیشدا بە چارێك مێژوو داستانی پڕ قارەمانێتی گەلەکەمان و جوگرافیای دیارو ئاشکرای نیشتمانەکەمانیان وەلاوە ناوە و خوێندکارانی کوردیان لە راپردوی گەل و نیشتمانەکەیان بێ بەری کردوە .

جەماوەرانی هێزا و سەرکەوتوو

دەبا هەموومان بۆ تەمەنی چەوساندنەوەو هێنانەدی رۆژێکی نوێ و سەندنەوەی مافـــی ئازادی و دیموکراتیکمان رۆژی نەورز بکەینە رۆژی تێکۆشانی بەرزی گەل و تارەزایی و تورەییمان لە دژی رژێمی ئاگرو ئاسن و پیاوکوژ ، و خەباتی جەماوەرانە سازکەین بۆ لەناو بردنی قەلای زۆرداری و زوحاکی سەدەی بیستەم و هێنانە کایەی رۆژێکی نوێی پڕ ئاسودە بــــو گەلەکەمان .

سەرکەوتوو بێ خەباتی شۆڕشگێڕانەی گەل
مردن و سەرشۆڕی بۆ دوژمنان و داگیرکەران

کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان

رێکخراوی سلێمانی

[illegible]

ئەی کریکاران و گەلانی زورلیکراوی جیهان یەکگرن

بەرەو گەشەپیدانی کومەلە و یەکخستنی هیزە رزگاریخوازەکانی گەلەکەمان
لە پیناوی سەرخستنی شورشی روگاری نیشتمانی کوردستاندا

ـــورەك

ریکخراوی سلیمانی

بو / گشت کەرت و پول و شانەکانی سنوری چالاکیمان

سلاویکی شورشگیرانە

هیوادارین هەردەم سەرگەرمی خەباتی بی ووچان بن

هاوڕیانی تیکوشەر

دیارە لە ریکخراوە ئیمەوە ( م.ل ) ە کاندا بە تایبەت لە شیوازی خەباتی نهینی و ژیر زەمینی دا ئەوەیەکە لە پلەکانی ریکخستن دەسەلاتیکی تایبەتی بو دیاری کراوە ۰
کارکردن لەسەروئەو دەسەلاتەی خویەوە وەبە پیراندنی دیسیلین و گوی نەدانە ناوەندیتی ماوەیەکە چەند دیاردەیەکی لەو شیوەیە لە ریزەکانی سنوری چالاکیماندا بەدی دەکری لەوانە ـ

ا ) گورینی ناوی نهینی ئەندامان و پالیوراوان لایەنگران بە ویستی هاوڕیەك یان شانەیەك یان پولیك کە ئەو دەسەلاتە ( واتە ) گورینی ناوی نهینی ئەندامان و لایەنگران و پالیوراوان تەنها لە دەسەلاتی کەرت و ریکخراودایە بویە داواکارین ئاگاداری سەرجەم هاوڕیان و شانەکانی سنوری چالاکیتان بکەن بەبی ئاگادار کردن و رەزامەندی کەرت و ریکخرا و ناوی هیچ ئەندام و پالیورا وو لایەنگریك نەگورن چونکە ئەم کارە بوتە سەرلی شیواندنی هاوڕیانی لیژنەی کەرتەکان و ریکخراومان لە کوکردنەوەی زانیاری لەسەر ئەندامان و پالیوراوان و لایەنگران ۰

ب) ـ وەرگرتنەوەی لیژنە و شانە و بەشەکان لە ریزەکانی خوار و بە هەمان شیوە لە سەر ویست و بوچونی هاوڕیەك یان شانەیەك یان شانەیەکی سەرەکی یان پولیك کە ئەویش بوتە هوی دروست کردنی کیشەی جورا و جور بو ریزەکانی ریکخستن و هەندی جاریش ری دەکەوی کەسانی گونجاو شوینی گونجاویان پی نادری ۰ دیسان لەم رووەوە پیتان رادەگەیەنین ئەو بریارانە واتە وەرگرتنەوەی شانەو لیژنەو بەشەکان تەنها لە دەسەلاتی کەرت و ریکخراودایە و بەبی ئاگاداری و رەزامەندی ئەوان هیچ شیوە بریاریك لەو رووەوە نادریت ۰

پتر بو پیشەوە

ریکخراوی سلیمانی

۵ / ۲ / ۱۹۸٤

# ئافرەتانی کوردستان یادی هەشتی ئازار دەکەنەوە

ئەمڕۆ (١٠٦) هەمین ساڵە بۆ یادی ڕۆژی ئافرەتان لە سەرتاسەری دونیادا دادەگیرێ، ڕوشنایی ساڵێکی تر دەخرێتە سەر خەباتی پڕشکۆی ئافرەتان و ڕۆڵی مەزن و کاریگەریان لەبەرەو پێشەوە بردنی مرۆڤایەتی دا دیارتر دەکات، ڕێبازی خەبات و تێکۆشانی ئافرەتە شۆڕشگێڕەکانی دونیا ڕوناکتر دەکاتەوە، ئەڵقەیەکی تر لە کوت و پابەندی ئافرەتان دەپسێنێ، ئافرەتانی نەتەوەی ژێر دەست و گەلە ستەم دیدەکان بە خەبات و تێکۆشان ئاشناتر دەکات.

ئافرەتانی کوردستانیش، کە هەرگیز دا بڕاوی خەبات و تێکۆشانی پڕ شانازی گەلە چەوساوە و ئاگر و ئاپەش کراوەکەیان نەبون و هەمیشە هاوشان و هاوخەبات لەگەڵ نیوەکەی تری کۆمەڵ بەشداری خەباتی ڕەوای گەلەکەیان کردوە و بەشانازیەوە ڕۆڵی پڕ قارەمانیتی خۆیان لە مێژووی بزوتنەوەی ڕزگاری خوازانەی گەلەکەیاندا دیاری کردوە.

ئەمڕۆش بە شانازیەوە یادی (١٠٦) ساڵەی ڕۆژی ئافرەتانی جیهان دەکەینەوە و سەری ڕێز و نەوازش لەبەردەم قارەمانیتی شەهیدان خوشکە لەیلا و سەنەوبەر و عەینە و دەیان شەهیدی تردا دادەنەوێنین و مەدالیای شکۆمەندی و مەزنیش بە بەشەی سەدان ئافرەتی تێکۆشەر و شۆڕشگێڕی تری هەمان ڕێباز دا هەڵدەواسین.

مەزن تریی خەباتی ئافرەتانی کوردستان

ڕێکخراوی سلێمانی

کەرتی شەهید لەیلا

٨ - ئازار - ١٩٨٢

ئەی جەماوەری بە شەرەفی کوردستان
ئاشکرایە هونەرمەندانی کورد هەمیشە ڕۆڵی دڵسۆزی ئەم نەتەوەو خاکەبوون وخۆیان بەویژدانی میللەت زا
نیوە ، بۆیە چ بەگوفتار وچ بەرەفتار وکردار وبەرهەمەکانیان بەخزمەتکردنی ئامانج و ئاواتی میللی کورد
تەرخان نەکردووە و لەدژوارترین ڕۆژگاری مێژووی ئەم نەتەوەیەشدا لەسەنگەری کوڵنەداندا بوون لەبەرەی نەتەوەکە
یان بوونەوەشبوون وئاوات و ئێش وئازاری نەتەوەکەیان جاوگی ڕاستەقینەی بەرهەمی هونەریان بووە .
ئاشکرایە دوژمنانی گەلەکەم هەڵوێستەی هونەرمەندانیان پێناخۆش بووەو سەغڵەتی کردوون بۆیە چەندەها جۆرا و
جۆر بەشێوەی چەوساندنەوە و ئوفاندنیان بەتەماع خستنیەر ویستویانە سەنگەری نیشتمانپەروەری هونەرمەندان
چۆڵبکەن و بیان خەنە ژێر ڕکێفی خۆیان ، بەڵام هونەرمەندانی ئازا ونیشتمانپەروەری کوردستان هەموو ئەم
پیلانانەیان پووچەڵ کردەوەو پاشان لەوانە بەرامبەر هەموو هەڕەشەو گوڕەشەی دوژمنانیان وەستان و سووربوون لەسەر هەڵو
ێستی نیشتمانپەروەرانەی خۆیان و بەرهەمەکانیان زیاتر لەناو دڵ و دەروونی جەماوەری کوردستاندا ڕەگیداکو
تاوە و هونەریان وەکو چەکێکی کاریگەر خستوەتەکار بۆ خزمەتکردنی ئامانجە پیرۆزەکانی نەتەوەی کوردمان .
ئەی نیشتمانپەروەرانی کوردستان
ئالەم ڕۆژانەدا کەتێکرا هونەرمەندانی جیهان بەبۆنەی ئاهەنگەکانی ڕۆژی هونەری جیهانەوە ، بەئازادی وسەربە
ستیەوە بەرهەمی خۆیان پێشکەش دەکەن و بەئازادیەوە بیروڕای خۆیان دەردەبڕن وگوڵی ڕێزلێگرتن و مەدالیای
ئافرین بەخۆیان دەڕازێنێتەوە . ئالەم ڕۆژانەدا هونەرمەندانی کورد لەلایەن لێپرسراوێکی ئاسایشی میریە
وەلەبری ڕێزگرتن وئافرین تۆمەتی پەلاماردان وتێیان دەکەن وگواستنەوەودوورخستنەوەیان بەتایبەتی ئالەم
بارودۆخەی ئێستای کوردستاندا .. دیارە ئەم کارە ناڵەبارانەی ئەوچەند لێپرسراوە هەڵپەرست وگومڕایانە
بەهیچ جۆرێک خزمەتی یەکیتی نیشتمانی عیراق ناکات و لەگەڵ ئەم بارودۆخەی ئێستای کوردستان ناگونجێ
و دەیانەوێ ڕیزەکانی گەل تێک بدەن و ئاژاوە بنێنەوە چونکە ئەم بارودۆخە نوێیەی کوردستان لەگەڵ ئارا
ستەی بەرژەوەندی تاکەکەسی و تایبەتی ئەوان ناگونجێ بۆیە هەوڵی تێکدانی وەزعەکە ئەدەن بەتایبەتی لە
ڕێی پەلاماردانی هونەرمەندانی نیشتمانپەروەر .
یەکێتیمان یەکێتی هونەرمەندانی کوردستان کەخۆی بەنوێنەری ڕاستەقینەی هونەرمەندانی کوردستان دەزا
نێ و ئەرکی داکۆکی کردنی لەهونەرمەندانی دەکەوێتەئەستۆ ناتوانێ بەرامبەر ئەم تاوانانە بێدەنگ بێت
بەڵام لەڕوانگەی هەست پێکردنیە بە لێپرسراوی و لە پێناوی ئەوەی دەست پێشکەری لە تێکدانی ئەم بارو—
دۆخەی نەکات و توشی ئەوداوە نەبێت کە ئەوکاربەدەستانە دەیانەوێت ئەویش نانەوەی ئاژاوەو ناخۆشیە .
بە پەنوی ئارامیەوە داوی بەخۆدا گرتوە و داوا لەهەمو لایەنێک دەکەین بە پەلە هەنگاو بنێن بۆ ڕاگرتنی
ئەم کارە ناڵەبارانەو گێڕانەوەی هونەرمەندان بۆ شوێنی خۆیان و سزادانی ئەو کەسانەی بەم تاوانە
هەڵساون و ئەگینا ئەگەر بێت ئەم کارانە هەروا بەردەوام بێت ناچار دەبین هەروەک کورد ئەڵی (( جام
کە پڕبوو لێی ئەڕژێ )) ناچار دەبین ئێمەش لەلایەن خۆمانەوە بەرەنگاری ئەو تاوانبار و تاوانانە ببینە
وە ئەنجامیش هەرچیەک بێت ئەوا ئێمە بەرامبەری لێپرسراو نین .
ئەی جەماوەری بەشەرەفی کوردستان ....... ئەی نیشتمانپەروەرانی کورد ........ ئەی ئەدیبان و
ڕوناکبیرانی کورد ......... ئەی ماموستا دڵسۆزەکان ......... قوتابیانی ئازا و نەبەرد . پشت
گیری و هاوکاری هونەرمەندانی نیشتمانپەروەرانی خۆتان بکەن و بۆ ئەوەی چیتر بوار نەدەین ئەو هەڵپەر
ستانە درێژە بەکاری نامرۆڤانەیان بدەن .
دەبا هەمو پێکەوە بەیەک دەنگ بەیەک هەڵوێست بین بۆ ڕیسواکردنی هەڵوێستی ئەوتێکدەروگێرەشێوێنانە .

پیرۆزی و شکۆمەندی بۆ ئەو هونەرمەندانەی لە پێناوی پاراستنی هونەری کوردی ڕەسەن
وەکو چیا سەرکەشەکانی کوردستان ڕوو بە ڕووی دوژمنان دەوەستن .

ڕیسوایی و سەرشۆڕی بۆ ئەوکەسانەی دەیانەوێ هونەری کوردی ڕەسەن لەڕێڕەوی ڕاستەقینەی
خۆی لابدەن .

هەربژی هەڵوێستی خۆڕاگری هونەرمەندانی کورد .

یەکێتی هونەرمەندانی کوردستان

کومیتەی باڵا

١٩٨٨ / ٢ / ٢١

٦

# هەڵوێستی خوێندکارانی زانکۆی موصل

# سەبارەت بە

# چارەسەرنەکردنی کێشەی خوێندکاران و بەزۆرچەکدارکردنیان

خوێندکارانی کوردستان وەکو توێژێکی رۆشنبیر و وریای گەلەکەمان هەمیشە مایەی شانازی و سەربەرزی بوونە ، لە ئاستی هەمو رووداوێک دا خاوەن هەڵوێستی جوامێرانە بوونە و هەردەم قازانج و بەرژەوەندی خۆیان خستۆتە لاوە ئەگەر لەگەڵ رێبازیان دا نەگونجابێت ، هەر بۆیەش دژی بە زۆر چەکدار کردن وەستاون و زۆربەیان دەستیان لە خوێندن هەڵگرتوە و داوای هەڵوەشاندنەوەی ئەو بڕیارە نارەوایە ئەکەن کە ئەیانەوێ بەزۆر بەسەریان دا بسەپێنن .

هەروەکو ئاشکرایە ماوەیەک لەمەوبەر میری هەوڵێکی زۆری دا بۆ ئەوەی خوێندکارانی زانکۆی راگوێزراوی سلێمانی و ئامۆژگای تکنۆلۆجیای کەرکووک بکات بە "جیش شعبی" و لە پێناوی بەدیهێنانی ئەم مەرامەش ژمارەیەکی زۆری خوێندکارانی لە خوێندن دەرکرد و لە ئەنجام دا هەمو خوێندکارانی زانکۆی ناوبراو دەستیان لە خوێندن هەڵگرت و رویان کردەوە شارەکانی خۆیان و تاکو ئێستا کێشەکەیان بێ چارەسەرکردن ماوەتەوە .

خوێندکارانی زانکۆی موصل لە ئەنجامی ئەم کارە نارەوایە وهێشتنەوەی کێشەی هاوڕێکانیان بێ چارەسەرکردنێکی راست بڕیاریان دا پشتگیریان لێ بکەن و لە رۆژانی ٢-٨/٥/١٩٨٤ مان بگرن لەناو زانکۆدا لە پاشان دا لە رۆژی ٩/٥/١٩٨٤ ـەوە روویان کردەوە شارەکانی خۆیان و زانکۆیان بەجێهێشت بۆ ئەوەی دەنگی نارەزاییان تێکەڵ بە دەنگی هاوڕێ دەرکراوەکانیان لە زانکۆی راگوێزراوی سلێمانی بکەن و ئەو راستییە بسەلمێنن کە خۆبێدەنگ کردنی میری لە ئاست کێشەی خوێندکاران ئەنجامەکەی باش نابێت و کێشەکە زیاتر قوڵ ئەبێتەوە ، ئێمە پێمان وایە جێبەجێ نەکردنی داخوازییە رەواکانی خوێندکاران و سوور بوونی میری لەسەر ئەم هەڵوێستە نەک ناتوانێت مل بە خوێندکاران کەچ بکات بۆ داوا نارەواکانیان ، بەڵکو ئەبێتە هۆی ئەوەی کە خوێندکاران زیاتر سوور بن لەسەر هەڵوێستی شۆڕشگێرانەیان و دژی هەمو جۆرە بڕیارێکی ناراست بوەستن ، بۆیە بە ناوی یەکێتیمانەوە ( ی.خ.ک.ع ) نارەزایی خۆمان دەرئەبڕین و داواکارین هەرچی زووە ئەم مەسەلەیە بە شێوەیەکی عادیلانە چارەسەر بکرێت و واز لە خوێندکاران بهێنن، چی‌تر داوای بەزۆر چەکدار کردنیان نەکەن چونکە ئەمە لەگەڵ رێبازی خوێندکارانی کوردستان دا ناگونجێت .

یەکێتی خوێندکارانی کوردستان ـ عێراق
لقی موصل ١٠/٥/١٩٨٤

هاوولاتیانی بەڕێز

خوێندکارانی کوردستان لە رووی دەرکردنیاندا ڕێگەو هەمووی هێمنانە و دوور لە ئاژاوەیان هەڵبژارد بۆ دەربڕینی نارەزایی خۆیان وە بە أصولی داوای ئەلغای بڕیاری دەرکردنی خۆیان دەکەن . کەچی ئەوە لەلایەن هەندی لایەنەوە خراپ لێکدراوەتەوە و کراوەتە مشاهرە و هەمووی توند و تیژ . کەچی بێ گومان ئەوە هەم زیان لە کۆمەڵانی خەڵک و هەم زیان بە مەسەلەی خوێندکاران دەگەیەنێ وەلە خوراییی خوێنی رۆڵەکانمان ئەرژێ . وەك لەم دوو رۆژەدا رووی داوە بەناو ئەداتە دەست خەڵکی داخ لەدڵ کە دەست لە رۆڵە کانمان بوەشێنن بۆیە ئێمە بەناوی یەکێتی نیشتمانی کوردستانەوە داواتان لێ ئەکەین لە سەر جادەکان کۆڕ و کۆمەڵ مەبەستن و بەشداری مشاهرە مەکەن و ڕێگا بەکاری سەرپێلی و توند و تیژی مەدەن چونکە لەم هەل و مەرجەی کوردستاندا ئەوکارانە بە زیانی خەڵکی کوردستان دەگەڕێتەوە وەهەر دوژمنانی گەل و نیشتمان سوودی لێ وەر دەگرن . تکامان وایە لە مشاهرات و کاری توند و تیژ دوور بکەونەوە و دەرفەت بدەن یەکێتی نیشتمانی کوردستان کە ئەو مەسەلەیەی خوێندکاران لە چوارچێوەی مالەرەوا - کانی گەلەکەماندا چارەسەر بکات .

یەکێتی نیشتمانی کوردستان
١٤/ ٥/ ١٩٨٤

# بیاننامەی

# کۆبونەوەی خوێندکارانی زانکۆی صلاح الدین

خوێندکارانی خۆشەویست !

رابەڕین لە رووی زوڵم و چەوسانەوەدا نەریتێکی خۆڕاگرانەی میللەتەکەمان و هۆی سەرەکی مانەوەیەتی ، هەرواش خوێندکارانی کوردستان ئەو نەریتەیان کردۆتە یەکەمین وانەی خۆڕاگرتن لە رووی هەڕەشەوگوڕەشەی ئەو داودەزگایانەی کەوتونەتە داپڵۆسین و لەقاڵبدانی خوێندکارانی کوردستان بۆ ئەوەی لە جوڵانەوەی شۆڕشگێڕانەی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستانیان دابڕن یان بە زۆر بیانکەن بە "جەیشی شەعبی" و "بەعسی" .

خوێندکارانی کوردستان ئەمجارەش ئەو راستیە گەشەیان سەلماندەوە کە هەڕەشە و زۆرلێکردن سەری بڵندیان بۆ شۆڕ ناکا . بۆیە بەیەکدەنگ هەمو دژی سیاسەتی بەزۆر بە "جەیشی شەعبی" و "شەعق پێکردن" وەستان و سیاسەتی بە "بەعسی کردنی" زۆرەملێ یان رەتکردەوە . وە کە رژێم کەوتە گیانی خوێندکاران و زیاتر لە ٢٠ خوێندکاری لە زانکۆی صلاح الدین و لەو ژمارەیەش زیاتر خوێندکاری لە پەیمانگای تکنۆلۆجی کەرکوک دەرکرد ، ئەوسا سەرجەم خوێندکارە کوردەکانی زانکۆ دژی ئەو رەفتارانەیان مانیان گرت و هۆڵەکانی خوێندنیان بەجێ هێشت ، وە تا ئەمات ، عان بەهعاگی توندوتیژ بونی چەوسانەوە بێزاری و تینی خوێندکارانیش بەرەی ئەمەند و روو لە هەڵچون بو و بەرگری و خۆڕاگرتنیش قایمتر ئەبو .

ئەنجا بۆ ئەوەی کە رووبەڕووبونەوەی چەوسانەوە و زۆرلێکردن رێکوپێک و گونجاو بێ و هەلومەرجی ئێستای کوردستان رەچاو بکا و دووچاری کارتێکردنی لایەلا و سەرچڵی نەبێت ، یا ، لەناوشەدی رێگادا خاو نەبێتەوە و لاواز نەبێ ئەمڕۆ لە کۆبونەوەی بەشێکی خوێندکارانی کۆلیجەکانی زانکۆی صلاح الدین لە کۆڕێکی خوێندکاراندا هەنگاوێکی بالاتر و رێکوپێکتر بۆ جوڵانەوەی خوێندکارانی زانکۆ داڕێژرا و شێوەی رووبەڕووبونەوە دیارکرا و ئەم داخوازیانەش بڕیاردران :

١ ـ نەهێشتنی "تدریب"ی زۆرەملێ ، وە دەستهەڵگرتن لە هەڕەشە و ناچارکردنی خوێندکاران بۆ بوون بە "جیش شعبی" ٠

٢ ـ گەڕاندنەوەی ئەو خوێندکارانەی بەهۆی ڕەتکردنەوەی "تدریب"ی زۆرەملێوە دەرکراون لە هەمو پەیمانگاکان و زانکۆی صلاح الدین دا ٠ و لابردنی بڕیاری دەرکردنیان ٠

٣ ـ گێڕانەوەی ئەو مامۆستا و فەرمانبەرانەی زانکۆ بۆ سەرکارەکانیان کە بە هەمان بڕیاری ڕەتکردنەوەی "تدریب"ی زۆرەملێوە دەرکراون ٠

٤ ـ حساب نەکردنی ئەو (غیابات)ەی کە بەهۆی پەیدابونی ئەم کێشەیەوە لە سەر خوێندکاران تۆمار کراوە ٠

٥ ـ دووبارەکردنەوەی ئەو تاقیکردنەوانەی بەهۆی پەیدا بونی ئەو کێشەیەوە لە کیس خوێندکارانی زانکۆی صلاح الدین چوە ٠

٦ ـ ڕێگەنەدان بە هیچ مامۆستا و لایەنێک کە مانگرتن بکا بە بیانویەک تا داخی دڵی خۆی بە خوێندکاران بڕێژێ و هەوڵبدات بە شێوەیەک لە شێوەکان تۆڵەیان لێ بکاتەوە ٠

هاوڵاتیانی بەڕێز !
خوێندکارانی خۆشەویست !

لەکاتێکدا کە ئەوە هەڵوێستی هەزاران خوێندکاری کوردستانە و دەیان خوێندکار و مامۆستا و فەرمانبەری کورد لەسەر ئەو هەڵوێستە جوامێرانە لە کارو لە خوێندن دەرکراون ، ئەرکی سەرشانی هەمو کوردێکی دڵسۆزە کە بەدەنگمانەوە بێت و پشتگیری هەڵوێست و داخوازییەکانمان بکا تا هەرگیز گیانی سەرشۆڕکردن لە کۆمەڵەکەمان دا جێی نەبێتەوە ، تا سنورێک بۆ ئازاردانی خوێندکارانی کوردستان دابنرێ ، بۆیە داوا لە هەمو لایەنە سیاسیە نیشتمانپەروەرەکان و لە هەمو ڕێکخراوە دیموکراتی و پیشەییەکانی کوردستان ئەکەین و داوا لە خوێندکارانی عەرەبی برا ئەکەین هاوکاریمان لەگەڵ بکەن و پشتیوانی جوڵانەوەکەمان بکەن ٠

ئیتر هەر سەرکەوتو بێت تێکۆشانی یەکگرتووی
خوێندکارانی کوردستان لە پێناوی داواڕەواکانی دا !

کۆبونەوەی خوێندکارانی
ڕۆژی ٣٠ / ٤ / ١٩٨٤

٣٠ی نیسانی ١٩٨٤

# بەیاننامەی یەکێتیی خوێندکارانی کوردستان ـ عێراق
# بەبۆنەی بەزۆر چەکدارکردنی خوێندکارانەوە

یەکێتی خوێندکارانی کوردستان وەکو پێشڕەوی یەکێ مێژوویی لە خەبات و ئاوات و دەسکەوتەکانی خوێندکارانەوە هەڵقوڵاوە، لە ئەنجامی یەکگرتنی شارەزوورمەندانەی خوێندکاران لەبۆ هاتنەکایەوەی نوێنەری ڕاستەقینەی خوێندکارانی کوردستان لە پێناوی داکۆکی کردن لە مافە زەوت کراوەکانیان لە دایک بووە، هەربۆیە یەکێتیمان خۆی بە نوێنەری ڕاستەقینەی خوێندکاران زانیوە و لە هەموو بۆنەیەکدا بەپەنای [illegible] کردوتەوە کە بەهیچ جۆرێک لە بەرژەوەندی ئەوان دەرنەچووە و هەمیشە خەبات دەکات لە پێناوی بەدی هێنانی ئاواتی لێبڕاوەی خوێندکارانی ستەم دیدەی کوردستان .

بێ گومان هەموو خوێندکاران ئاگادارن لەو ڕەفتارە نابەجێیەی کە ماوەیەکە دژیان دەکرێت و داوایان لێ دەکەن کە بەزۆر چەک هەڵبگرن، لە پێناوی ئەنجامدانی ئەم کارە نامەردی چەندەها ڕێگەی نایاسایی گرتۆتە بەر، وەکو ئەوەی سەرپەرشتیان دەکات و خوێندکارانی دوا قۆناغی خوێندن لەمەسەلەکە دەردەکات و سەرباری دەرکردنی هەندێک لە خوێندکار لە خوێندن دەدات بە مەرجێک هەموو خوێندکاران هەمان هەڵوێستی ئەوانیان هەبێ، هەموو ئەو ڕێگایانە بەکار دێنێت لە پێناوی ئەوەی هەڵوێستی یەکگرتوانەی خوێندکاران تێک بدات و بەڵام ئەوبێت بەدەنگ نەبن بەرامبەر ئەم کارە نارەوایە .

یەکێتی خوێندکارانی کوردستان دژی بەزۆر چەکدار کردنی خوێندکارانی کوردستانە لە زانکۆی ڕاگوێزراوی سلێمانی و هەموو زانکۆ پەیمانگاو خوێندنگاکان لە ژێر هەر ناوێکدا بێت، ئەگەر ( جیش الشعبی ) یاخود ( تدریب علی السلاح ) بێت، پشتگیری لە هەڵوێستە قارەمانانەی خوێندکاران دەکات کە بەتوندی دژی ئەم بڕیارە وەستاون و داوایان لێ دەکات کە بەردەوام بن لەسەر هەمان هەڵوێست و بەیەک دەنگ بەرامبەر ئەم بڕیارە بوەستن .

ئەی خوێندکارانی هێژا و خۆراگر :

بەناوی یەکێتیمانەوە داواتان لێ دەکەین کە دەستەوەستان مەوەستن بەرامبەر بە دەرکردنی هاوڕێ کانتان لە خوێندن .

بەڵێ بگرن چەک هەڵنەگرن بەردەوام بن لەسەر ئەو هەڵوێستە پۆڵاینەتان تا وەکو بڕیارەکە پووچەڵ دەبێتەوە .

ئەنجومەنی سەرکردایەتی
یەکێتی خوێندکارانی کوردستان ـ عێراق
١٩٨٤/٤/٢٧

# بەیاننامەی یەکێتی هونەرمەندانی کوردستان

ئەی جەماوەری بەشەرەفی کوردستان !
هونەرمەندانی تێکۆشەر و بەوەفا !

لە کاتێکا وڵات بە بارودۆخێکی پڕمەترسی و ناسکدا تێدەپەڕێ و جەماوەری ستەمدیدەی کوردستان بە هیوای کۆتایی هێنان بە گشت ئەشکەنجەکانی جەوییانەوە و گەیشتن بە ئاواتە پیرۆزەکانیتی وە هێنانەکایەی زەمینەیەکی لەبار و نوێ کە مافە دیموکراسی و نەتەوایەتییەکانی تێیدا بپارێزرێ . بەڵێ لەم کاتە ناسکەدا کە **پێویستی بە هێمنی و** ئاسایش هەیە لە لایەن کۆمەڵێ کاربەدەستی هەلپەرست و کاسەلێس **و داخ لەدڵ کە تەنها** مەبەستیان ئاژاوەنانەوەیە وگێرەشێوێنییە کەوتونەتە ناڕەتن و **سازدانی پیلانی نا**ڕەوای جۆراوجۆر دژ بە جەماوەری کوردستان بە تایبەتی لەم **کاتەدا کە بەهیچ جۆرێک** حورمەتی یەکێتی نیشتمانی عیراق ناکات یا لە ژێر هەر ناوێک و بەرەیەکدا **بێت.**

ئەوەتا ئەو گێرەشێوێنانە و خۆپەرستانە کە دوورن لە خزمەتکردنی گەل و وڵات ، **تا** دوێنێ ئامەردانە پەلاماری هونەرمەندە دڵسۆزەکانیان ئەدا **و** دوریان ئەخستنەوە **لە** کاری هونەری و بێ شەرمانە ئەیانگواستنەوە بۆ شوێنی دوور و هەڕەشەیان لێ ئەکرد و ئەترسی گەورەیان ئەخستە بەر ، ئەیانویست بە خەیاڵی خاویان سەر بە هونەرمەندان نەوی بکەن و ڕێبازی شۆڕشگێڕی و وەفاداری **و** دڵسۆزیمان بۆ گەل **و** نیشتمان لاواز بکەن .

وا دیسانەوە ئەو هەلپەرستانە بێشەرمانە کەوتونەتە گیانی خوێندکارانی کوردستان و دوچاری پەلاماردان **و** فصل کردنیان کردوون و ناڕەوانە ڕەفتاریان لەگەڵ دەکەن بە زۆرەملێ و خورتی خامەی دەستیان بێ قرتێ ئەدەن و ئەیانەوێ چەکیان بۆ بخەنە شان و بە ناوی جیش شعبی و بەو جۆرە خوێندکارە دڵسۆزە شۆڕشگێڕەکان لە پیرۆزترین مافی دیموکراسی خۆیان بێ بەش بکەن وە بە تایبەتی لەم ڕۆژانەدا کە تاقیکردنەوەکانی کۆتایی ساڵ نزیک بۆتەوە .

**ئەی هونەرمەندانی هێژا !**

**ئاشکرایە خوێندکارانی کوردستان هەمیشە ڕۆڵەی دڵسۆز و بە وەفای ئەم نەتەوە و خاکە بون و هەمیشە لە ریزی پێشەوەی سەنگەری نیشتمانپەروەری و قارەمانێتی بوون و قەڵغانێکی پۆڵایین بوون لە گشت ڕاپەڕین و بزوتنەوەی شۆڕشگێڕانەی نەتەوەکەمان بۆیە پێویستە و ئەرکێکی مێژوییە بە هەمو کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان بە جیاوازی بیروڕایان پشتگیری تەواوی مانگرتن و مافە ڕەواکانی خوێندکارە دڵسۆزەکانیان بکەن ، بۆ جێبەجێ کردنی گشت داواکاریە ڕەواکانیان .**

**ئەی جەماوەری بەشەرەفی کوردستان !**

**یەکێتیمان ، یەکێتی هونەرمەندانی کوردستان ، بە ناوی هەمو هونەرمەندانی کوردستانەوە پشتگیری تەواوی خۆی ئاشکرا دەکات لە هەڵوێست و مانگرتنی هێمنانەی خوێندکاران و دەنگ و هەڵوێستمان لەگەڵ دەنگ و هەڵوێستی خوێندکاران دایە بۆ جێبەجێ کردنی داواکاریە ڕەواکانیان و بە توندی ناڕەزایی خۆمان دەردەبڕین بەرامبەر بە فصل کردن و پەلاماردانی خوێندکاران بە گشتی و خوێندکارانی زانکۆی سەلاحەدین بە تایبەتی . لە هەمان کاتدا داوا لە دەزگا لێپرسراوەکانی دەوڵەت دەکەین کە بە زوترین کات خوێندکارانی دەرکراو بگەڕێننەوە سەر خوێندنی خۆیان و هەمو کارێکی ناڕەوای خۆیان بەرامبەر خوێندکاران ڕابگرن . چونکە هەمو لێپرسراوێتیەکان لە ئەستۆی ئەوان دایە .**

**دەبا یەکگرتوبێت خەباتی ڕێکخراوە پیشەییەکانی کوردستان !**
**دەبا سەرکەوتو و یەکگرتو بێت خەباتی خۆڕاگرانەی خوێندکارانی کوردستان لە پێناوی بەدیهێنانی مافە ڕەواکانیان !**

**یەکێتی هونەرمەندانی کوردستان**
**کومیتەی باڵا**

**١٢ / ٤ / ١٩٨٤**

# بەیاننامەی خوێندکارە مان گرتووەکانی کوردستان

هاو ولاتیانی بەڕێز !
خوێندکارانی خۆشەویستی کوردستان !

تا ئێستا زیاتر لە ١٠٨ خوێندکاری زانکۆی سەلاحەدین لە خوێندن دەرکراون ، بە هۆی ئەوەی کە قابیل نابن ببن بە "جیش شعبی" و رازی نابن "تدریب" ی زۆرە ملێ بکەن ، بەو جۆرەش دەیان خوێندکاری کورد لە زانکۆی موصل کەوتۆتە بەر مەترسی دەرکردن ، و دەیانیتریش لە خانەی مامۆستایان و پەیمانگاکان بە هەمان بیانوو...

دیارە ئەو سیاسەتە کە روو لە چۆلکردنی زانکۆکان ئەکا لە رۆلەی کورد و مەبەستی ئەوەیە کورد لە خوێندن بێ بەری بکات ، دیمەنێکی چەوسانەوەی خەلکی کوردستانە ، بۆیە بێزاریەکی زۆری لەنا و کۆمەلانی خەلکی دا بلاو کردۆتەوە .

ئێمەی خوێندکارانی زانکۆی سەلاحەدین پاش ئەوەی کومیتەیەکی سەرپەرشتیمان پێکهێنا بە رێگەی هێمنانە و پەسند ، زۆرمان تەقەلادا کە کێشەی خوێندکارە دەرکراوەکان بە رێگەی گفتوگۆ و هێمن چارەسەر بکرێ ، لەبەر ئەوە وەفدێکمان لە ٢١/٤/١٩٨٤ دا لەگەل لێپرسراوانی حیزبی بەعسی هەولێر و زانکۆدا کۆبوورەوە و داخوازیەکانی خوێندکارانی خستە بەر چاویان ، کەچی پشت گوێ خرا ... پاش ئەوەش لە ٢٧/٤/١٩٨٤ دا وەفدێکی ترمان چوە لای لێپرسراوانی بالای حیزبی بەعس لە کەرکووک ، لەگەل ئەوەدا گەلێ بەلێنی خۆشیان پێدابین بەلام لەبری ئەوەی ئەو بەلێن و گفتە پێتەدی و خوێندکارە دەرکراوەکانی زانکۆی سەلاحەدین بگەرێنەوە وا هەرەشە لە قوتابیە کوردەکانی زانکۆی موصل ئەکەن ، چونکە جوامێرانە و بەیەک دەنگ هەلسان بە پشتیوانی کردنی خوێندکارەکانی زانکۆی سەلاحەدین ، و چارەنووسی خۆیان بەستەوە بە چارەنووسی ئەوانەوە ... ئێمەش بە چاوی رێزەوە تەماشای هەلوێستیان ئەکەین ، هیواداریـن هەمیشە سووربن لەسەر ئەو هەلوێستە بەرزەیان تا خەباتی یەکگرتووی هەموو خوێندکارانی کوردستان بە مافە رەواکانی خۆیان ئەگەن .

هاو ولاتیانی بەڕێز !
خوێندکارانی کوردستان !

وا سالی خوێندن بەرەو کۆتایی ئەچێت و برا خوێندکارەکانمان ئەوی دەرکراوە ، بێ بەری ئەکرێ لە خوێندن ، ئەوەش کە ماوە بەهۆی پشتیوانی کردن لە براکانی تریانەوە ، بە ( غیابات ) هەرەشەی دەرکردنیان لێ ئەکرێ ... دیارە خەلکی کوردستان رازی نابن رەنجی چەن سالەی رۆلەکانیان بە فیرۆ بچێ ... بەبەر چاوی ئەوانەوە دەستە دەستە دەربکرێن بۆیە پاش مانگرتنی چەن رۆژەی خوێندکاران ئێستا رووی دەمان ئەکەینە کاسبکارانی کوردستان بۆ پشتگیری لە رۆلە و کەسوکارە خوێندکارەکانیان وە رۆژی یەکشەممە رێکەوتی ١٣/٥/١٩٨٤ بکەنە رۆژی مانگرتنی سەرانسەری لە کوردستاندا وە دوکان و بازاڕ دابخرێ و کرین و فرۆشتن بوەستێ ، هەروەها داوا لە هەمو لایەنە سیاسیە نیشتمانپەروەرەکان و رێکخراوە دیموکراتی و پیشەییەکانی کوردستان ئەکەین کە لەم رووەوە پشتیوانیمان بکەن چونکە ئێمە لەو باوەڕەداین کە هەر جەماوەرە پشتیوانی سەرەکی ، هەر ئەوان ئەتوانن دژی هەمو جۆرە زولم و ستەمێك بوەستن و بەرگریمان لێ بکەن بۆ وەدیهێنانی مافی رەوای خۆمان کە خوێندنە بە سەربەستی و گەیشتنە بە ئاواتی دێرینمان .

ئیتر هەر سەرکەوتو بێ هێزی لەبن نەهاتووی
جەماوەر و بەهێزتر بێ خەباتی یەکگرتوی خوێندکاران !

کومیتەی سەرپەرشتی
٩/٥/١٩٨٤

# بەیانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان

## بە بۆنەی شەهیدبوونی هەڤاڵی تێکۆشەر

## مامۆستا جەمال تاهیرەوە

هەڤاڵانی خەباتگێڕ، ئەندامان و لایەنگرانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان
هەڤاڵانی تێکۆشەر، پێشمەرگە قارەمانەکانی هێزی پێشمەرگەی کوردستان
هاووڵاتیانی بەڕێز
خوشک و برایانی خۆشەویست :

کومیتەی سەرکردایەتی یەکیەتی نیشتمانی کوردستان بەداخ و بەزارەیەکی زۆرەوە هەواڵی شەهیدبوونی ئەندامێکی ژیرو کارا و لێهاتوی خۆیمان پێ ڕاگەیەنێت ، ئەویش مامۆستا جەمال تاهیرە . کە سەد مخابن عەسری رۆژی ٩٨٣/٧/١٤ لە وەرگەڕانی ئوتومبیلەکەیان دا شەهید بوو . گیانی پاکی لە بەهەشتی ئەمری دا گەیشتەوە هەڤالانی تری سەرکردایەتی شۆڕش و یەکێتی نیشتمانی کوردستان ، هەڤالی ئەمر شەهاب نوری ، عەلی عەسکەری ، شاسوار ( شارام ) ، دکتور خالید سەعید ، حسین بابە شێخ ، جەعفەر عبد الواحد برایم عەزۆ ، سەعدی گچکە ، مامۆستا عەزیز ، وە لەگەڵ گیانی پاکی ئەیان سەرکردەی هێزی پێشمەرگەی کوردستان و سەدان قارەمانی تری کوردایەتی دا لە کاروانی ئەمران دا یەکیان گرتەوە .

شەهید بوونی مامۆستا جەمال تاهیر زیانێکی گەورە بوو لە گەلەکەمان کەوت ، لە کوردو کوردستان کەوت ، لە جولانەوەی رزگاری نیشتمانی و دیموکراتی خەلکی کوردستان ( کوردایەتی ) و شۆڕشەکەمان کەوت لە یەکێتی نیشتمانی کوردستان و هێزی پێشمەرگەی کوردستان کەوت ، چونکە مامۆستای ئەمر رۆڵەیەکی دڵسۆزی گەلەکەمان و فەرماندەیەکی ژیرو هێژای شۆڕش و هێزی پێشمەرگەی کوردستان و سەرکردەیەکی لێهاتو و کارای کوردایەتی و یەکێتی نیشتمانی کوردستان بوو .

مامۆستا جەمال هەر لە سەرەتای ژیانی یەوە لە سەروەری خۆیەوە تێکۆشەرێکی ئەبەدی و هوشیار بوو ، هەر بۆیە ش لە جولانەوەی قوتابیان و مامۆستایان دا ، لە ریزەکانی پارتی دا خەباتگێڕێکی دیارو خۆشەویست بوو ، هەروەک تێکۆشەرێکی شۆڕشگێڕو لێ زان بوو ؛ زۆر زوو بیروباوەڕی پێشکەوتنخوازانە و سوسیالیستی هەلبژاردبوو ، بلاوی ئەکردەوە و کاری پێ ئەکردن . باوەڕی ئەگوری بە هێزی لە بن نەهاتوی گەلەکەی و کومەلانی خەلکەکەی بە گشتی و کرێکاران و رەنجدەران و جوتیارانی کوردستان بە تایبەتی ؛ هۆیەکی گەورەی ئەمە بوو کە هەر لە سەرەتای پێکهێنانی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستانەوە لە کاتی ئەمەلاتداریەکەی بورژوازی عەرەبی و سەرکردایەتی خێلەکی کوردا بەسەر کوردستان دا ، ببێتە ئەندامێکی چالاک و ژیرو کولنەدەری کۆمەڵە و هەمیشە ریبازی راست و رەوای کوردستانی بوون و خەباتی شۆڕشگێڕانەی جەماهیری و شۆڕشی درێژ خایەن بگرێتە بەر . هەر بۆیەشە ش زۆر زوو بوو بە کادرێکی شایستەی کۆمەڵەو بە رۆڵەیەکی هەلکەوتووی گەلەکەمان و پاشان بۆ سەرکردایەتی کومەلە ش هەلبژێردرا .

هەر لە سەرەتای دامەزراندنی یەکێتی نیشتمانی کوردستانیشەوە مامۆستا جەمالی هەمیشە زیندو ، یەکێک بوو لە کادرە خەباتگێرە چالاکەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان و سەدان تێکۆشەری رێک خست و هەزارانی تریشی کۆکردەوە لە ژێر ئاڵاکەی دا . هەر بۆیە ش بوو بە یەکێک لە سەرکردەکانی رێکخستنی ناوەوەی یەکێتی نیشتمانی کوردستان و پاشان بە لێپرسراوی کومیتەی سەرکردایەتی ناوخۆ .

مامۆستا جەمال چالاک و نەترس و لە خۆ بوردو بوو ، ژیرو زاناو کارا بوو ، هەر بۆیە ش دوژمن چەندین جار هەولی گرتن و لەناوبردنی داوە ، چەندین مانگ ، چەندین جار ، لە زیندانەکانی حوکمی رەشی فاشستی بەغدادا توشی پیسترین جوری ئازاردان و درندانەترین شێوەی لێدان و ئەشکەنجە هات ، بەلام دوژمن نەیتوانی ئەشانەت یەک ئاگە پێشێ پێ بدرکێنێ . هەر بۆیە ش ئەیان ئەکوشت چونکە ئەیانزانی لێهاتوی گرنگەو شێوەیەکی زۆری لە لایە و بێ ئاشکرا کردنیان ئەبێتە هوی گرتنی هەزاران تێکۆشەری یەکێتی نیشتمانی کوردستان و هەڵوەشاندنەوەی ئەیان رێکخستنی . بۆیە هەر درێژەیان ئەدا بە ئازاردان و ئەشکەنجە کردنی تا لە هەنوێکی گشتی دا رزگاری بوو .

هەڤال جەمال تەنها هەر مامۆستایەکی رێکخستن و چالاکیە پیشەیی و سیاسیەکان نەبوو بەلکو فەرماندەیەکی لێهاتووی چالاکی ی پێشمەرگانەش بوو ، لە رێکخستن و رێبەری کردنی چالاکی پێشمەرگانەی ناوشارەکان دا دەورێکی کاریگەری هەبوو . هەروەک پاشان لە بەڕێوەبردن و سەرپەرشتی کردنی شەرەکانی هێزی پێشمەرگەی کوردستان دا لەگەل دوو دەولەتە داگیرکەرەکەی کوردستان دا لە ناوچەکانی ( گردە بێشاس ) و (جەمال دین )و

( ساوزە ) و(گەشاو) دا دووپاتی کردەوە کە ئەرمانەدەیەکی زیرو قارەمانی پێشمەرگایەتییە لە دەرەوە ، لەمەش دا ئەوەی خستەوە بەکردەوە ، کە خەباتی شۆڕشگێڕانە لە هەموو کوردستان دا بە ئەرکێکی پیرۆزو واجبێکی نیشتمانی و شۆڕشگێڕانە دەزانێ . هەروەك دووپاتی کردەوە کە باش لە ماناای ڕاستەقینەی دروشمە دێرینەکەی هەموو لایەك گەیشتوە دروشمی : ( ئەی کرێکاران و گەلانی زۆر لێکراوی دنیا یەکگرن ) ، وە باش لەم ڕاستیە گرنگە گەیشتوە کە شۆڕشگێڕی ڕاستەقینە بە هاوبەشی کارگێڕانەی لە جولانەوەی شۆڕشگێڕانەی ولاتەکەی خۆی دا ، ئەتەوەکەی خۆی دا ، بە پەرەپێدان و گەشە پێدانی جولانەوەی شۆڕشگێڕانەی کرێکاران و جوتیاران و ڕەنجدەرانی گەلەکەی خوی دا ، وە پەرەپێدان و گەشە پێدانی شۆڕشە نیشتمانیەکەی خوی دا وە بو بەستنەوە و گرێدانەوەیان لەگەل خەباتی ڕەنجدەرانی ولاتانی تەورو بەرو دنیاوە ، وە بو یارمەتیدانی شۆڕشگێڕان و خەباتگێرەکانیشیانەوە ، بەلێ بەم ڕێگە ڕاستە عەمەلیە ئەتوانی هاوبەشی ڕاستەقینە بکات لە خەباتی کرێکاران و گەلانی زورلێکراوی دنیاو تا ئەوها و بەوجورەش دروشمە دێرینەکەی نێنیتە دی ، بەڕاستی لەو گورەش دا ، لە گوری هاوخەباتی ڕاستەقینەدا و لەگەل شۆڕشگێڕانی کوردستان و عێراق و ولاتانی دراوسێمان دا ماموستا جەمالی نەمر ڕولەیەکی دلسوزو بە پەرۆشی ڕەنجدەران و شۆڕشگێڕانی کوردستان بوو .

هەڤـالان

پێشمەرگە قارەمانەکان

خوشك و برایانی خوشەویست

لە دەستدانی ماموستا جەمال تاهیر ڕولەی هەلکەوتوی گەلەکەمان و سەرکردەی وریاو بەتواناو ژیری کوردایەتی و شۆڕشەکەمان و یەکێتی نیشتمانی کوردستان ، نەك هەر زیانێکی گەورە بوو بو هەمویان ، بەلکو گەلین و گەلەبەرێکی دیاریش لە ڕیزی سەرکردایەتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان بە کومەلەشەوە و شۆڕشەکەمان دا بەجێ هێشت ، بەتایبەتی لەم سەرەدەمەدا کە سەرەدەمی پەرەسەندن و گەشە کردنی شۆڕش و یەکێتی نیشتمانی کوردستان و سەرەدەمی پەرەو گەشە پێدانی ڕێکخستن و خەباتی جەماوەری و کومەلایەتی و نەتەوایەتییە ، هەروەك سەرەدەمی هێرش هێنانی دڕندانەی داگیرکەرانە بو سەر جولانەوەی ڕزگاری و دیموکراتی خەلکی کوردستان و بو سەر شۆڕش لە کوردستان دا .

لەبەر ئەمە لەسەر هەموومان پێویستە کە ئەو هاوری ئەمرەمان هەر بە ئەشك و فرمیسکەوە سەری نەکەین ، هەر شاخ و شوف و داخ و مخابن وپردی زمانمان نەبێ بەلکو لە سەرمان پێویستە کە درێژە بدەین بە خەباتی شۆڕشگێڕانەمان بە خەباتی پێشمەرگانەو جەماوەریمان بەگەشە پێدانی شۆڕش و ڕێکخستنەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان و ڕێکخستنەکانی خوێندکاران و ماموستایان و ئەوەدەران و ئافرەتان وە بوژاندنەوە و گەشە پێدانی خەباتی جەماوەری کرێکاران و جوتیاران و ڕەنجدەران و ژیاندنەوە و گەشە پێدانی ڕێکخراوە جەماوەریە پیشەییەکانیشیان .

پێویستە زۆرتر خومان ماندو بکەین ، پتر لە خوبوردوییی بنوێنین ، لە هەمو جورە فیداکاری و گیانبازییەك نەسلەمینەوە ، خوتیارانە و ژیرانەو بە پێوی شۆڕشگێڕانەی درێژەوە ڕێبازی شۆڕشگێڕانەی خومان بپرین ، تا ئەگەینە پویەی سەرکەوتن تا گەل و نیشتمان ڕزگار ئەکەین لە حوکمی بوڕژوازی بیروکراتی عۆفلێتی ڕەفتار فاشیست کە دوژمنی سەرسەختی گوردو کوردستان و نەتەوەی کورد و نەتەوەی عەرەبە ، تا حوکمێکی دیموکراتی گەلی و سەرپەخوبی بو عێراق و دیموکراسی بو گەلەکەمان و مافی چارەنوس بو نەتەوەکەی دابین دەکەین ، کە ئەمەش ناچارمان ئەکات چاکتر درێژە بدەین بە خەباتی سەختی پشو درێژ بو سازدانی هەموو هێزو توانای گەلەکەمان و سازدانی هەموو هێزە نیشتمانی و دیموکرات و شۆڕشگێرەکان لە بەرەیەکی نیشتمانی عێراقی گەورەدا بو ڕێبەری کردنی خەباتی شۆڕشگێڕانەی هەموو گەلی عێراقمان لە دژی ئیمپریالیزم و زایونیزم و حوکمی دیکتاتوری دوژمن بەگەل

هەڤـالان

خوشك و برایانی تێکوشەر

شۆڕشگێڕان کردویانە بە بانەت کە ئەهید سوونی هەڤالانی سەرکردەو هەڤالانی خەباتگێری خویان ئەکەن بە مناسەبەتێکی تر بو دووپات کردنەوەی بەلێن و پەیمانەکەیان لەگەل بیروباوەرو ڕێبازو جولانەوەی شۆڕشگێڕانەی خویان دا ، لەگەل گەل و نیشتمان و شۆڕش و هێزی پێشمەرگەی خویان دا ، کە تا دوا هەناسەی ژیانیان دلسوزیان بن بە پەروش بن بو سەرکەوتنیان ، تا مردن یا سەرکەوتن ، لە پێناویان دا بجەنگن ، هەر بەمەش گیانی پاکی ئەهیدانی خویان ئەهیدانی وەك ماموستا جەمال ئاداو دلخوش ئەکەن و خوێنی گەشیان بەفیرو نادەن و ڕێبازو بیرو باوەڕیان ون ناکەن .

وا ئیمەش بەلێن و پەیمان دوپات ئەکەینەوە و بە ئەرمی پیرۆزی ماموستا جەمالی خوشەویستمان و هاوڕێ ی خەباتگێرمان سوێند ئەخوێنەوە کە تا بەدی هێنانی هەمو ئەو ئاوات و ئامانجەی ئەوێش گیانی پاکی لە پێناویان دا بەخت کردوە ، درێژە بە خەباتی شۆڕشگێڕانەی جەماوەری خومان بدەین بە ئاشتی هێزە شۆڕشگێرەکانی عێراق و کوردستان لە هەموو کات و سات دا وە بە هەموو شێوەو جۆرێك .

ئەمری و سەروەری بۆ ماموستا جەمالی هەمیشە زیندو لە دلی گەورەی کوردو کوردستان و یەکێتی نیشتمانی کوردستان دا .
سەرکەوتن بۆ شۆرشەکەمان و
سەربەرزی بۆ هێزی پێشمەرگەی قارەمانی کوردستان !

کومیتەی سەرکردایەتی
یەکێتی نیشتمانی کوردستان
١٩٨٣/٧/١٦

## بەیاننامەی کومیتەی سەرکردایەتی

# کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان



## بە بۆنەی شەهید بونی هاوڕێی تێکۆشەر و هێژا

# مامۆستا جەمال تایەر

هاونیشتمانانی بەرێز!
هاوڕێیانی تێکۆشەر!

مرۆڤ لە دایک ئەبێ و دێتە دنیاوە ، گەورە ئەبێ و ئەمرێ ، بەڵام بەرزترین و پیرۆزترین مردن ئەوەیە لە پێناوی گەل و نیشتمان دا بێت ، هەمو رۆژێک دەیان کەس لە گوشە و کەناری دنیا دەمرن بێ ئەوەی لە پاش خۆیان هیچ شوێنە وارێک وە ناوێک بەجێ بهێڵن ، لە ناو ئەو ملیۆنان مرۆڤانەی سەرزەمین دا هەر ئەوانە ناوو شوێنەواریان ئەمێنێ کە لە پێناوی گەل و نیشتمان دا ئەژین و ئەمرن ...

هاوڕێ جەمال تایەر یەکێک بوو لەوانە هەمو ژیانی خۆی لە پێناوی گەلەکەی دا بەخت کرد و هەر لە پێناوی گەلەکەشیا چوە ریزی کاروانی ئەمرانی گەلەکەمانەوە .

بە پەژارەیەکی بێ ئەندازەوە هەواڵی کۆچی دوایی هاوڕێی خۆشەویست وڕۆڵەی دلێری گەلەکەمان سەرکردەی هەڵکەوتوی کۆمەڵە و یەکێتی و شۆڕشەکەمانتان پێ ڕائەگەیەنین کە لە رۆژی ١٩٨٣/٧/١٤ لە سەر جادەی گشتی چوار قوڕنە-خەلیفان لە نێوان گوندی مێرگە سەر و بالیسان دا لەگەل دەستەیەک لە هاوڕێیانی تریان لە ئوتوموبیل وەرگەڕان ، لە کاتێکا بە رێگاوە بون بەرەو کات و شوێنی جێ بەجێبون کوبونەوەی خولی چوارەمی کۆبونەوەکانی کومیتەی سەرکردایەتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان ، هاوڕێ جەمال گیانی پاکی گەیشتە بەهەشتی ئەمری .

هاوڕێ جەمال لە سالی ١٩٤٢ دا لە گەرەکی کانێسکان لە شاری سلێمانی لە ناو خێزانێکی کورد پەروەر دا چاوی هەڵێنا و پەروەردە بوو ، قوتابخانەی سەرەتایی و ناوەندی لە سلێمانی و دوایی تر قوتابخانەی ئامادەکردنی مامۆستایانی هەر لە شاری سلێمانی تەواو کرد ، بو بە مامۆستای سەرەتایی لە قوتابخانەکانی دەوروبەری سلێمانی .

هاوڕێ جەمال هەر لە سالی ١٩٦٠ ەوە تێکەڵاوی جولانەوەی نیشتمانی کورد بو ، بوو بە یەکێک لە ئەندامە چالاکەکانی یەکێتی قوتابیان و پاشان ئەندامی پارتی و لە خەباتی ژێر زەمینی سالانی ٦١ و ٦٢ و ٦٣ دا نمونەی یەکێک لە گەنجە هەرە دلسوز و چالاک و چاونەترسەکانی ناو شاری سلێمانی بوو کە بەو پەڕی لەخۆبوردن و هوشیاریەوە بەشداری ئەکرد لە سازدان و رێکخستنی قوتابیان و خەلکی تر لە گەرەکەکان دا بۆ کوبونەوە لە رێکخستنی شورش و پارمەتیدانیان و هاوکاری کردنی شورش و پێشمەرگە دا ، هەروەکو لە دوایش دا کە بوو بە مامۆستا ، یەکێک بوو لەو مامۆستا شۆڕشگێڕانەی لە هەر گوند و لە هەر قوتابخانەو شارێک دا مامۆستا بوبێت ، دەورێکی کاریگەر و گرنگی ئەگێرا لە پەروەردەکردنی قوتابیان بە گیانی نیشتمان پەروەری و بەرگری داگیرکەران و خۆشەویستی کرێکاران و جوتیاران و رەنجدەرانی گەلەکەمان .

هاوڕێ جەمال لە ژیانی سیاسی دا ، لە رێکخراوی قوتابیان ، لە رێکخراوی کرێکاران و پاشان لە لیژنەی ناوچەی سلێمانی پارتی دا ئەندام بوو ، لە کۆتایی شەستەکانەوە بیروباوەڕی پرۆلیتاریا ، واتە تیۆری شۆڕشگێڕانەی مارکسیزم – لینینیزمی کردە چرای روشن کردنەوەی بیروڕێگای خەباتی خۆی و لە ناو هاوڕێکانیدا بلاوی ئەکردەوە ، بە رێکوپێکی کاری بو فێربونی زیاتر و لێ وەرگرتنی داهێنەرانەی ئەکرد .. تا سالی ١٩٧٠ کە ئەلقە ناوکییەکانی کومەلە دامەزرا ، ئەویش لە یەکێک لەو ئەلقانەدا بەو پەڕی چالاکی و زیری و هوشیاریەوە کەوتە کار کردن .

لە کاتی هەڵگیرسانەوەی شەری نێوان کورد و حکومەتی عیراق دا سالی ١٩٧٤ وەکو هەزاران تێکوشەری تری گەلەکەمان چەکی شەرەفی پێشمەرگایەتی کردە شان و ئەو ئەرکانەی شورشیش ئەسپارد بە دلسوزی و لە خوبرانەوە جێ بە جێی ئەکردن . هەر لە ئەنجامی خەباتی شورشگێرانە و بەرەنگاری رژێمی فاشیستەکانی بەغدا کاک حەمە رەشیدی برای گیرا و سالی ١٩٧٤ لە سێدارە درا . لە سالی ١٩٧٥ کە دیسان قوناغی نوێی خەباتی شورشگێرانەی ژێرزەمینی دەستی پێکرد و کۆمەڵە ئەبوو رۆڵێکی کاریگەر و سەرەکی بگێرێ لە هەڵسانەوەی باری کەوتوی جولانەوەی نیشتمانی

کورد و لە جسازدان و هاندانی خەلك و لە پێکهێنانی ڕێکخستن دا هاوڕێ جەمال قۆلتی مەردانەتی لێ هەڵمالی و بەپەرۆشێکی کەموێنەوە کەوتە پێکهێنانی شانەوشەلقە بۆ کۆمەڵەو پێکهێنانی خەتی جیاجیای یەکێتی نیشتمانی لە ناو شارەکان و سەرانسەری کوردستانی عیراق دا . وە هەول و خەباتی هاوڕێ جەمالی تێکۆشەر بۆ پێکەوە گرێدانی خەباتی شار و شاخ بە یەکەوە ، دەیان کادر و ئەندام و پێشمەرگە هاتنە ریزەکانی شۆرشەوە ، سەدان تێکۆشەری هێنایە کۆڕی خەباتی شۆرشگێرانەی زنجیرەییی بەوە لە ناو شارەکانی کوردستان دا ، هەر لە خانەقینەوە تا زاخۆ ، لە ناوەراست و خواروی عیراق دا..

هەر لە ئەنجامی ئەم لێوەشاوەیی و زۆر کارامەیی بە کەم وێنەیەدا لە بەهاری ١٩٧٨ پاش کۆبونەوەی فراوانی کادرەکانی کۆمەڵە ، هاوڕێ جەمال کرا بە لێپرسراوی کومیتەی سەرکردایەتی رێکخستنی ناوشارەکان و سەرکردایەتی هەمو رێکخستنەکانی کۆمەڵە و بەشێك لە رێکخستنەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان لە سەرتاسەری شارەکانی کوردستان و عیراق دا .

لە هەمو کۆبونەوە فراوان و گرنگەکان بە راپۆرتی زانستی و بیروبۆچونی ژیرانەو بە رەخنەوگلەیی بەجێ و بە پێشنیاری عەمەلی و بەکەلك بەشداری کردوە .

هاوڕێ جەمال لە سالی ١٩٧٩ گیرا لە زیندانی فاشیستەکانی عیراق دا ماوەیەکی درێژ لە ژێر ئازار و ئەشکەنجەی جەستەیی و گیانی دا مایەوە و بەقارەمانێتی بەوە لەو ناقی کردنەوەیە وەکو قارەمانی یەکەمی زیندان لە ئەنجامی عەفوەکەی ١٩٧٩ دا ئازاد کرا .

ئازار و ئەشکەنجەی زیندان و چاو سورکردنەوەی جەللاد و چەتەولەکانی رژێم و چاو دێری کردنی بەردەوامی جاسوسەکان نەیانتوانی مامۆستا جەمال لە خەبات سارد بکەنەوە ، بەڵکو هەر دەستبەجێ کەوتەوە رایەراندنی ئەو ئەرکە گرنگانەی خرابوە ئەستۆی لەرابەری کردنی کومیتەی سەرکردایەتی شارەکان و لە ئاموژگاری و رێنوێنی ریکخراوەکانی خوێندکاران و مامۆستایان و رێکخراوی شەهید لەیلای ئافرەتان و مەفرەزەکانی ناوشاردا .

بۆ رێز لێنان لە لێوەشاوەیی و خەبات و خۆگری هاوڕێ جەمال لە یەکەمین کۆنفرانسی دا ئەگەرچی خۆی لەوێ نەبوو ، بە راپۆرتێکی زانستی دوور و درێژ بەشداری کۆنفرانسەکەی کردبوو ، بروا وەدەنگی زۆربەی ئەندامانی کۆنفرانسی وەرگرت و هەڵبژێردرا بەئەندامی کومیتەی سەرکردایەتی کۆمەڵە .

بەلام زۆری نەخایاند داوودەزگاکانی رژێم سەرلە نوێ گومانیان لە هەڵسوکەوت وجمو جۆڵ و چالاکیەکانی کرد و گرتیانەوە ، نزیکەی ٩مانگی رەبەق لە ژووری تەنیای ئازاردانی ئەمنی سلێمانی دا لە ژوورێکی پر لە ناو بە برسێتی و تینوێتی و نەخەوتن و لێدان و هەلواسین و هەمو شێوە جۆراوجۆرەکانی ئەشکەنجەدانی جەستەیی و گیانی فاشیانەلەگەلی خەریك بون بۆ ئەوەی نهێنی یەکانی رێکخستنی بێ بدرکێنن ، چونکە کاربەدەستانی رژێم گومانی ئەوەیان لێ ئەکرد کە ئەو لێپرسراوی سلێمانی بێ ، بەلام هاوڕێ جەمال ئەمجارەش شەرەفی قارەمانێتی زیندانی پاراست تەنانەت بە نهێنی دوژمنەکانیش و بەسەربەرزی لە عەفوات دا ئازاد کرا ، کە رژێم لە ئەنجامی راپەرین و خۆپیشاندان و مانگرتنەکانی کوردستان دا لە سالی ١٩٨٢ دەری کرد .

هاوڕێ جەمال لەگەل بەربونی سەرلەنوێ کەوتەوە کارکردن ، لە دوەمین کۆنفرانسی کۆمەلەدا وەکو یەکێك لە نوێنەرە رووبۆشەکانی ناو شارەکان بەشدار بوو و هەلبژێردرا بە ئەندامی دەستەی بەرێوەبەرایەتی کونفرانس و لە دوا کۆبونەوەی کونفرانس دا بروا و دەنگی زۆربەی هەرەزوری ئەندامانی کۆنفرانسی وەرگرت و هەلبژێردرایەوە بە ئەندامی کومیتەی سەرکردایەتی کۆمەڵە و دوایی تر بە ئەندامی ناوەندی و لێپرسراوی دەزگای ناوەندی رێکخستن و نوێنەری کۆمەڵە لە کومیتەی سەرکردایەتی یەکێتی نیشتمانی دا .

هاوڕێ جەمال لەو ماوەیەدا کە لە ریزی پێشمەرگەدا بو لە شاخ وەکو پێشمەرگەیەکی نمونەیی هەرچی بەکێ لە دەست هات کردی و بەشداری یەکی کاریگەری کرد لە جێگیرکردنی کەرتەکانی رێکخستن و پێکهێنانی چەندین کەرتی رێکخستنی نوێ و پێکهێنانی رێکخراوەکان و دواکاری گرنگی بۆ شۆرش لە ئەنجامی دا مەسەلەی سەرپەرشتی کردنی کشانەوەی رێك و پێکی بنکە زیانی سەرکردایەتی و بارەگاکانی سەرکردایەتی و شیرگەی دەنگی شۆرشی عیراق بوو لە ناوچەکانی پشدەر ، کەلوپەلەکانی بۆ شوێنێکی کەی ئازادکراوی کوردستان گواستەوە .

لەم هەلومەرجە ئالۆزەی کوردستان دا کە هەلسەنگاندنی تێکرای کارەکانی رابوردوو مان و داناتی نەخشە و پلانی کاری قۆناغی داهاتومان ، پێویستی بە کۆبونەوەیەکی کومیتەی سەرکردایەتی کۆمەڵە و پێویستی بە کۆبونەوەی کومیتەی سەرکردایەتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان ئەکرد ، بۆیە زۆربەی زوری ئەندامانی سەرکردایەتی بانگ کرابون بو ناوچەی قۆتناوەتی ، هاوڕێ جەمالیش ئەمریش وەکو یەکێ لەوانە لە کات و شوێنی خۆیا ئامادەی دوو جەلسەی گرنگی کۆبونەوەکان بوو وە لە کاتی هاتنیا بۆ جەلسەی سێ بەم سەد حەیفەوە مەخابن لە رێگا ترتوسیلەکەیان وەرگەرا و دلی گەورەی مامۆستا جەمالی هێنزا ،

مامۆستا جەمالی بلیمەتی خەباتی زنجیرەیی ،

مامۆستا جەمالی سەرکردەی خەلکەوتو ،

مامۆستا جەمالی پێشمەرگەی دلێر و ئازا ،

مامۆستا جەمالی قارەمانی زیندانی فاشیستەکان ،

مامۆستا جەمالی رابەری خۆشەویستی رەنجدەرانی کوردستان لە لێدان کەوت و لەپێناوی ئەو مەبەستە پیرۆزەدا ، کە زیاتر لە ١٢ سالی تەمەنی خۆی بۆ تەرخان کردبو شەهید بووە ، شەهید بونی مامۆستا جەمال زەرەرێکی زل بوو لە بزوتنەوەی رەنجدەرانی کوردستان و لە بزوتنەوەی رزگاریخوازی نیشتمانی گەلی کورد و لە بزوتنەوەی نیشتمانی عیراق ...

وە بە شەهید بوونی ئەوەرگێکاران و رەنجدەرانی هەمو ناوچەکە یەکێك لە رۆلە خۆگر و دلسوزە تێکۆشەرەکانی خۆی لە رابەرە مارکسیە - لینینیە راستەقینەکانی خۆی لە دەست دا ...

سەروەری و نەمری بۆ هاوڕێ جەمال و هەمو شەهیدان

کومیتەی سەرکردایەتی
کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان



هاوڕێی نەمر شەهید دارا باڕۆیی (ئەنوەر باڕۆیی)
خەڵکی دێی "باڕۆیی" ، جێگری فەرماندەی کەرتی ٢ی بازیان ،
لە ١٩٧٨ هاتە ریزی پێشمەرگە و لە مانگی ٣ ی ١٩٨٢ لە شەڕێکی
خوێناوی لەگەڵ ٢ هاوڕێی شەهید کرا .

ئەی هەڤاڵی بێ سەروشوێن
ڕەنگی ئاسۆ نیشتۆتە خوێن
دوای نوچدان و هەڵەنگوتن
واخەڵکی دیسان ئەبزوێن



شەهیدی نەمر جەمالی عەلی باپیر
ئەندامی کۆمەڵە و فەرماندەی تیپی ٤٧ ی پیرەمەگروون

کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان


ی.ن.ک
شەهیدی قارەمان کاروان چالاکی
هاوڕێ یەکی دڵسۆزی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان
بوو، لە ڕۆژی ٧/٨/١٩٨١ دا لەگەڵ شەهید جەمالی علی باپیر
بە دەستی چەند خۆفرۆشێکی جاش شەهید کرا



شەهید فتاح عمر قادر ناسراو بە (بەختیار)

دلسۆزێکی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان و
پێشمەرگەی تیپی ٤٧ ی پیرەمەگرون بوو،
لە ڕۆژی ١٣/١٠/١٩٨٢ هاتە ڕیزی هێزی پێشمەرگەی
کوردستانەوە، لە ڕۆژی ١/٤/١٩٨٣ شەهید کرا

ی.ن.ک


صالح احمد کاکی
ئەندامی پیشکەوتوی کۆمەڵەبوو لەکارەساتە
خوێناویەکەی حاجی ئاوا لەمانگی ٧ / ٩٨٠ شەهیدکرا


غریب احمد کاکی
ئەندامی پیشکەوتوی
کۆمەڵەبوو لەمانگی ٧ ٩٨٠ لەسلیمانی شەهیدکرا



شەهید عوسمان شێخ رەشید
شێخ فەرەج سەرخواری
١٩٩١/٤/٢ لەچیمەن شەهید کرا



شەهید مامۆستا ئیبراهیم سالح
١٩٨١/١١/١٧ بەدەستی سیخوڕەکانی
رژێم لەرێگای قرگە شەهید کرا



شەهید کاوەی شێخ عەلی دۆڵبەمویی



شەهید حەمە بی کەی سی- ڕزگارە سوور (ڕێی بادینان ١٩٨٦)



هاوڕێی کۆمەڵە ڕەفیق موشیر- شەهید خالد کەریم کەنەسوورەیی (ناسراو بە هاوڕێ نەمر)



ڕەئووف شێخ جەمیل　　　　خاتوو جەمیلە شێخ مەحمود



مامۆستا حەسەن گەرمیانی لەگەڵ دەستەیەک لەخوێندکارانی ئامادەیی کشتوکاڵی بەکرەجۆ



جەمیلە شێخ مەحمود لەگەڵ دەستەیەک خوێندکاری ئامادەیی کشتوکاڵی بەکرەجۆ



ڕەئووف شێخ جەمیل لەگەڵ کۆمەڵێک هاوڕێ و خوێندکاری ئامادەیی کشتوکاڵی بەکرەجۆ
لەهەزار مێرد



ڕەئووف شێخ جەمیل لەگەڵ کۆمەڵێک هاوڕێ و خوێندکاری ئامادەیی کشتوکاڵی بەکرەجۆ
لەڕاوەماسی لەگوندی کانی پان لای بەکرەجۆ



خوێندکاران وەهاب عوسمان سیتەکی - ڕەئووف شێخ جەمیل
زستانی ١٩٨٢ ناو خوێندنگەی ئامادەیی کشتوکاڵی بەکرەجۆ



خوێندکاران ڕەئووف شێخ جەمیل - حەمە عەلی شەریف
هاوینی ١٩٨٢ گەیشتێک بۆ قەرەداغ



بەڕێوەبەری خانەنشینی پێشمەرگە شێخ عەزیز          ڕەئووف شێخ جەمیل



ڕەئووف شێخ جەمیل - وەهاب عوسمان سیتەکی - مامۆستا کەریم وێڵەدەری



ڕەئووف شێخ جەمیل - مامۆستا کەریم وێڵەدەری
سەربانیماڵی خۆمان خوار شەقامی ئیبراهیم پاشا ساڵی ۱۹۸۲



خوالێخۆشبوو عەمید نەبەز ئەحمەد کوردە- ڕەئووف شێخ جەمیل- جەزا ئەحمەد کوردە
تووی مەلیک ماڵی خۆمان ٢٠٠٣



ڕەئووف شێخ جەمیل- ڕێکخستنی دێرین ڕزگاری شێخ بەکر ماوەتی
تووی مەلیک ماڵی خۆمان زستانی ٢٠٠٨



پێشمەرگەی دێرین جەزای وەستا رەحیم - رەئووف شێخ جەمیل



رەئووف شێخ جەمیل- پێشمەرگەی دێرین لوقمان چاورەش



ئەحمەدی حاجی جەلال وێڵەدەری- ڕەئووف شێخ جەمیل
هوڵەندا- شاری ڤیلیسیلینگ ١٩٩٩



ڕەئووف شێخ جەمیل- حەمەی خەجیج برای شەهید شوان
سوید - شاری یۆتۆبۆری ٢٠٠١



دلێری ئەحمەد شوکری شاعیر - ناسراو بەهاورێ سەلیم- لێپرسراوی ڕێکخراوی سلێمانی
لەساڵانی ١٩٨٢- ١٩٨٥ - ڕەئووف شێخ جەمیل



ڕەئووف شێخ جەمیل - هیوا شێخ جەمیل



لەتیفی حەمە شوکر برای شەهید ئاکۆی حەمە شوکر- ڕەئووف شێخ جەمیل
ئەڵمانیا- شاری هانۆڤەر ١٩٩٩



ئومێدی حەمە شوکر برای شەهید ئاکۆی حەمە شوکر- ڕەئووف شێخ جەمیل
دانیمارک - شاری کۆپنهاگن ٢٠٠١



کامەرانی سەعید کوردە ئامۆزای جەزای ئەحمەد کوردە - ڕەئووف شێخ جەمیل
ئەڵمانیا - شاری لایپزیگ ٢٠٠٣



وێنەی چەترە کۆنەکەی سەر گۆڕەکەی شەهید ئارامی نەمر



وێنەی مەزاری شەهید ئارامی نەمر



ڕەئووف شێخ جەمیل لەسەر مەزاری شەهید ئارامی نەمر



شەهید ئارام - شەهید خاڵە شیهاب

ئەی کرێکاران و گەلانی زۆرلێکراوی دنیا یەکگرن




ئێستاش

ئارام ناووێت

نارنجۆکێکە و لەسەر رێیە

لە ناو دەمی

بۆرژوادا

گڕوکڵپەی قینی پێیە



خوالێخۆشبووی باوکم شێخ جەمیل شێخ عەزیز زلْزلّەیی
٦/١٠/١٩٨٨ کۆچی دوایی کردووە



خوالێخۆشبووی دایکم حاجی فەهیمەخانی شێخ فەرەجی سەرخواری
١٩٩٦ کۆچی دوایی کرد

# ڕەئووف شێخ جەمیل لە:



١٩٧٢



١٩٧٧



١٩٨٢



١٩٩٤

کاتێ کەچوویتە بەردەمی دوژمن

بەردەم سێدارەو پەت و خنکاندن

دوژمنیش لەتۆ سەری سوڕدەما

پەت و سێدارەت وا لەبەردەما

پێکەنینت هات بە ژیان و مردن

بڕوات بەهێز بوو بۆ خەبات کردن

نرخ: ٧٠٠٠ دینار